ساڵی سیانزەهەم هاوینی ٢٠١٢
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
71

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

ڕاوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# ناوەڕۆک

## وتارو لێکۆڵینەوە ٤ ـ ١٠٣



## گفتوگۆ ١٠٤ ـ ١٢٩



## ئەدەب و هونەر ١٣٠ ـ ١٣٦

# جان جاك رۆسۆ.. ئیلهامبەخشی جاڕنامەی ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ

نووسینی: هاشم سالْح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

من وەک خۆم دان بەوەدا دەنێم ئەگەر نووسەرێک هەبێت، بەشێوەیەکی یەکلایکەرەوە کاریگەری لەسەر ئاڕاستەکانی بیرکردنەوەی من هەبوبێت، ئەوا جان جاک رۆسۆیە. ئەو بە شێوەیەکی ڕەها نزیکترین نووسەری بیانییە لە منەوە. ئەگەر نووسەرێک هەبێت تەماهی لەگەڵ بکەم و خۆم وەک قوتابییەکی بچوکی ئەو بزانم، ئەوا ئەم نووسەرە مەزنەیە. من ئەمە دەڵێم هەرچەندە لە میانەی نیشتەجێبونە دوور و درێژ و بەردەوامەکەم لە پاریس کە زیاد لە سی ساڵ دەبێت، ژمارەیەکی زۆر بیرمەند و نووسەرم ناسیوە

**ڕۆسۆ بەهۆی ئەو ژیانە زەحمەت و سەختەی هەر لە منداڵییەوە ژیاوە، پاشان بە هۆی ئەو چەوساندنەوە و ڕاوەدونانەی کە دواتر دوچاری دەبێت، بووەتە کەسێکی هەڵسوکەوت سەیر. ئەو لەبەر ئەوەی لە ساڵانی سەرەتای ژیانیدا بەدەست هەژاری و برسیەتی و نا جێگیرییەوە ناڵاندویەتی، بووەتە کەسێك پڕ لە ئێش و ئازار و هەستی مرۆڤدۆستانەی مەزن**



هاشم سالح

و خۆشمویستوون. لەوانەیە دۆزینەوەی جاک جاک ڕۆسۆ، گەورەترین ڕوداوی فیکری و -بەتایبەتی هیومانستی- بووە لە ژیانمدا.

دەیان کتێبم لەبارەیەوە خوێندوەتەوە و تا ئێستاش هەر بەردەوامم لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە، لەو کتێبانە بەتایبەت ناوی کتێبی توێژەری بەلجیکی مەزن «ڕیمۆن ترۆسۆن» دەهێنم کە ئەندامی ئەکادیمیای پاشایەتییە لە بەلجیکا و مامۆستای ئەدەبی فەرەنسی مۆدرێن و بەراوردکارییە لە زانکۆی برۆکسل-ی ئازاد. ئەو یەکێکە لە پسپۆڕە گەورەکانی تایبەت بە سەردەمی ڕۆشنگەری، خۆزگە کتێبەکانی دەکران بە عەرەبی. ئەو چیرۆکی ژیانی ڕۆسۆی لە سێ بەرگی یەک لە دوای یەکدا نووسیوە و بەم دواییانە هەر سێ بەرگەکە لە یەک بەرگی گەورەدا و بە ناونیشانی (جان جاک ڕۆسۆ) کۆکراونەتەوە. توێژەر لەم بەرگەدا تەرکیزی خستووەتە سەر پێکهاتە دەرونییە ئاڵۆزەکەی گەورەترین نووسەری فەرەنسا لە سەردەمی مۆدرێنەدا.

ڕۆسۆ بەهۆی ئەو ژیانە زەحمەت و سەختەی هەر لە منداڵییەوە ژیاوە، پاشان بە هۆی ئەو چەوساندنەوە و ڕاوەدونانەی کە دواتر دوچاری دەبێت، بووەتە کەسێکی هەڵسوکەوت سەیر. ئەو لەبەر ئەوەی لە ساڵانی سەرەتای ژیانیدا بەدەست هەژاری و برسیەتی و نا جێگیرییەوە ناڵاندویەتی، بووەتە کەسێک پڕ لە ئێش و ئازار و هەستی

مرۆڤدۆستانەی مەزن. دایکی لە کاتی لەدایکبونی رۆسۆدا دەمرێت، لەبەر ئەوە دواتر دەڵێ: (یەکەم تاوانم ئەوەیە من بوومە هۆی ئەوەی دایکم ژیان لەدەستبدات).

پاشان باوکی ژنێکی دیکە دەهێنێت و دەستبەرداری رۆسۆ دەبێت کە تەمەنی تەنها دە ساڵە، بەجێیدەهێڵێ خۆی کاروبارەکانی ژیانی خۆی بەڕێوەببات. بۆیە لە شاری جنێف و لە کۆڵانێکی میللیدا لای یەکێک لە سنعەتکارەکان ئیش دەکات. بەڵام لە یەکێک لە رۆژەکاندا لە شار ڕادەکات و بەهۆی مەیلە رۆمانسییەکەی کە شەیدای سروشت بوو، یان بە هۆی حەزی لە سەرکێشی کە لەناوەوەیدا بوو، بەرەو پێدەشت و کێڵگەکان ڕادەکات.

لە ڕاستیدا رۆسۆ لەگەڵ کوڕە خاڵەکەی لە دەرەوەی شار یارییان دەکرد، کاتێ لەناکاو بێ ئەوەی هەست بکەن، شەو دێت و دنیا تاریک دادێت، ئەوان بە ڕاکردن دەگەڕێنەوە بۆ شار، بەڵام دەرگا و دەروازەکانی شار داخرابوون. پێویستە ئەوە بزانین شارەکانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، شەوانە دەرگا و دەروازەکانی دادەخست، دروست وەک ئەوەی مرۆڤ شەوانە دەرگای ماڵەکەی خۆی دادەخات. کوڕە خاڵەکەی لەبەردەم دیوارەکاندا مایەوە، چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆر و هاتنی بەرەبەیانیی دەکرد، تاکو بڕواتە ژورەوە و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و داوای لێبوردن و پەشیمانبونەوە بکات لەو هەڵەیەی کە کردویەتی. بەڵام هەرچی جان جاک رۆسۆ بوو، لەبەردەم دیوار و دەروازەی شارەکەدا، چاوەڕوانی نەکرد، ئەو ئەم دەرفەتەی بە هەل زانی تاکو بەرەو پێدەشتەکانی دەوروبەر ڕابکات کە جوانترین ناوچەی نێوان سویسرا و فەرەنسایە.

دواتر رۆسۆ لە دڵی خۆیدا وتویەتی: (کوڕە خاڵەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێکی گەرموگوڕ، دایکێک چاوەڕوانی دەکات، باوکێک بایەخی پێدەدات، بەڵام من بۆ چ شتێک بگەڕێمەوە.. بۆ ماڵێکی چۆڵ و هۆڵ؟ من نە ماڵم هەیە نە دایک نە باوک و نە هیچ شتێک) ئەمەیە بەرەو سەرکێشی و موغامەرە و ڕاکردن و بە تەواوی دوورکەوتنەوە لە جنێف، ڕاپێچی دەکات. ئەو ڕاکردن و دوورکەوتنەوە و موغامەرەیە مەترسیدار بووە و دەرئەنجامەکانیشی نەزانراوبووە، چونکە لەسەر ڕێگا بۆی هەبوو هەر کەسێک بێت بیکوژێت یان هەر دڕندەیەک بێت و کەلەپاچەی بکات بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت و سۆراخی بکات. بەڵام چاودێری خوداوەند لەسەر سەری بووە و لەو دوورەوە پارێزگاری لێکردووە و ئاگای لێی بووە. کەس نەیدەزانی هەڵەشەیی ئەم مێردمنداڵە، سەرەتای سەرکێشییەکی شێتانەبوو کە دواتر دەیکات بە گەورەترین نووسەر و بیرمەندی سەدەکانی مۆدێرنە.

پیاو، نەهامەتییەکان و ناسۆری و تاڵاوەکانی ژیان دروستی دەکات، نەک کەیف و سەفا و خۆشگوزەرانی. کوڕوکاڵی خێزانە دەوڵەمەندەکان، بە دەگمەن بلیمەتێکیان تێدا هەڵدەکەوێت. دواتر بەخت یاوەری رۆسۆ دەبێت و دەیگەیەنێت بە ماڵی ئەو ئافرەتەی کە بە ڕاستی دەبێت بە (دایکی) و قەرەبووی لەدەستدانی دایکایەتی و هەست و سۆزی مرۆڤایەتی بۆ دەکاتەوە کە لێی بێ بەش ببوو. ئەو ئافرەتە ناوی خانم «دۆفارین» بووە کە لەلایەنی پاشای وڵاتەوە، ڕاسپێردراوە کوڕوکاڵی پرۆتستانتەکان، لە مەزهەبەکەی خۆیان وەربگێڕێت و بیانخاتە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی پاپای رۆمانی. لەو سەردەمەدا پاپا، مەزهەبی پرۆتستانت -ی بە مەزهەبێکی تەواو گومڕا و لادەر لە ئاینی ڕاست و

دروست دادەنا. کاتێ رۆسۆ ئەو خانمە بۆ یەکەمجار دەبینێ کە لە هەڕەتی گەنجیەتی و جوانی و قەشەنگیدا بـووە، لە دڵی خۆیدا دەڵـێ: (ئەو مەزهەبەی ئەم خانمە هەیەتی، بێگومان دەتباتە بەهەشت!).

بەم شێوەیە رۆسۆ بۆ ئەوەی بتوانێ بژی یان بۆ ئەوەی بەوپەڕی سادەییەوە لە ژیاندا بمێنێتەوە، ڕازیدەبێ مەزهەبەکەی خۆی بگۆڕێت و بچێتە سەر مەزهەبی دوژمنەکانی یان دوژمنی باوباپیرانی. هەروەها بۆ ئەوەی لەژێر سایەی چاودێر و بەخێوکردنی ئەم ئافرەتە شۆخ و شەنگە «دۆفارین»، بمێنێتەوە، ڕازی بـووە مەزهەبەکەی خۆی بگۆڕێت. رۆسۆ دواتر لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (دانپیانانەکان)، ئەم خانمە بە نەمری ڕادەگرێت و تابلۆیەک یان پۆترێتێکی ئەم خانمە دەکێشت کە زەمەن بەسەر دەچێت ئەو تابلۆیە یان ئەو پۆترێتە بەسەر ناچێت. بەڕاستی ئەو لاپەڕانە نەمرن. کاتێ دوای چەند ساڵێک ئەو خانمە دەمرێت، رۆسۆ بە کوڵ بۆی دەگری و خۆڵی گۆڕەگەی دەکا بەسەر خۆیدا و دەموچاوی لە خۆڵی گۆڕەکەی هەڵدەسوێ. رۆسۆ بە درێژایی کتێبەکە بە (دایە) ناوی دەبات و ئەویش بە (بچکۆلەکەم) ناوی رۆسۆ دێنێت. جارێکیان ئەم خانمە بە رۆسۆ دەڵـێ: (کە گـەورە بووی، بیرم دەکەیت). ئەو بەو قسەیە ئاگری لە جەرگی رۆسۆ بەردا. لە ڕاستیدا دواهەمین دەقێک رۆسۆ نوسیبێتی بۆ ئەو خانمە بووە، بەڵام ئەو دەقە تەواو نەکرا، چونکە رۆسۆ لە میانی نوسینەوەی ئەو دەقەدا دەمرێت، ئەمەش دوای پەنجا ساڵ لە یەکترناسین بوو. لە واقیعدا ئەو ئافرەتە جێگای دایکە ڕاستەقینەکەی بۆ گرتەوە کە قەدەر وایکرد رۆسۆ هەرگیز دایکە ڕاستەقینەکەی خۆی نەبینێت



رۆسۆ

و نەیناسێت، چونکە لەکاتی لەدایکبوندا یان بەهۆی ئەم لەدایکبوونە زەحمەتەوە دەمرێت.
دواتر «ریمۆن ترۆسۆن» بەردەوام دەبێت و دەڵێ:
(بەڵام پێویستە پێش مەسەلەکان نەکەوین، بۆ خۆشبەختی رۆسۆ، ئەو خانمە یەکسەر نەمرد، بەڵکو دوای چەندین ساڵ مرد، دوای ئەوەی شەونخونی زۆری کێشا لەپێناو پەروەردەکردن و ئامادەکردنی رۆسۆ بۆ ساڵانی نەمری داهاتوو). لە پشت هەر پیاوێکی مەزنەوە ئافرەتێک هەیە. بەڵام ئایا ئەم ئافرەتە دەیزانی، ئەم منداڵە ونبووەی سەر رێگا و بانەکان، کە لەناکاو هەنگاوەکانی بەرەو ماڵەکەی ئەم هێنایان، دەبێ بە پێغەمبەری سەدەکانی مۆدێرنە؟ بێگومان نەخێر. گرنگ ئەوەیە ئەو دوای ئەوەی بەخێویکرد و گەورە بوو، لێگەڕا بڕوات بۆ پاریس تاکو بەشوێن ڕزق و سەرکەوتن لە ژیاندا بگەڕێت.. لەوێ بووە نووسەرێکی بەناوبانگ و ناوی دنیای پڕ کرد. ئەو خانمە دواتر سەرسام دەبێت بەوەی دەبیسێ رۆسۆ گەیشتووەتە لوتکەی نەمری، چونکە ئەو هەموو خاڵە لاوازەکانی رۆسۆی دەزانی. ڕەنگە پێی سەیر بوبێت کەسێکی وەک رۆسۆ بگاتە ئەو پێگەیە. هەر ئەمەشە

هەندێجار لای ئێمەش ڕوودەدات، کاتێ لە نزیکەوە کەسێک دەناسین و دواتر ناوبانگ دەردەکات و پێمان سەیرە ئەو ناوبانگەی دەرکردووە.
مەسەلەکە هەر چۆنێک بێت، ئەم گەنجە هەژارە، دوای ئەوەی لە ژیانی ناخۆش و دووبارەبووی هەرێمە دوورەکان بێزار دەبێ، لە پاریسی پایتەخت بەشوێن بەختی خۆیدا دەگەڕێت. ئاشکرایە هەموو ڕۆشنبیرانی گوندەکان یان پارێزگاکان، ئەوە دەزانن کە هەرگیز ناگەنە ناوبانگ دەرکردن، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەڕۆن بۆ پایتەخت و تێیدا نیشتەجێ دەبن، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت. هەر ئەمەشە لای ڕۆشنبیرە عەرەبەکان ڕویداوە، هەموان خەون بەوەوە دەبینن بڕۆن بۆ دیمەشق یان بێروت یاخود بەغداد یان قاهیرە...هتد. وەلێ لە پاریس ژیانی نەبونی و کوێرەوەری بۆ جان جاک رۆسۆ دەستپێدەکات، ئەو لە پاریس کەسێکی نەناسراو، نادیار بوو، کەسێک نەبوو لەوێ بیناسێت. لەو سەردەمەدا ئەگەر دەوڵەمەند نەبویتایە یان ئەرستۆکرات و کوڕی خێزانێکی خانەدان نەبویتایە یاخود لەلایەن یەکێک لە گەورەکانەوە پشتگیریت لێنەکرایە، ئەوا بەختت لە سەرکەوتن یان لە بەدەستهێنانی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی، سفر بوو



یان لە سفر دەچوو. ئالێرەدا بلیمەتی جاک جاک رۆسۆ دەردەکەوێت، ئەو گەرچی هەموو شتێک لە دژی بوو، کەچی توانی بە یەک کەڕەت لە خواری خوارەوە باز بدات و بگاتە لوتکە و ئەو قسەیەی نیتچەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە وتویەتی: (تەنها کەسایەتییە بلیمەتەکان بارودۆخەکان دەبڕن).

بەڵام دانەری کتێبەکە پێیوایە ئەو سەرکەوتنە دەمودەست ڕوینەداوە، بەڵکو دوای چەندین ساڵ لە کوێرەوەری و چاوەڕوانی و چاودێریکردن هاتووەتەدی. رۆسۆ لەو ماوەیەدا کارەکەرێ کە ناوی «تیریز لۆفاسیر»ە، دەناسێ کە لە ئوتێلەکەدا جلوبەرگ دەشوات و پەیوەندی لەگەڵدا دەبەستێ. ئەو کارەکەرە کچێکی سادەو ساکار، نەخوێندەوار بووە و نەیزانیوە بنوسێت و بخوێنێتەوە. بۆیە نەیتوانیوە پۆز و کەشوفش بەسەر رۆسۆدا لێبدات و بە رۆسۆ ڕازیبووە، گەرچی رۆسۆ لە هەردوو لایەنی جەستەیی و دەرونییەوە نەخۆش بووە.

دواتر رۆسۆ «دیدرۆ» دەناسێت کە ئەویش وەک رۆسۆ لە پاریس بەشوێن ناوبانگدا دەگەڕا، ئیدی ئەم دووانە بوونە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی یەک کە لێکدانەدەبڕان. ئەوان بۆ ئەوەی بتوانن پارەی کرێی ژوورەکەیان بدەن یان بۆ ئەوەی بتوانن مانگەکە بە هەزار دەردە سەری ببنە سەر، کاری وەرگێڕان و خزمەتکردن لە ماڵە دەوڵەمەندەکاندا دەکرد.

ئەو کات کەس نەیدەزانی ئەو دووانە، دواتر دەبنە دوو لە فەیلەسوفە گەورەکانی سەردەمەکە. ئەوان جارێ هەر لە سەرەتادا بوون. بەڵام ئەوەی ڕوون و ئاشکرا بووە، ئەوەیە کە دیدرۆ بە پلەی یەکەم پیاوێکی کۆمەڵایەتی بوو، حەزی بە تێکەڵاوبوونی خەڵک دەکرد، سەرەڕای ئەوە ئەو قسەکەرێکی لێهاتوبووە، گوتاربێژێکی لێزان بووە و بە ئاسانی کۆنترۆڵی گوێگرەکانی کردووە و بەهۆی بەلاغەت و زمانپاراوی و بوێرییەکەیەوە بە ئارەزوی خۆی گەمەی بە گوێگرەکانی کردووە. بەڵام جان جاک رۆسۆ کەسێکی دوورەپەرێز بووە و حەزی لە تەنهایی کردووە و ترساوە لەوەی لە کۆمەڵگادا تێکەڵاوی خەڵک ببێت. لێرەوە ئەم دوو گەنجە یەک ئەوی دیکەیانی تەواو کردووە، چونکە هەریەکەیان پێچەوانەی ئەوی دیکەیان بووە.

دانەری کتێبەکە پێیوایە ژیانی ئەدەبی و فیکری رۆسۆ، بەشێوەیەکی لەناکاو و درەنگ دەستپێدەکات: واتە دوای ئەوەی ٣٨ ساڵی تەمەنی تێپەڕاندووە و لە چل ساڵی نزیکبووەتەوە. ئەو بە شێوەیەکی نەناسراو دەستی پێکرد، شێوەیەک هاتنە خوارەوەی (وەحی)یمان بیردەخاتەوە کە بۆ پێغەمبەرەکان هاتوتە خوارەوە یان ئەو بەهرەیەمان بیردەخاتەوە کە وەک ڕەهێڵە بەسەر شاعیرەکاندا دادەبارێت. رۆسۆ دەڕۆشت بۆ سەردانی دیدرۆ کە بەهۆی بیروڕا عەقڵانییە ئازا و بوێرییەکەیەوە دەربارەی ئاین، لە قەڵای ڤانسین زیندانی کرابوو.

رۆسۆ رۆژنامەیەکی پێ بوو، تاکو لە ڕێگادا خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، خەڵکی لەو سەردەمەدا (بەدەم ڕێوە) دەیانخوێندەوە، لەناکاو لە رۆژنامەکەدا ئەم پرسیارەی خوارەوە دەبینێ کە ئەکادیمیای دیگۆن وەک پێشبڕکێیەک خستبویە ڕوو: (ئایا لەم سەردەمەماندا، پێشکەوتنی پیشەسازی و زانست و هونەر، ئەخلاقیان باشترکردووە یان خراپتر کردووە؟). رۆسۆ هەر هێندەی دەقی پرسیارەکەی خوێندەوە، لەژێر درەختێکدا دەبورێتەوە، بە هەموو باڵای خۆی دەکەوێتە سەر زەویەکە و بۆ چەند

ساتێک هۆشی نامێنێت. کاتێ بە ئاگا دێتەوە و هۆشی دێتەوە سەر خۆی، دەبینێ بێ ئەوەی هەست بکات گریانێکی زۆر بە کوڵ گریاوە و فرمێسکەکان ڕوومەتیان تەڕ کردووە، بگرە تەڕایی گەشتووەتە سنگی و کراسەکەشی.

ئیدی لەو چرکەساتەوە، هەستی کردووە بووەتە کەسێکی دیکە. زانی گەشتووەتە ئەو حەقیقەتەی کە چەندین ساڵ بوو بۆی دەگەڕا، سا ئەو گەڕانە بە هۆشیارییەوە بێ یان بێ هۆشیاری و بێ ئەوەی بیدۆزێتەوە. ئەو بە درێژایی چل ساڵ بەشوێن ئەو حەقیقەتەدا دەگەڕا، بێ ئەوەی بزانێ ئەو حەقیقەتە لە خوێنبەرەکانی لاشەی لێیەوە نزیکترە. حەقیقەت بۆ جان جاک ڕۆسۆ لەو ڕۆژەدا دەرکەوت کە لەسەر ڕێگای دارستانی (ڤانسین) بوو، لەناکاو حەقیقەتی بۆ دەرکەوت کە خۆشی چاوەڕوانی نەدەکرد. ڕۆسۆ حەقیقەتی لە ئامێز گرت و ئەویش ڕۆسۆی لە ئامێز گرت و ڕۆسۆی کێشا بە زەویدا. پێویستە بزانین حەقیقەت عەشیقەیەکی بێ بەزەییە و خۆی تەنها ڕادەستی گەورەکان یان گەورەی گەورەکان دەکات. حەقیقەت بە ڕەنگە گەشاوەکەی، بە کڵپە گڕگرتووەکەی، ئاوی چاوی ڕۆسۆی برد. لە ناکاو تاڤگەیەک لە ڕوناکی هێرشی بۆ هێنا، ئەمە شتێکە هەرگیز ڕوونادات، تەنها بۆ نوخبەیەک لە مرۆڤەکان نەبێت، یان بڵێ بۆ نوخبەی نوخبە پاڵێوراوەکان نەبێت. بەڵام باجەکەی چەند بە گرانی دەدەن! ئیدی لەو کاتەدا تیۆرەی سەدەکانی مۆدێرنەی لە هەموو لایەنەکانییەوە گەلاڵە کرد: لایەنی پەروەردەیی و سیاسی و ئەخلاقی. هەر لەو کاتەدا ئەم حەقیقەتە سادە و ساکارەی دۆزییەوە: پێشکەوتنی زانستی یان مادیی یاخود تەکنەلۆژی شارستانیەت، بە هەمان ئاست و وەک پێویست هاوشان نییە لەگەڵ پێشکەوتنی ئەخلاقی یان هیومانستی. پەیوەندییەکی ئۆتۆماتیکی لەنێوان ئەو دوو شتەدا نییە، وەک ئەوەی وا هەست دەکەین. تەماشای شارستانیەتی خۆرئاوای ئێستا بکە و تەماشای ئەو کردەوانە بکە کە لە ساتەوەختی قۆناغی ئیمپرالیزمدا ئەنجامیدان، بگرە تا ئێستاش ئەنجامیان دەدات.

بەم شێوەیە ڕۆسۆ لە هەڕەتی سەردەمی ڕۆشنگەری گەورەدا، تەنانەت پێش ئەوەی مۆدێرنە سەرکەوتن بەدەست بێنێت، قەیرانی مۆدێرنەی دۆزییەوە. ڕۆسۆ ئەو شتەی بینی کە نابینرێ، لانی کەم بە دوو سەد ساڵ پێش سەردەمەکە کەوتووە! ئەو دژ بە کۆبەندی باو ڕۆیشت، بۆیە هاوسەردەمەکانی خۆی لە ناخەوە هەژاند. هەمو ئەو شتانەی ڕۆسۆ پێشبینی دەکرد، ئێمە لە مڕۆدا تێیدا دەژین: ئەم ناکۆکییە گەورە و ئاشکرایەی نێوان شارستانیەتێکی زانستی تەکنەلۆژی نایاب لەلایەک، لەگەڵ داڕوخانێکی ئەخلاقی و هیومانستی لەلایەکی دیکە! ڕۆسۆ هەوڵیدا بارودۆخەکان ڕاستکاتەوە، خۆی سوتاند تاکو ئەوانی دیکە ڕزگار بکات، کەچی چەوساندیانەوە و ڕاویاننا و ژیانیان لێ تاڵ کرد.

کێشەی جان جاک ڕۆسۆ ئەوەبوو زیاد لە پێویست حەقیقەتی خۆشدەویست. قەدەغەیە حەقیقەتت خۆشبوێت، قەدەغەیە کەسێکی سەر ڕاست بیت. ئەو بەو سوتانە نایاب و ئاشکرا و ڕوونەی، وانەیەکی فێرکردین کە هەرگیز لەیاد ناکرێ. ڕۆسۆ لێکۆڵینەوەیەکی نووسی و ناردی بۆ ئەو ئەکادیمیایەی پرسیارەکەی کردبوو، دواتر بە تەواوی مەسەلەکەی لەبیر دەچێتەوە، کەچی لەناکاو سەرسام دەبێت بەوەی لەنێو هەمو بەشداربواندا ئەو خەڵاتەکەی بردووەتەوە. ئیدی لەنێوان شەو و ڕۆژێکدا ناوبانگ

پەیدا دەکات و کتێبە نایابەکانی یەک لە دوای یەک دێن: لەوانە وتارێک سەبارەت بە ڕیشەی نایەکسانی و چەوساندنەوە لەنێوان مرۆڤەکاندا، پەیمانی کۆمەڵایەتی، کتێبی ئەمیل دەربارەی پەروەردە، ڕۆمانە بەناوبانگەکەی (هیلۆیزی تازە).

هەموو فەرەنسا و هەموو ئەوروپا لەو کتێبانەوە هاتەدەرەوە. بیرمەندە گەورەکان، لە «کانت»ەوە بۆ گۆتە، لە «هیگڵ»ەوە بۆ هۆڵدەرلین بۆ تۆڵستۆی و بۆ دیستۆفسکی، لە یادی جان جاک ڕۆسۆدا، سەری ڕێز و نەوازشیان دانەواند و دانیان بەوەدا نا کە ئەوان قەرزاری ئەون. بەم شێوەیە و لە ماوەی تەنها چەند ساڵێکدا، هەمو ئەوەی دەیویست خستیە سەر کاغەز و دوای ڤۆڵتێر بووە ناودارتین نووسەر لە سەدە تازەکاندا. دواتر دانەر بەم شێوەیە کۆتایی بە کتێبەکەی دێنێت و دەڵێ: بەڵام لەو چرکەساتەوە کێشەکانی دەست پێدەکات، ناوبانگ لەگەڵ خۆیدا کێشە دێنێت. ڕۆسۆ کەوتە نێوان دوولای بەرداشەکەوە و نەیتوانی خۆی لێ دەرباز بکات. لایەنی یەکەمی بەرداشەکە بریتیی بوو لە تووڕەبوونی چینی ئەرستۆکراتیەتی حوکمڕان لە ڕۆسۆ، چونکە ڕۆسۆ هەمو حەق و مافێکی سەروەری دابووە دەست میللەت و پێشبینی هەرەسهێنان و ڕوخاندنی ڕژێمی ستمگەر و مافی خودایانەی پاشاکانی فەرەنسای کرد. هەروەها ڕۆسۆ دژ بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی باو ڕاپەڕی، بارودۆخێک بریتی بوو لە دەوڵەمەندی لە ڕادەبەدەری دەوڵەمەندەکان و هەژاری کوشندە بۆ خەڵکانی سادە و گشتی میللەت. ڕۆسۆ لەم بوارەدا بەشدارە لە گەڵاڵەکردنی تیۆری دیموکراسی مۆدرێن و دەرفەتی لەبەردەم بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسیدا کردەوە، لەمەشدا هەرگیز لێی خۆش نەبوون. لایەنی دووەمی بەرداشەکە هاوڕێ فەیلەسوفە ڕۆشنگەرەکانی دیکەی بوون کە بە هۆی ناوبانگە ئەفسانەییەکەی کە هەموو شتێکی لەبەردەمی خۆیدا



هیگڵ




ڕادەماڵی، ڕقیان لێی هەڵگرت یان بەغیلی و ئیرەییان پێ دەبرد.

ڕۆسۆ لە لایەن ئوسوڵییە کاسۆلیکەکان و ئوسوڵییە پرۆتستانتەکانەوە گەمارۆیان دا، گەرچی ئەو دوو لایەنە دوو نەیار و دوژمنی سەرسەختی یەکتر بوون. تایفەکەی خۆی و تایفەکەی دیکە، تادەهات تەنگیانپێهەڵدەچنی و کتێبەکانی لە هەمو شوێنێکی پاریسەوە بۆ جنێف بۆ بێرن بۆ ئەمستردام دەسوتێنران و پڕوپاگەندەی نابەجێیان لە دژی بڵاودەکردەوە. بەڵام شۆڕشی فەرەنسی کە دوای تەنها دە ساڵ لە مردنی ڕۆسۆ بەرپابوو، بەتەواوی تۆڵەی کردەوە و ناو و وێنەکانی بە ئاشکرایی بەرزکرانەوە. کتێبە نەمرەکانی ڕێیانخۆشکرد بۆ دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی تازە و نووسینەوەی ناودارترین دەق لە سەدە تازەکاندا: جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون.

***سەرچاوە:***

الشرق الاوسط، ١٠ حوزەیران، ٢٠١٢، ژمارە ١٢٢٤٨

# ڕۆمانییەکان و مانای ڕاستەقینەی نیشتمانپەروەریی

نووسینی: کێنث مینۆك
لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

ڕامیاری یۆنانی لەسەر بناغەی عەقڵ و ئاوەز دامەزرا بوو، لای ڕۆمانییەکان خۆشەویستی بناغەی کردەی سیاسەت بوو - خۆشەویستی وڵات، خۆشەویستی ڕۆما خۆی. ڕۆمانییەکان هەر وەک خێزانێک سەیری شارەکەی خۆیان دەکرد، ڕۆمۆلۆس-یش وەک دامەزرێنەر و باپیرە گەورەی هەر هەموویان چاوی لێدەکرا. ئەمەیان زۆر جیاواز بوو لە حاڵی یۆنانییەکان، بۆ ئەوان خێزان لەسەر ئاستی فەلسەفی ئاماژەی بۆ دەکرا کە وەک خاوەن سروشتێکی گیاندارانە کۆمەڵێک پێویستی هەیە کە لە ڕێی ئازادی سیاسەتەوە ئەم دۆخە تێپەڕ دەکرێت. ئەوە هەوڵی عیساپەرستێکی مەزنی وەک (سەینت ئۆگستین) بوو کە توانی بەشێکی هەرە زۆر لە رۆحی نیشتیمانپەروەری بە سۆزێکی گەورە بگۆڕێت کە ڕۆمانییەکانی ئاراستە دەکرد، چونکە تا ڕادەیەک ئەم

**فەرهەنگی ڕۆمانی لە چاو فەرهەنگی یۆنانی بنەڕەتی و ڕەگ داکوتاوترە چونکە لاتینی ئەو زمانە بوو کە مرۆڤ دەیتوانی لە ڕێگەی ئەو زمانەوە لە سیاسەت تێبگات، نەك ئەو کاتەی ڕۆما جیهانی ڕۆژئاوای بەڕێوە دەبرد، بەڵکو دوای ئەوەش بە هەزارەها ساڵ کە ئەورووپا سیاسەتی دەکرد، تاوەکو دەوڵەتی مۆدێرن سەری هەڵدا لە سەدەی شازدەمدا**


کێنث مینۆک

هەستی دەکرد کە ئەم حاڵەتە نیشانە و نموونەی خۆشەویستییەکە کە ڕۆحی عیساپەرستەکانی زیندوو دەکردەوە. (Dulce et decorum est pro patria mori) ـ بە واتا "زۆر جوان و شیاوە کەسێک لە پێناو وڵاتەکەیدا بمرێت." ئەمەیان ڕستەیەکی شاعیری ڕۆمانی (هۆراس) بوو، دێڕێکە کە شکۆمەندترین هەست و نەستی سیاسی تیایدا بەرجەستە بووە. بەڵام زەمەن دەگۆڕێت، پاشان لە دوای ئەو هەموو زیانە گەورەیەی جەنگی یەکەمی جیهان، هەر ئەم دێڕە بە تەوسەوە بەکار دەهات کە ئاماژە بە بێدەسەڵاتی و بێچارەیی ملێونەها کەس بکات کە کەوتبوونە نەخشەی دوژمنکارانە و شەڕانگێزی سیاسەتکارەکان. چۆنییەتی ئەو گۆڕانە لە ڕوانین بوو بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی ئێمەدا. شارە یۆنانییەکان وەک ڕووداوی مەزن و سەراسیمە لەمێژووی ڕۆژئاوادا دەرکەوتن، بەڵام ڕۆما وەک تاکە شارێکی تاقانە و دامەزراو و تۆکمە خۆی نواند تاوەکو بوو بە ئیمپراتۆرییەت، کە لە دوای داڕووخانی و دەنێو دار و پەردووی ئەو ئیمپراتۆرییەتە کڵێسا خوڵقا کە هەوڵیدا هەر هەموو جیهان بخاتە ناو باوەشی خۆی، لەوەش کەمتری نەدەویست. کەچی یۆنانییەکان تیۆریزەکەری کارامە و داهێنەر بوون، ڕۆمانییەکان هۆشیار و بەئاگا بوون، وەک جوتیار و جەنگاوەر. کەمتر لە باو و باپیرانیان حەزیان بە ئایدیاکان دەکرد. سەبارەت بە خولیابوون بە ئایدیا و بیر و باوەڕەکان. ئێمە میراتگری یۆنانییەکانین، بەڵام بۆ مەسەلەی پراکتیکردن و خولیابوون بە کردە میراتگری ڕۆمانییەکانین، هەریەک لەو دووانەش جێپەنجە و مۆرکی جیاوازی خۆیان لەسەر میللەتە جۆربەجۆرەکانی ئەورووپای مۆدێرن بەجێهێشت. هەڵبەتە شەیدابوونی ئەڵمان بە یۆنانییەکان، بۆ نموونە، زۆر بە زەقی مەزنتر دەردەکەوت لەوەی بەریتانییەکان و فەرەنسییەکان، کە بۆ ئەوان ڕۆما ببوو بە نموونەی باڵا. هەر هەموو ئەورووپاییەکان، بەهەر حاڵ، کەڵکیان لەو دوو میراتە وەرگرت کە سەر بە دوو فەرهەنگی تایبەت و جیاواز بوون کە

له ڕێی ئەو دوو فەرهەنگەوە دەکرێت لە ژیانی ڕامیاری ورد ببنەوە و بیپشکنن. فەرهەنگی سیاسی یۆنانییەکان ـ ڕێباز و ڕەفتاری ڕامیاری، پۆلیس و خودی سیاسەت خۆی ـ هەروەها فەرهەنگی شارستانییانەی ڕۆمانییەکان، نەرم و نیانی و ڕەوشتجوانی، هاوڵاتی و ژیار، چ تەلارسازی بێت و چ زاراوەسازی سیاسەتی ئەمریکی، بۆ نموونە، هەر هەموویان بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو میراتی ڕۆمانین.

فەرهەنگی ڕۆمانی لە چاو فەرهەنگی یۆنانی بنەڕەتی و ڕەگ داکوتاوترە چونکە لاتینی ئەو زمانە بوو کە مرۆڤ دەیتوانی لە ڕێگەی ئەو زمانەوە لە سیاسەت تێبگات، نەک ئەو کاتەی ڕۆما جیهانی ڕۆژئاوای بەڕێوە دەبرد، بەڵکو دوای ئەوەش بە هەزارەها ساڵ کە ئەوروپا سیاسەتی دەکرد، تاوەکو دەوڵەتی مۆدێرن سەری هەڵدا لە سەدەی شازدەمدا. ئێمە باس لە داتەپینی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی دەکەین، بەڵام داڕووخانی دەستەڵاتی سیاسی ڕۆما (لە ئیمپراتۆرییەتی خۆرئاوادا) پێ بە پێ لە تەک سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆحی هاوکات کەوتنەوە، ئیمپراتۆرییەتێکی ڕۆحی ژێر ڕکێفی پاپایی. لەڕاستیدا، ئەو خەڵکانەی کە لەو کاتەدا دەژیان کە ئێمە بە (سەدەکانی ناوەڕاست) ناوزەدی دەکەین (لە ٤٠٠ بۆ ١٥٠٠ دوای زایین) بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەسەر ئەو بڕوایە مانەوە کە ئەوان هێشتا دەنێو دار و پەردووی داڕماوی (ڕۆما) دا دەژیان. هەتا هەندێکجار هەوڵی ئەوەیان دەدا زیندووی بکەنەوە. (شارلمان) کە پادشای (فرانکس) بوو، وەک ئیمپراتۆری ڕۆما و لە ساڵی (٨٠٠) بەر لە زایین تاج نرایە سەری، ئیمپراتۆررییەتی ڕۆما - ی پیرۆز بە فورم و سێبەری خۆی هەر بەردەوام بوو تا لە (١٨٠٦) لەلایەن (ناپلیۆن)ەوە کۆتایی



سەینت ئۆگستین

پێهات، کە لە جێگەی ئەودا نەوەکانی دوای خۆی ئەو تەخت و تاجەیان داگیر کرد، لە هەمان کاتدا بە هەموو (فرەنسا)دا مۆنیومێنتی لەسەر ستایلی ڕۆمانییەکان بڵاوکردەوە. هەر لەسەرەتای قۆناغی تازەدا، (ماکیاڤێللی) سیاسەتی ڕۆمانی وەک مۆدیلێک پێشکەش بە هەموو ئەوروپا کرد. لە (گوتارەکان لەمەڕ دە کتێبەکەی لڤی (١٥١٨) زۆر شت هەیە سەبارەت بە دیدگای "مارکس" بوترێت کە شۆڕشی فەرەنسی ڕووداوێک یان گەمەیەک بوو لە بەرگی ڕۆمانی ـ دا.

بوو. هەردووکیان کاردانەوەیەکی پڕ لە سەراسیمەیان هەبوو لە بەرامبەر چیرۆکی ڕۆما ـ دا وەک سەرکێشی بێ کۆتایی و سیحراوی کۆمەڵە کەسانێک چاویان لێدەکرد، کەسانێک کە وا سەیری خۆیان دەکرد کە ئەرکیان بە شارستانییەتکردنی هەر هەموو جیهانە. لەلایەن (ڕۆمـولـوس)ەوە و لە ساڵی (٧٥٣)ی پێش زایین بە گوێرەی ئەفسانەیەک دامەزرا، ڕۆما لەلایەن کۆمەڵێک پادشاوە تا ساڵی (٥٠٨) ی پێش زایین بەڕێوەچوو، تا سەروەختی لابردنی تارگوین ـ ی شکۆدار لەسەر تەخت لە لایەن (ژونیونس بروتوس) کە سەرداری تاقمێک لە ئەرستۆکراتەکان بوو، کە تووڕە و داخدار بوو، چونکە (لوکریشیا) ئەتەک کرا بوو (وەک چیرۆکەکان دەگێڕنەوە). هەر لە دەرئەنجامی ئەوەبوو کە ڕۆمانییەکان بە هەمان چاو سەیری پادشایەتی و کۆیلەبوونیان دەکـرد، بەڵام لە کاتی سەرلەنوێ داڕشتنەوەی دەستووری خۆیاندا داهێنانی سیاسیانە و دەگمەن و جیاوازی خۆیان خستە ڕوو، ئەویش لە ڕێگەی دەستکارییەکی ورد و قووڵ بۆ دەستوورەکەیان کە بۆ هەمیشە بە دامەزراوی ڕەگی داکوتا. هەتا خودی دەسەڵاتی پادشاهی کە لەلایەن دوو قونسڵ یان ڕاوێژکار پێکەوە ڕۆڵی جێگرەوەی پادشایان دەبینی، پێکەوەش دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنووری شاهنشاهی لەلایەن ئەوانەوە وەک ئۆفیسێک بەڕێوە دەچوو، دەیانتوانی وەک میراتگر و جێ نیشانەی شاهنشاه ئامادەگیان هەبێت لە فۆرمی بەرپرسی ئاییینی بە (REX SACRORUM) ناوزەند دەکرا. ئەنجوومەنی پیرانیش کە ڕۆڵی پشتگیرییان دەبینی (وەک ڕەمز و ئامرازی فەرمانڕەوایی) هەر هەموو ئەو کارەکتەرانە توانیان بەردەوامی بە ترادسیۆنی سیاسەتی ڕۆمانی بدەن. هەڵبەتە بۆ هەمیشە جێگەیەک دەمایەوە بۆ بەشداری خەڵکە


هۆراس

ئەزموونی ( ڕۆما ) کە ئەوەندە ئەوروپاییەکانی سەرسام کرد بـوو، چەندین مۆدیلی جیاوازی پێشکەش بە ئەوروپاییەکان کرد بۆ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە و پشکنین. (دانتی) وەک شاعیرێکی ئیتاڵی و لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەو ئیمپراتۆرییەتە سەرسام بوو کە توانی ئاشتی بۆ جیهان بسازێنێت، کەچی ماکیاڤێللی خەسڵەتی پڕ بەهای کۆماری بەرایی بەرز نرخاند و پێی سەرسام



لوکریشیا

ڕەشۆکی و عەوامەکە، کە چینە هەرە سەرەکییەکەی ڕۆمانییەکان بوون، بەڵام لە دۆخێکدا بوون هەنووکە کە لە لایەن ئەرستۆکراتییەکانەوە بەڕێوە دەبران، پتر لە پادشا کە بەسەر هەردوو چینەکەوە سەردار بوون، کە دواجار دەرچوو ئەوەش بەتەنیا و بەم چەشنە داد نادات. خەڵکە سادەکە هەستیان کرد کە چەوساوەن، لەلایەن ئەرستۆکراتەکانەوە ستەمیان لێدەکرێت، ئەو خەڵکە ڕەشۆکییە پێکڕا ڕووە و دەرەوەی ڕۆما ڕێگەیان گرتە بەر و لەسەر گردێک نزیک بەو شارە نیشتەجێ بوون. ڕۆمانییەکان توانیان ئەم گرفتە بەشێوەیەکی نموونەیی چارەسەر بکەن، ئەویش لە ڕێگەی (FOEDUS) واتا بەڵێنامەیەک، کە ڕێگەی بەو خەڵکە سادە و ڕەشۆکییە دەدا کە کارمەندی تایبەت بە خۆیان هەبێت بۆ ڕاپەراندنی کاروباری دەوڵەتی، ئەو ئۆفیسانەی کە دەبوونە تریبون و سەکۆی ئازاد بۆ ڕادەربڕین. چیرۆکی نموونەیی سیاسەتی ڕۆمانی بەشێکی وەڵامدانەوەیەکی دەستووری بوو بۆ کێشە و قەیرانەکان، بەشەکەی دیکەش بریتیبوو لە کۆمەڵێک کار و چالاکی پاڵەوانبازانەی نێو جەنگەکان کە لەو ڕێگایەوە بواریان بۆ ڕەخسا، کە وەک کۆمەڵێک جەنگاوەری ڕۆمانی بتوانن بجەنگن و سەرەتا دەر و دراوسێی خۆیان ببەزێنن، پاشانیش شارە یۆنانییەکانی باشووری ئیتاڵیا، سەرباری ئەوانەش کەوتنە پەلاماردانی (کارساجینییەکان) کە سێ جاران نائومێدانە هێرشیان کردە سەریان و لەدوا جاردا توانیان سەربکەون. لەسەردەمێکی زۆر زووتردا توانیان یۆنان داگیر بکەن و توانیان بەسەر هەموو کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستدا فەرمانڕەوابن، لەتەک ئەورووپای ڕۆژئاوا بە ئینگلتەرە و بەشێک لە خاکی ئەڵمانیاوە.

مێژووی ڕۆمانییەکان بە دەوری کۆمەڵێک ڕووداوی زۆر دراماتیکی دەخولێتەوە کە لەو میانەدا حوکمی کۆماری جێگە بۆ هاتنی ئیمپراتۆرییەت چۆڵ دەکات.

"یولیوس سیزەر" لە لایەن "مارکوس بروتۆس"ەوە لەناو دەبرێت، بە یاوەری کاسیوس و مریدەکانیان لە ساڵی (٣٣) ی بەر لە زایین، بەڵام هەر خودی ئەو پیلانگێڕانە لەلایەن برازەکەی "سیزەر"ەوە (قەیسەر)ەوە کە ناوی (ئۆکتاڤیان) بوو بەزین، بە یاوەری (مارک ئانتۆنی)ی هاوکار و هاوبەشی، پێکەوە توانیان ئەو پیلانگێڕانە تەفروتونا بکەن. ئەو کاتەشی کە ئۆکتاڤیان و ئانتۆنی کەوتنە دوژمنکاری و ناکۆکی، یەکەمیان توانی دووەمیان ببەزێنێت لە جەنگی (ئاکتییوم) لە ساڵی (٣١) بەر لەزاییندا و پاشان گەڕایەوە (ڕۆما) و سوور بوو لەسەر ئەوەی کە سەر لە نوێ دەستوورەکە دابڕێژێتەوە بە جۆرێک کە لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا بیسازێنێت. وەها سەرکەوتووانە ئەو کارەی ئەنجامدا


ماکیاڤێللی

کە ئەوەی ئەم وەک ئیمپراتۆرییەت بەڕێوەی دەبرد بوو بە فۆرمێک بۆ حوکمڕانی سیستەمی کۆماری لەدوو سەد ساڵی دواتردا.

ڕۆما نموونەی هەرە باڵای سیاسەت بووە وەک چالاکی کە لە لایەن کۆمەڵێک پیاوەوە ئۆفیسەکانی بەڕێوە چوون کە بە ئاشکرا توانیویانە سنوورێک بۆ ئەزموونکردن و بەکارهێنانی هێزو دەسەڵات دابنێن. ئەو کاتەی کە ڕۆمانییەکان بیریان لە هێز و دەستەڵات دەکردەوە. ئەوان تەنها دوو وشەیان بەکاردەهێنا تاوەکو جیاکردنەوەیەکی گرنگ بناسنەوە: (potential کە دەکاتە هێزی فیزیکی، کەچی (potestas) ئاماژە بوو بە مافێکی یاسایی و ڕەوا لەتەک هێز و دەستەڵاتێکدا کە لە ئۆفیسەکاندا فەراهەم بوو، لەپاڵ ئەوەشدا هەر هەموو ئۆفیسەکان لە بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەدا بەشداربوون، یان لە کۆی قەوارەی ئەو هێز و دەستەڵاتەی کە بۆ دەوڵەتی ڕۆمانی شیاو ساز بوو.

هەردوو فۆرمەکەی ئەو دەستەڵاتە، بە هەرحاڵ، جیاواز بوون لە بیرۆکەیەکی دیکە کە جۆرە بەشدارییەکی تەواو تاک و جیاوازی ڕۆمانییەکان بوو لە سیاسەت (auctoritas) بەشێوەیەکی زۆر دیار. ئەم زاراوەیە پردی پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئاینی ڕۆمانییەکانە کە جەختی لەسەر پەرستن و پیرۆزکردنی خانەوادەکان دەکردەوە. پاشانیش دەچوو بۆ پەرستنی ڕۆحی باووباپیران، زاتێک بە ناوی (auctor) بە واتا داهێنەر یان دامەزرێنەر و دەسپێشخەری شتێک بووە - دەکرێت شارێک بووبێت یان خانەوادە یان بنەماڵەیەک، یاخود هەتا داهێنەری کتێب یان بیرۆکەیەک (ئایدیایەک) بووایە. ئەرشیفی یان گەنجینەی پاراستنی ناوی داهێنەر و دامەزراوەکانی لای ئەنجوومەنی پیران تەقەت دەکرا

که وەک هەیکەلێک نزیک بوو لە ناوی باووباپیران. هەر شتێکی ئەوان لە ئامۆژگاری پتر مانای هەبوو، بەڵام لە فەرمان کەمتر چاوی لێدەکرا، هەڵبەتە ڕێزی ڕۆمانییەکان بۆ ئەو میراتە سەرچاوەیەکی ڕاستەقینەی کار و بەهرەی سیاسییان بوو. ئەوەش بێ چەند و چوون جۆرێک بوو لە دەستەڵاتی ڕامیاری بەڵام هەر هەمووی بەرپرسیارییەتی دەوڵەت بوو، یاخود کاروباری گشتی کە تۆزقاڵێک ئەم هێز و دەستەڵاتە پشت گوێی نەدەخست. ڕۆما ببوو بەجێ سەرنج و ئەفسوون بۆ خەڵکانی دیکە کە تا دەهات هێز و دەسەڵاتی بەرفراوانتر دەبوو، لە سەدەی دووەمی بەر لە زایین ئەو کاتەی



هانیبال

ڕۆما جیهانی (هێلینی) داگیر کرد، مێژوونووسی یۆنانی (پۆلیبوس) ئەوەی بۆ هاوڕێ یۆنانییەکانی ڕوون کردەوە کە ئەو هەژموونە زاڵە چییە، یاخود ئەو بە سەرداربوونە بەسەر جیهانەوە چ جۆرێکە. ئەم کە کارامە و لێهاتوو بوو لە زانستی یۆنانی و هاوڕێ لەمەڕ داتەپینی بازنەیی و یەک لە دوای یەکی حوکمەتەکان. پۆلیبوس ڕوونی کردەوە کە سەرکەوتنی ڕۆما لەو ڕاستییەوە دێت کە ناکرێت دەستوورەکەی بە شاهنشاهی چاوی لێبکرێت یان ئەرستۆکراتی یان دیمۆکراسی، چونکە ئەو دەستوورە هەڵگری هەر سێ ڕەگەزەکەیە. ئاکامی کۆبوونەوە و لێکدانی ئەو هێز و دەستەڵاتانە، وەک ئەو باسی دەکات یەکبوون و یەکگرتنێکە کە ئەوەندە بەهێزە کە بەرگەی هەموو ناهەمەتییەکی لەناکاو دەگرێت بە جۆرێک کە مەحاڵە فۆرمێکی لەوە باشتر بۆ وەها دەستوورێک بدۆزرێتەوە. ئەو مێژوونووسە لە هەموو شتێک پتر سەرسامی ئەو زەمینە توند و تۆڵە بوو کە ئەنجوومەنی پیران لەسەری وەستا بوون و توانیان وەڵام بە هەموو قەیران و کارەساتە مەزنەکانی ناو مێژووەکەی خۆیان بدەنەوە، بۆ نموونە بەزینی لە جەنگی (کانێ) لە لایەن (هانیبال)ی کارساجینییان لە ساڵی (٢١٨) بەر لە زایین. هانیبال ژمارەیەکی لە دیلە ڕۆمانییەکانی ناردەوە ڕۆما کە بەڵێنیان دا بگەڕێنەوە لای ئەوانەی کە دیلیان کردبوون، پاش ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکی خۆیان دەکەن لەسەر بەرەڵاکردنیان بە مەرجێک لەبری هەر دیلێک بەشە پارەیەک بدرێت بە (هانیبال). ڕۆمانییەکان بەوە قایل نەبوون کە سەری سەربازەکانی خۆیان بکڕنەوە، گەرچی ژیانی ئەوان لە مەترسیدا بوو. بەڵام ئەو دیلکراوانەیان ناردەوە بۆ (هانیبال) وەک شکۆ و شەرەف دەیخوازێت.

ناو و ناوبانگی ڕۆما بە ڕادەیەکی زۆر لەسەر هێزی مۆراڵی (ئەخلاقی) وەستا بوو، ئەوەش بۆ هەموو ئەو کەسانە ئاشکرا بوو کە مامەڵەیان لەگەڵ ڕۆمانییەکاندا دەکرد، بەرتیل وەرگرتن لە لای کارمەندان تاوانێکی گەورە بوو، ڕۆمانییەکان متمانەی ئەوەیان پێدەکرا کە خاوەنی سوێند و بەڵێنی خۆیان بن. پۆلیبوس - ی مێژوونووس هەستیدەکرد کە پێویستە بەرگری لەم خەسڵەتانە بکات و بیانووی بۆ بێنێتەوە و بیدا بە گوێی دۆستە یۆنانییەکان کە خۆپەرست و بەرژەوەندیخواز بوون، ئەوەی سەلماند کە ڕۆمانییەکان خاوەنی کۆمەڵێک بیر و باوەڕی لە عەقڵ بەدەر و سەیر بوون سەبارەت بە سزای دوای مەرگ کە لە دونیایەکی دیکەدا دەیچێژن، بەڵام ئەوە تەنها بۆ ئەوە بوو کە ئەو ترسە چاکترین ڕێگا بوو تاوەکو خەڵکی خێرخواز و سەر ڕاست بن. جوولەکەکان کە لە هەمان سەردەمدا تێکەڵ بە ڕۆمانییەکان بوون. هەمان سەرسامیان هەبوو بەو ڕۆحە پتەو و ئەو هاریکارییە. سەرنجیان دا کە هیچ کام لە ژنەڕاڵەکان (ئامادە نەبوون بانگەشەی مەزنی بۆ خۆیان بکەن لە ڕێگەی تاج لەسەرنان یان لەبەرکردنی جلی ئەرخەوانی و شاهانە) لەو ڕۆژگارە زووەدا، خۆشەویستی وڵات لە هەموو شتێکی دیکە زاڵتر بوو. بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگار و لەگەڵ سەرکەوتن و کۆکردنەوەی سامانی زۆردا، ڕۆمانییەکانیش گەندەڵ بوون، کە ئەوانیش کەوتنە ژێر ڕکێف و دەستەڵاتی چەند فۆرمێکی ستەمگەری لە فەرمانڕەوایی کە پێشتر بۆ خۆیان ڕقیان لەو سیستەمی ستەمگەرییە بوو. هەرچی جوانی و ڕەوشتبەرزی و ئـازادی هەیە پێکەوە داڕمان. ئەوە ئەدەبی ڕۆما بوو. بەتایبەتی کارەکانی "سیسێرۆ" کە دواتر ئەوروپاییەکانی قایل کرد کە جوانی و خێر و ڕەوشتبەرزی مەرجن بۆ ئازادی.


دانتی

گەرچی "پۆلیبوس" وەک مێژوونووسێکی ڕێک و ڕاست. بەڵام توندوتیژ لە گوزارشتەکانیدا، ناسراو بوو، کەچی نەیتوانی ئەو خەسڵەتە نایۆنانییە بناسێتەوە کە تا ڕادەیـەکـی زۆر کارەکتەری زەق و جیاوازی سیاسەتی ڕۆمانی لەسەر بەند بـوو: (auctoritas). ئەم خەسڵەتەش زەمینەی مۆراڵێکی خۆشکردبوو کە وا بکات ڕۆمانییەکان بە بڕوایەکی بەهێزەوە بڵێن کە خێر و خۆشی و پاراستنی وڵات مەرجە لـەسـەرووی هەموو بەرژەوەندییە تایبەتییەکان بێت. (بۆ نموونە وەک ڕزگارکردنی ڕۆحی تاکە کەسەکان) هەرگیز ناکەوێتە پێش نیشتمان. ئەم ڕەوشتە لە زۆر چیرۆکی ڕۆمانی سەبارەت بە ڕۆحی پاڵەوانبازی دەماودەم ڕۆیشتووە. لە پاڵ ئەو بایەخە گرنگ و زاڵەی ڕۆمانییەکان، بەهەرحاڵ، بە ڕۆما خۆی، ئەوان زۆر دڵگەرمانە ڕۆحی پێشبرکێیان لە خۆیاندا بەهێز دەکـرد و لە ڕاستیدا زۆرجـاران حەزیان بەشەڕ و ئـاژاوەش دەکـرد. دواتـر نووسەرەکان وای بۆ چوون کە ئەو ڕق و کینەی کەوتبووە

نێوان ئەرستۆکراتەکان و خەڵکە ڕەشۆکی و سادەکەی کە لە سەرەتای مێژووی (ڕۆمـا)دا درێـژەی کێشا خاڵێکی لاوازی ئەو حوکمڕانییە بوو، بەڵام (ماکیاڤیللی) لەگەڵ ئەم جۆرە بیر و بۆچوونە دژ وەستایەوە، ئەم توانی ئەو خەسڵەت و مۆرکە سێنتراڵە بدۆزێتەوە کە یەکێک بوو لەو مۆرکانەی کە جێگە نەخشی خۆی لەسەر هەموو ڕەوت و ترادسیۆنی سیاسەتی ڕۆژئاوا دانا. گفت و گۆی ماکیاڤیللی لەوەدا چڕ بۆوە کە ململانێ لە ناو خودی دەوڵەتدا ڕەوایە، چونکە ڕەچاوی بـەرژەوەنـدی گشتی و هەمە لایەنەی دەکـرد، ئەمەیان دەقاو دەق ڕەنگدانەوەی مەراق و خولیای ڕۆمانییەکان بوو بۆ گەڕان بە دوای سەربەستی و پاراستنی مافە مەدەنییەکان. کارکردەی سیاسەت لە (ڕۆما) هەروەک ڕەوتی سیاسی لای یۆنانییەکان لە حیکمەتێکی باڵای پێشووتر سازکراو سەرچاوەی نـەدەگـرت، بەڵکو سیاسەتەکەی دەرئەنجامی ناسینەوەی دانپێدانانێک بوو بەو پێشبڕکێ و ململانێیەی نێوان حەز و بەرژەوەندییەکانی ئەو خەڵکە، کە ئازادانە لەنێوان کۆمەڵگادا مشت و مڕی لەسەر دەکـرا. سیاسەتی خۆرئاوایی لە فۆرمەکانی دیکەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بەوە جیا دەکرایەوە کە گەڕانێک بوو بە دوای ئەو ڕۆح و ناوەڕۆکەدا، بە واتا لە دەرەوەی هەر هارمۆنییەک (ئیقاع و هاوسەنگییەک) لە هەر کەسێک دێتە بەرهەم کە تێدەگات شوێن و پایەی وا لە کوێدا، هەمیشە هارمۆنییەکی دیکە هەیە، کە دواجار ئەنجامی ململانێ و کێبەرکێیەکە لە ڕێگەی گفت و گۆیەکی سەربەستانە لە تەک ڕازیبونێکی ئازادانە ساغ دەبێتەوە، جا ئەو ئەنجامە هەرچیەک بێت کە لە جێبەجێکردنێکی پەیرەو بە "دەستوور" سەرچاوە دەگرێت.

**سەرچاوە:**
Kenneth Minogue
POLITICS
ery Short Introduction
OXFRD-1995

# سنورەکانی سەرپێچی پاساودار

نووسینی: فرانس نۆیمان
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

کاتێک دەستم بە نوسینی ئەم وتارە کرد، هەستمکرد وەڵامدانەوەی ئەم مەسەلەیە ئاسانە. وام ئەزانی بە ئاسانی ئەتوانرێت بگوترێت کە هاوڵاتی لە چ بارودۆخێکدا ئەتوانێت سەرپێچی لە ملکەچی بۆ یاسا دانـراوەکـان بکات. بـەڵام چەند زیاتر بیرمکردەوەوە و لەو بەرهەمانە قوڵبومەوە کە لەم بوارەدا نوسراون، ئەو یەقینەی پێشوم لاوازتر بوو. دیارە بە ئاسانی ئەم توانی فۆرمەلەیەک پێشکەش بکەم – ئەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ یاسای سروشتی یان مافە هەمیشەیەکان – بەڵام فۆرمۆل تەنها بە مەرجێک مانای هەیە کە لە هەلومەرجی واقعی و دیاریکراودا بەکار بهێنرێت، هەر فۆرمولێک بەشێوەیەکی ئەبستراکت و هەمەکی دەرببڕێت، هیچ مانایەکی نیە. لێرەوە بە داوای لێبوردنەوە ئـەو وەڵامـــەی ئـەمـەوێـت بـیـدەمـەوە،

**ئەزانین نە لۆسەر لایەنگری یاخیبون بوو بەسەر فەرمانڕەوایاندا و نە کالڤین، و هەردوکیان ستەمکارکوژیان رەد ئەکردەوە. دیدی لۆسەر سەبارەت بەم مەسەلەیە بەریژە دوولایەنە و ئاڵۆزە، بەڵام دیدی کالڤین وا نیە**


فرانس نۆیمان

ئارامبەخش نابێت. سەرنجم لەسەر بیرهێنانەوەی ئەو گرفتە شاراوانەی لەهەر وڵامێکی پۆزەتیف یان نێگەتیڤدا هەیە، چەندانجار زیاترە لە شکڵبەندی تیورەیەکی تایبەت بە خۆم.

دیـارە کێشەکە کێشەیەکی کۆن و دێرینە و لە دواجـاردا هەڵگری مافی کوشتنی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانە. لەو روەوە کە بەشیوەکەی گشتی بڕوامولیە مەسەلەکانی فەلسەفەی سیاسی کاتێک بە باشترین شێوە قابیلی تێگەیشتنن، کە مەسەلە کۆتایەکان بە رونی دەربڕێن. لە دوا دەرکەوتی مافی یاخیبونەوە - واتە ئەو مەسەلەیەی بە شا کوشتن یان ستەمکار کوشتن بەناوبانگە - دەست پێئەکەم.

## ١

١. مێژووی شا کوشتن بە هەڵەیەکی مێژووی دەست پێئەکات. لە چیرۆکە دێرینەکاندا کوشتنی هیپارخۆس (کوڕی پی سیستر ستۆس) بە دەستی هارمۆدیۆس و ئەریستۆ گیتون لە ٥١٤ پێش زایندا، بە یەکەم نمونەی هەنگاوی موئامەرەئاسای عاشقانی ئازادی بۆ لەناوبردنی یەکێک لە ستەمکاران ئەناسرێت و بەرز ئەنرخێنرێت. بەڵام ئەزانین کە پاڵنەری ئەم کوشتنە تەنها کینەی شەخسی بوو بەرامبەر بەم ستەمکارە (واتە هیپارخۆس)، نەک تێبینی سیاسی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کوشتنە بووە هۆی پەیدابونی یەکێک لە قوتابخانە فکریە بەهێزەکان کە تا سەدەی حەڤدەهەم (دەرکەوتنی حکومەتە نادینیە رەهاکان) بـەردەوام بوو و پاشتریش بە هۆی باڵاگرتنی کاری تۆتالیتاریسمەوە، گیانێکی تازەی بە بەردا کرایەوە. کاتێک کاردانەوەی رای گشتی بەرامبەر بە هەوڵی کوشتنی هیتلەر (لە ٢٠ ژوئێنی ١٩٤٤دا) شیئەکەینەوە، ئەوەی سەرنجمان رائەکێشێت ئەوەیە کە جیهانی رۆژئـاوا هەرگیز

گومانی لە مافی کوشتنی هیتلەر نەبوو، تەنها ڕەخنەی ئەوە بوو بۆچی ئەم هەوڵە بە ئەنجام نەگەیشت.
ئەگەر ئەوەی وتم ڕاست بێت، ئەو مەسەلەیەی دێتە پێشێ بەڕاستی چارەنوسسازە. ڕەنگە لەڕێگەی ئەم شیکردنەوەیەوە، مەسەلەی هەمەکی مافی خۆڕاگری کەمێک ڕونتر بێتەوە.
٢. پێدەچێت خەڵکی سەردەمی دێرین کێشەیەکیان لەم بوارەدا نەبینیبێت. ڕەنگە چاوەڕێی ئەوە لە ئەفلاتۆن بکرێت باسی مەسەلەی کوشتنی ستەمکار بکات. بەڵام ئەفلاتۆن باسی ئەم مەسەلەیە ناکات. یەکەم مەسەلەی کوشتنی ستەمکار، کوشتنی یەکێک لە ستەمکارەکان بوو بە دەستی دوان لە قوتابیەکانی. لە ٣٥٣ (ی پێش زایندا) «جیبون» و «لئۆنیداس»، «کلێ ئەرخۆسی» ستەمکاری هراکلیاپۆنتیایان (لە تورکیای ئێستادا) بە پاڵنەری نیشتیمان پەروەری کوشت. لەم خاڵەدا بە گشتی هەموان هـاوڕان کە بە بـڕوای ئەفلاتۆن خوێنی ستەمکار لەسەر خۆیەتی. ئەم خاڵە لە کتێبەکانی هەشتەم و نۆهەمی کۆماردا بە ڕونی دیارە و لەبارەی ئەرستۆشەوە ڕاستە. ئەرستۆ جیاوازی لە نێوان دوو جۆر ستەمکاردا ئەکات. یەکێکیان ستەمکار absque titulo (واتە داگیرکەر) و ستەمکار quod exercitio (واتە حوکمڕانی ڕەوا، بەڵام دواکەتوو لە یاسا). بەڵام لە بەرهەمەکانی ئەرستۆدا هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکی فەلسەفی نابینرێت سەبارەت بەوەی لەچ بارودۆخێکدا ئەشێت هەر یەک لەم دوو جۆرە ستەمکارە لەناو ببرێت.

٣. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناکرێت کوێرانە لاسایی شێوەی بیرکردنەوەی پێشینان لەبارەی ستەمکار کوژیەوە بکرێت، چونکە ئەم مەسەلەیە لای ئەوان


هیتلەر

پەیوەندی بە تیورەیەکی فەلسەفی ترەوە هەبوو کە بە پێی ئـەم تیورەیە مـرۆڤ وەک هاوڵاتی شار polis بونی هەبوو. ئەگەر بونی مرۆڤ بە شیوەیەکی سەرەکی بونێکی مەدەنی بێت، ئەوا کوشتنی ستەمکار پێویست ئەبێت، چونکە گیانی ستەمکار بەستراوە بە سودمەندی بۆ شار یان دەوڵەتشارەوە.

ئێمە ناتوانین ئەم فەلسەفەیە قەبوڵبکەین. بە بڕوای ئێمە بونی مرۆڤ سەربەخۆیە لەو ڕێکخستنە مەدەنی یان سیاسیەی کە تیایدا ئەژی.

لێرەوە ئەگۆستینۆسی قەدیس وەڵامێکی تری بۆ مەسەلەی ستەمکار کوژی هەیە و ئەڵێت خوداوەند هەم ئاوگوستیۆسی بە ڕۆمیەکان دا و هەم نیرۆن، هەم قوستەنتینی پێبەخشین و هەم بولیاتۆسی هەڵگەڕاوە. پاشان ستەمکارکوژی ڕەد ئەکاتەوە و بە دڵنیایەوە ئەڵێت هیچکەس بۆی نیە کەسێکی دی — تەنانەت گـەر تاوانبارێکی مەحکومیش بێت – سەرەڕۆیانە بکوژێت. تەنها دوو ئاوارتن ئەهێنێتەوە: ئەگەر یاساکان ڕێگە بدەن و ئەگەر خـوداش فەرمان بکات. بەڵام ئەگۆستینۆس بە تەواوی ئاگای لەو مەترسیانە هەیە کە لەناو ئەم ئاوارتنەدا شاراونەتەوە. بۆ ڕێگریش لە تەفسیر و ڕاڤەکردنی ئەم ئاوارتنانە تەنانەت ڕەخنە لە تەوراتیش ئەگرێت و بە گشتی ئەنجیل بە مەرجەع ئەژمێرێت و گومان ئەکات لەوەی ئایا موسا هەقی هەبووە کە مسریەکانی کوشتووە.

٤. بەڵام ئەم شیوازە بیرکردنەوە ئەگۆستینیە زۆری نەخایاند. لێرەدا دەرفەتی باسکردنی مێژووی دورودرێژی تیورە جیاوازەکانی شاکوژیم نیە. هەر ئەوەندە ئەڵێم کە «جۆن سالزبریایی» لە کتێبی «پۆلیکراتیکۆس»دا بە جەختکردنەوە شاکوژی قەبوڵ ئەکات، تۆماس ئەکویناسیش بە هەندێک مەرجەوە ملی بۆ ئەدات، لێرەوە زانینی ئەو خاڵە گرنگە کە ئەو کەسانەی لایەنگری شاکوژی بون، هەموویان شایەتی لە تـەورات و ڕۆژگـاری دێرین ئەهێننەوە و پشتیان کردۆتە شێوەی بیرکردنەوەی ئەگۆستینۆس. هەر ناکۆکی نێوان ئەم دوو قوتابخانە فکریە مەسیحیە بوو کە جیهانی مەسیحی لە سەرەتاکانی سەدەی پانزەهەمی میلادیەوە هێنایە لەرزین. ڕۆژی ٢٣ نۆڤامبەری ١٤٠٧ (میلادی) دوو کەس لە ئەرەستۆکراتەکان بە جوڵاندنی دۆک ژان دو بوگونی، دۆک لۆیی ئۆرلئانیان کوشت. کەسێک بەناوی ژان پتیەوە نامەیەکی لەژێر ناونیشانی «هەقانیەتی دۆک دۆ بۆرگونی» نوسی و تا دە ساڵ هەموانی هـەژان. پتی بە کورتی ئەیگوت هەموو کەسێک بۆی هەیە ستەمکاران بکوژێت، سوێندەکانیش (لەم دۆخانەدا) هیچ بایەخێکیان نیە، و لەبەرامبەر ستەمکاراندا سودوەرگرتن لە هەر هۆکارێکی نائەخلاقیش پاساوی خۆی هەیە. ئەنجومەنی کەنیسەی کاسۆلیک کە لە ١٤١٣وە تا ١٤١٤ لە پاریس دروست بووە، بە تایبەت باسی ئەم مەسەلەیەیان کرد. لەم ئەنجومەنەدا ژان دۆ ژرسن سەرۆکی زانکۆی پاریس هەوڵیدا شێوەی بیرکردنەوەی ئەگۆستینۆس بگەڕێنێتەوە و ئەگەرچی بە شێوەیەکی روکەشی سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام زوربەی متەکەلیمەکان ئامادەنەبون پەیڕەوی بکەن. ئەنجومەنی کۆنستانس پاساوەکانی ژان پتیان، لانیکەم بەشە گرنگ و هەستیارەکانی لە بارەی ستەمکاری کوژیەوە سەلماند. ئەوەی ئەبێت سەرنجی بدەین جیاوازی بنەڕەتیەکانی نێوان پاساوی ستەمکار کوژیە لە ڕۆژگاری دێرین و سەدەکانی ناوەڕاستدا. لە ڕۆژگاری دێریندا ڕەوایەتی ئەمکارە ئەگەڕایەوە بۆ سود و بەرژەوەندی دەوڵەتشار و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەگەڕایەوە بۆ یاسای

سروشتی و پەیوەندیە فیودالیەکانی موڵکدارە گەورەکان لەگەڵ باجوەرگرەکانیاندا. پاشتر ئەبینین کە ئایا هیچ یەک لەم پاساوانە بەسە یان نا.

٥. ئەڵبەتە لەسەردەمی رینسانسدا مرۆڤکوژی سیاسی بە بەربڵاوی باوی هەبوو، بەڵام هیچ تیورەیەکی لەبارەی ستەمکار کوژیەوە نەبوو. بیری تاکەکان زۆرتر لای رەهەندە دەروونناسی و کۆمەڵناسیەکانی ئەمکارە بوو - واتە مەسەلە تەکنیکیەکانی مرۆڤکوژی سیاسی - تاکو گونجان یان نەگونجانی لەگەڵ پێوەرە ئەخلاقیەکاندا. لەبەرئەوە تیورە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە ئەبێت بە «نهێنیەکانی» ئەم مەسەلەیە بزانین، چونکە لەو تیورانەدا بەتایبەتی ئامێرەکانی گەیشتن بە فلان ئامانجی سیاسی بە عاقڵانەترین شێوە پێشکەشکراوە.

٦. شەپۆلی تازەی گفتوگۆی تیوری لەبارەی مافی یاخیبون و مافی کوشتنی ستەمکاران، پاش بزوتنەوەی چاکسازی دینی (یان سەردەمی ریفۆرم) دەستی پێکرد. ئەزانین نە لۆسەر لایەنگری یاخیبون بوو بەسەر فەرمانڕەوایاندا و نە کالڤین، و هەردوکیان ستەمکارکوژیان رەد ئەکردەوە. دیدی لۆسەر سەبارەت بەم مەسەلەیە بەرێژە دوولایەنە و ئاڵۆزە، بەڵام دیدی کالڤین وا نیە. لە مێژووەکانی بیروڕای سیاسیدا، جەخت لەوە ئەکرێتەوە کە کالڤین یاخیبونی لە لایەن ئەو ئۆرگانە دەوڵەتیانەوە (وەک ئەنجومەنی گشتی چینەکان) بەرێگەپێدراو ئەزانی کە لە رووی یاساییەوە ئەرکیان سنورداركردنی دەسەڵاتی پاشایە، بەڵام ئەو قسەیەی فەرامۆش ئەکرا کە لە کۆتایی کتێبی «دەزگاکاندا» ئەڵێت: «خوداوەند بە دوو شێوە رێگە لە ستەمی ستەمکاران ئەگرێت: یان بە هاندانی تۆڵەکەرانی بێ پەروا لەناو هاوڵاتیانی خودی ستەمکاردا کە خەڵکی لە جەور و ستەمی رزگار ئەکەن، یان بە بەکارهێنانی توڕەیی مرۆڤێک کە تەکبیر و بیرکردنەوەکانی راستەوخۆ جیاوازە و لە ئەنجامدا لابردنی جۆرێک جەور و زۆرداری بە جۆرێکی تر». بەشی یەکەمی ئەم قسانە پێشبینی رزگارکەرانی نامەزهەبی وەک کراموێل ئەکات، بەڵام بەشی دوهەم رەنگە تەنها شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسی ئەم دیاردەیە بێت کە ستەمکاری، ستەمکاری بەرامبەر دروست ئەکات. لەبەر ئەوە ناکرێت ئەم قسانەی کالڤین بە پاساوی ستەمکارکوژی وەربگیرێت.

بەڵام بەدەر لە دیدی ئەم ریفۆرمخوازانە (واتە لۆسەر و کالڤین) پەیڕەوەکانیان چەندان دیدی جیاوازیان خستە روو: لە ملکەچی رەهاوە بۆ سەرچاوەکانی دەسەڵاتی دنیای و نا دینیەوە بگرە تا ملکەچی بێ کردار و ئینفیعالی، تا یاخیبون بەشیوەیەکی چالاک و شاکوژی. پرۆتستانتەکانی دژ بە شا- واتە کەسانی وەک جان پۆینت و کریستۆڤەر گۆدمان لە ئینگلتەرا و ژان دۆ پلترۆ و فرانسوا هۆتمان و ژۆئێۆس بروتوس لە فەڕەنسا - هیچ گومانێکیان لەبارەی مافی یاخیبونەوە بە خۆیان نە ئەدا. تیورەی لایەنگری مافی یاخیبون- لانیکەم بە پێی تەفسیری پەیڕەوەکانیان- لە بنەڕەتدا کالڤینیە.

٧. بەڵام گروپی کاسۆلیکیش بێکار نەبوو و دوو کەسیان - ژان بۆشەی فەڕەنسی و خوان دی ماریانای خەڵکی ئیسپانیا - تیورەیەکی تازەیان لەبارەی مافی یاخیبونەوە دروستکرد کە بانگەشەی ئەوە ئەکرا لەسەر بنەمای دیموکراسی دامەزراوە. بە پێی ئەم تیورەیە خوداوەند دەسەڵاتی سیاسی بە خەڵک ئەسپێرێت و لێرەوە مافی ئەوەیان هەیە لە رووی ستەم و زۆرداریدا، بەیەعەتی خۆیان لە حوکمڕان وەربگرنەوە و لای ببەن و تەنانەت بیکوژن.

## ٢

ڕێگەبدەن لێرەدا ئەم تاوتوێ مێژووییە کۆتایی پی بێنم، چونکە ئەگەر هیوادار بین تەنها لە ڕێی شیکردنەوەی مێژووییەوە ئەنجامگیری بکەین کە ئایا یاخیبون ڕێگەپێدراوە یان نا، و لە چ بارودۆخیکدا مومکینە، ئەوا ئەمکارە ساردمان ئەکاتەوە و نائومێدمان ئەکات.

ئەوەی مێژوو پیشانی ئەدات تەنها ئەوەیە کە سود لە هەموو تیورە سیاسیەکان بۆ گەیشتن بە مەبەستی سیاسی وەرگیراوە. هەرکاتێک یاخیبون لەگەڵ بەرژەوەندی گروپێکی تایبەتدا ئەگونجێت، بە پاساودراو لە قەڵەمدراوە و هەرکاتێکیش نەگونجاوە، ڕەدکراوەتەوە.

١. لە هەموو ئەو تیورانەی کە بە گشتی باسمکردن، ناکرێت وەڵامی پرسیارێکی سادە بدرێتەوە کە ئەویش ئەوەیە: چ کەسێک بڕیار ئەدات کە ئایا – و لە چ کاتێک– مافی یاخیبون هەیە.

لە ڕۆژگاری دێریندا: کەسێک ئەم بڕیارە ئەدات کە دیاری ئەکات سود و بەرژەوەندی polis (یان دەوڵەتشار) پێویستی بە چیە، لە تیورەکانی سەدەی ناوەڕستدا: ڕۆحانیەکان و یان دەسەلاتە دینیەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە بڕیار بە دەستی ئەوانە، لە خەباتی دژانی شادا: گروپی مەزهەبی بڕیار ئەدات، و لەو تیورانەشدا کە بە تیورەی دیموکراسی بەناوبانگە: خەڵک.

تیورەی دێرینەکان بە تیورەی کردار یان دامەزراو لەسەر وەزیفە ناو ئەنێین، بەو مانایەی یاخیبون پاساوی هەیە ئەگەر – و هەرکاتێک کە– حوکمڕان لە کردار (یان بەجێهێنانی ئەرکەکانی) کورت بێنێت.

تیورەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بە تیورەکانی بونیادنراو لەسەر یاسای سروشتی ناوئەبەین. بەو


سپینۆزا

مانایەی کە یاخیبون پاساوی هەیە گەر- و هەر کاتێک- حوکمڕان سنوورداریەکانی یاسای سروشتی فەرامۆش کرد و بە پێی فەرمانەکانی ئەم یاسایە حوکمی نەکرد.

تیورەکانی ئەمڕۆ بە تیورە دیموکراتیەکان ناو ئەبەین. بۆ دیاریکردنی بەها و بایەخی ئەم سێ شێوە تیوریە ئەبێ دەست بە شیکردنەوەیەکی فراوانتر بکەین.

٢. تەوەرەی سەرەکی لێرەدا شیکردنەوەی زاراوەی «ماف»ە کە رەنگە بە یەکێک لەم سێ مانایە بێت: یەکەم. هەڵبژاردنی هەنگاوێک بە پێی یاسا دانراوەوەکان، دوهەم هەڵبژاردنی هەنگاونان بەپێی یاسای بابەتی سروشت، و سێهەم ئەوەی کە هەڵبژاردنی هەنگاونان بە بەشێک لە خودیتی و خەسڵەتی مرۆیی بزانرێت (کە ئەشێت پێی بگوترێت مافی سروشتی یان خۆرسک).

٣. ئایا هیچ گرنگە کە «ماف» بە یەکێک لە زاراوەکانی یاسا دانراوەکان دابنێین؟ دوو ئەگەر هەیە. یاسا دانراوەکان ئەشێت بە راشکاوی یان بە ئاماژە بۆ کردن، یاخیبوون قەدەغە بکەن. لەم حاڵەتەدا کێشەی یاسا دانراوەکان بونی نابێت.

یا ئەشێت یاسا دانراوەکان بەڕاشکاوی یان بە ئاماژەبۆکردن، رێگە بە یاخیبون بدەن. لە «راگەیاندنی سەربەخۆی» ئەمەریکادا لەیەکەم بەشی بەندی دوهەمدا بە چەند مەرجێک «مافی خەڵک بۆ گۆڕان یان روخانی» هەر شێوەیەکی حکومەت «و دامەزراندنی حکومەتێکی تازە« راگەیەنراوە. بەڵام «راگەیاندنی سەربەخۆیی» یارمەتی چارەسەری کێشەکەی ئێمە نادات. تەنها «خەڵک» ئەتوانن لەرووی یاسایەوە شۆڕش بکەن، مافی یاخیبونی تاکەکەسی باسنەکراوە.

٤. رێگە بدەن بابەتێکی تازە بە نمونە بهێنینەوە. مادەی ١٤٧ی دەستوری هەرێمی هسن لە ئەڵمانیای رۆژئاوا ئەڵێت: «هەموو کەسێک مافی هەیە و بگرە ئەرکی ئەوەیە کە کاتێک سود لە تواناکانی دەوڵەت بە پێچەوانەی دەستورەوە وەرگیرا، سەرپێچی بکات» گومانی تیا نیە ئەم مادەیە پاش قسەکانی نوێنەرێکی کۆمنیست بە ناوی «باور»ەوە لەناو ئەنجومەندا، لە دەستوردا دانرا کە بەوپەڕی نیەت باشی بە جەختکردنەوە وتی هەر کەس مافی هەیە و بگرە ئەرکی سەرشانێتی بەرگری لە دەستور لەبەرامبەر هەر جوڵەیەکی نادیموکراتیدا بکات (یەکیتی سۆڤیەت دواتر باوریان لەناوبرد). بەڵام ئایا ئەم مادەیەش مانایەکی هەیە؟ نەخێر. ئەم وەڵامە نێگەتیڤە ئەبێت بە هەموو ئەو کەسانە بدرێتەوە کە چاوەڕێن یاسا دانراوەکان کێشەکەیان



هۆبز

بۆ چارەسەر بکات، تەنانەت گەر بڕیارەکانی ئەو یاسایانە لە دەستوری هسن زیاتریش بڕوات. گریمان لە دەستوردا پێشبینی کرا بێت کە ئەگەر دەوڵەت دەستدرێژی بۆ مافی لێنەسەندراوی ژیان و ئازادی کەسێک بکات، ئەوا لە روی یاسایەوە ئەرکی سەرشانێتی لەبەرامبەر دەوڵەتدا سەرپێچی بکات. ئەم پێشبینیە تەنها بە مەرجێک مانای هەیە کە یەکێک لە باڵاترین دەزگاکان (وەک دەزگای سەربەخۆیی داد) دەست نیشانی بکات کە ئایا دەوڵەت بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە دەستدرێژی بۆ مافەکانی من کردووە یان نا، یان لە نمونەی هسندا دیوانی پارێزگاری لە دەستور دواجار بڕیار بدات کە ئایا سود لە تواناکانی دەوڵەت بە پێچەوانەی دەستورەوە وەرگیراوە یان نا. رەنگە بڵێین کە هەر ئەوەندە بە تەواوی بەسە. لە کرداریشدا رەنگە لە زۆربەی دۆخەکاندا هەر وا بێت. بەڵام هەندێکجار بەس نیە. بێگومان کەسانێک کە دەزگای دادی کۆماری ڤایماریان ئەزانی و مافەکانی خۆیان بەم دەزگایە سپارد، نەیان ئەتوانی ئومێدیان بە پاراستنی ئەو مافانە هەبێت. دەزگای دادی ئەڵمانیا لەو کاتەدا، بازوی سیاسی بزوتنەوەیەکی دژ بە شۆڕش و دژ بە دیموکراسی بوو، نەک دەسەڵاتێکی دادی سەربەخۆ بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە مافە مەدەنیەکان. ئەستەمە بگوترێت کە ئایا ئەمڕۆ بارودۆخەکە سەرلەبەری گۆڕاوە. بەڵام تەنانەت لە سیستەمی دادی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا کە زۆر لە دەزگای دادی ئەڵمانیا پێشکەوتوترە، رەنگە بەر ئەو دادوەر و ئەنجومەنی دادوەرانە بکەوین کە رەنگدانەوەی هەستی کەسانی پڕوپوچن، لەبری ئەوەی رەنگدانەوەی هەڵسەنگاندنی بیرلێکراوەی کەسانێکی عاقل و بیرمەند بن.

کەوابو جێکردنەوەی مافی یاخیبون لە یاسا دانراوەکاندا تەنانەت لە کرداریشدا هەمیشە سودمەند نیە. ئاشکرایە کە ئەمکارە لەروی تیوریشەوە جێگەی رەزامەندی نیە، چونکە هەمیشە ئەوەی دەستنیشانکەرە، یەکێک لە دەزگاکانی دەوڵەتە، نەک تاکە کەس.

٥. ئایا تیورەکانی پەیوەندیدار بە یاسای سروشتی لە روی تیوریەوە بناغەیەکی پێویست بۆ ئەم مەبەستە دروست ئەکەن؟ بە دەربڕینێکی تر ئایا ئەکرێت زاراوەی «ماف» بە جۆرێک تەفسیر بکرێت کە یا بە مانای دەسەڵاتێک بێت کە دەرئەنجامی سیستەمی بابەتی یاسای سروشتیە، یان بکرێت بە بەشێک لە خودێتی سروشتی مرۆڤ بژمێرێت؟ ئەگەر مەبەست لە یاسای سروشتی سیستەمی فکری قوتابخانەی تۆماس ئەکویناس بێت، وەڵامەکەی ئاسانە، بەڵێ، بەڵام تەنها بەو مەرجەی کە هاوکات لەگەڵ یاسای سروشتیدا، ئەوەش قەبوڵبکەین کە کەنیسەی کاسۆلیک ئەبێت دیاری بکات کە چ کاتێک دەسەڵاتە نادینیەکان ئەو فەرمانانە پێشێل ئەکەن کە لە یاسای سروشتیەوە دێن. ئەگەر وا نەکەین. واتە ئەگەر فەرمانەکان بە بێ رەهەندی دەزگایی قەبوڵ بکەین، توشی کێشەیەک ئەبین کە کانت لە فەلسەفەی سیاسی خۆیدا بەرەوڕوی بۆوە. کانت ئەڵێت: «ئازادی بریتیە لە سەربەخۆبون لە ئیرادەی ناچارکەری ئەوی دی، و تا ئەو کاتەی بتوانێت بەپێی یاسای گشتی، هاوکات لەگەڵ ئازادی هەمواندا هەبێت، تاکە مافی بنەڕەتی و ئەزەلی هەموو کەسێکە لەبەرئەوەی مرۆڤە«. بەڵام دیاریکردنی ئەوەی ئایا ئازادی من ئەتوانێت هاوکات لەگەڵ ئازادی ئەوانی تردا بونی هەبێت، تەنها بەدەست دەوڵەتی فەرمانڕەوایە، بۆچی؟ چونکە مافی یاخیبون ناکۆکە بە چەمکی دەوڵەت. بە وتەی کانت: هەر کەسێک بیەوێت دەسەڵاتی



هیگڵ

باڵای دەوڵەت سنوورداربکات، پێویستە دەسەڵاتێکی زۆرتر یان یەکسان بە دەسەڵاتی سنووردارکراوی هەبێت، و ئەگەر دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت فەرمانی یاخیبون بە هاوڵاتیان بدات، ئەبێت هەروا توانای پاراستن و پارێزگاری لێکردنیانی هەبێت، و ئەگەر لە هەر حاڵەتێکیشدا ئەوە دیارییبکات کە دروست چیە، ئەتوانێت فەرمانی یاخیبون بە هەموان بدات. بەڵام لەم حاڵەتەدا دەسەڵاتی باڵا بە دەست ئەوەوە ئەبێت نەک بە دەست سەرچاوە واقعیەکانی شتەکان. ئەمەش خۆی ناکۆکیە«، ئەم ئەرگۆمێنتە لە رووی لۆژیکیەوە هیچ جێگەی رەخنە نیە، بەڵام ئاشکراکەری گرفتێکە کە زانستی تازەی سیاسەت لە روی تیوریەوە گیرۆدەی بووە.

٦. کێشەی فەلسەفەی سیاسی- و کێشەی بە روکەش چارەسەر نەکراوی- ئاشتکردنەوەی ئازادیە لەگەڵ ناچارکردندا. هاوکات لەگەڵ دروستبونی ئابوری پارەدا، دەوڵەت لە سەردەمی تازەدا لە بەرگی ئەو دەزگایانەدا دەرئەکەوێت کە بانگەشەی

ئەوە ئەکات کە بۆ ئەوەی بازرگانی لەسەر بنەمایەکی دڵنیا بگەشێتەوە و هاوڵاتیان لە بەرهەمی کار و هەوڵەکانیان بخۆن، ئـەوا ئەبێت دەسەڵاتی ناچارکردن بە تۆپزی لەدەستی ئەودا بێت. هاولاتی بە دروستکردنی ئەم دەزگایە و داننان بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایکردنیدا، لەهەمانکاتدا ئامێرێکیان دروستکردووە کە ئەیتوانی لە ئەنجامی شیرینی هەوڵەکانی و لە پشتیوانی پێویست مەحرومی بکات و زۆرجاریش ئەیکرد. لێرەوە لەهەمانکاتدا کە هەوڵیئەدا پاساو بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بهێنێتەوە، بە نیازبوو پاساو بۆ سنورداربونی دەسەلاتی دەوڵەت بۆ ناچارکردنیش بهێنێتەوە. مێژووی بیرکردنەوەی سیاسی تـازە، مێژووی هەوڵدانە بە مەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ ماف و زۆرکـردن یان یاسا و دەسـەڵات. هیچ تیورەیەک لە زانستی سیاسەتدا نیە کە ئەم دوو کارە بە یەکەوە نەکات. تەنانەت توندڕەوترین تیورەکانی لایەنگری دەوڵەتی رەها (وەک تیورەکانی هۆبز و سپینۆزا) کە سەرەتا بە روکەش مافە فەردیەکان لە دەرگا ئەکاتە دەرەوە، دیسان ئەو مافانە لە پەنجەرەوە ئەکاتە ژورەوە: هۆبز لەو رێگەیەوە کە حاکم ئەکات بە نوێنەر یان کارگوزاری بازرگانی کۆمەڵگا و ئەگەر لەکارەکەیدا سەرکەوتوو بوو، هەموو دەسەڵات و هەڵبژاردنەکانی پێ بسپێرێت و ئەگەر لە سەقامگیری رێکخستنی ئاسایشدا شکستی خـوارد، هەموو دەسەڵاتەکانی لێ بسەنێتەوە، سپینۆزاش بەوجۆرەی کە بەو پێوەرەی دروستی کردووە و مافی یەکسانکردووە بە زۆرکردن، رێگە بە هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی خاوەن دەسەڵاتی پێویست ئەدات کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی خۆی بە ماف بگۆڕێت و alterius iuris (واتە نەبونی ئەهلیەت بۆ خاوەنداریێتی ماف) بگۆڕێت بۆ sui iuris (واتە بونی ئەهلیەت بۆ خاوەنداریێتی ماف).

تەنانەت لۆک کە لایەنگری ماف و یاسایە، خۆی بە ناچار ئەزانێت کە «دەسەڵاتێکی تایبەت بۆ شا دابنێت و رێگەی پێبدات هەرکاتێک ماف و یاسای بونی دەوڵەت بخاتە مەترسیەوە – و هەندیکجار بە پێچەوانەی یاساوە – دەستبەکار بێت. ئەگەر بمانەوێت بابەتەکە لە چوارچێوەی پێوەرێکدا کورت بکەینەوە، ئەبێت بەمشێوەیە بڵێین کە: ئازادی نەک تەنها ئازادیە لەبەرامبەر دەوڵەتدا، بەڵکو ئازادیە بەهۆی حکومەتەوە. ئەم دوو رەهەندە لەهەندێک بارودۆخی مێژوویدا رەنگە پێکەوە هاوئاهەنگ و گونجاو بن و لە هەندێک دۆخی تریشدا نا. رەنگە بۆ هەندێک لە گروپەکان لە کۆمەڵگادا هاوئاهەنگی و گونجانێکی وا دروست ببێ و بۆ گروپەکانی تر نا.

٧. ئایا ئەتوانین رێـگـەچـارەی کانت بۆ چارەسەری ئەم ناکۆکیە قەبوڵبکەین؟ رێگەچارەی ناوبراو تەنها فۆرمەلەکردنی سەرلەنوێی بیرکردنەوەی رۆسـۆیـە کـە ئـیـرادەی گشتی بـە گـەورەتـریـن هاوئاهەنگیکەری بەرژەوەندیە گشتیەکانی نەتەوە و بەرژەوەندیەکانی هاوڵاتیان ئەژمار ئەکرد. بەڵام تیورەی لایەنگری دیموکراسی هیچ چارەیەک بۆ کێشەی مافی یاخیبون نەدۆزیوەتەوە. تیورەی پێکهاتەیی (واتە تیورەیەک سەبارەت بە بنەما و سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی) هیچ رەوایەتیەک لەم رێگەیەوە بۆ کارەکانی دەسەڵات دەستەبەر ناکات. لە دیموکراسیشدا ئەشێت زۆرینە دەستدرێژی بۆ سەر مافی کەسانی تر بکات. هەرگیز هەڵە نابێت بە ڕاست، لەبەرئەوەی زۆرینە ئەیەوێت و بگرە رەنگە لەم رێگەیەوە ببێت بە هەڵەیەکی گەورەتر. هەندێک ئەرگۆمێنت ئەهێننەوە کە مافی یاخیبون لەگەڵ رژێمە نادیموکراتیەکاندا ئەگونجێت و لە رژێمە دیموکراتیەکاندا ئەکرێت چاوپۆشی لێبکرێت،

چونکە لەمجۆرە رژێمانەدا هەل و دەرفەتی پێویست بۆ دەربڕینی بیروڕای کەمایەتی دەستەبەر ئەکرێت. لایەنگرانی ئەم بۆچونە بەمشێوەیە دیموکراسی بە بەشێک لە مافی یاخیبون وێنا ئەکەن  کە شکڵی دەزگای وەرگرتووە. بەڵام ئەم ئەرگۆمێنتە بێ بایەخە و بە ئەنجامی دروستمان ناگەیەنێت. جگە لەمە گرفتێکی پراکتیکیشی هەیە. ئەوەی کە دیموکراسی بەڕاستی پارێزگار و بەرگریکاری دیدی کەمایەتی بێت، پەیوەستە بە دیاریکردن و هەڵسەنگاندنەوە. لەبارەی هەر بەشێکی دیموکراسیەوە رەنگە روبەڕوی تیورەی جیاواز ببینەوە. لێرەوە لەلای کەسانێک کە بە هەق یان ناهەق بانگەشەی ئەوە بکەن کە رژێم بە پێی پێویست مافەکانیان دابین ناکات، مافی یاخیبونی تاکەکەسی هەروا ئەمێنێتەوە. بەو هۆیانەی کە پێشتر باسکرا، ناکرێت وەڵامی ئەمجۆرە کەسانە بە پشتبەستن بە سەربەخۆی داد بدرێتەوە. لێرەوە دیموکراسی بێگومان رودانی گرفتی مافی یاخیبونی تاکەکەسی کەم ئەکاتەوە، بەڵام لەناوی نابات.

٨. کەوابوو بە ناچار ئەگەڕێینەوە بۆ تیورەی مافی خۆڕسک یان سروشتی (واتە یاسای سروشتی). لێرەدا ئەبی جیاوازیەکی گرنگ بکەین کە ئەویش جیاوازیە لەنێوان بناغەی تیوری مافە سروشتیەکان و دەرکەوت و دیاردە هەستپێیکراوەکانی.

دەرکەوتە دیار و دەرەکیەکانی یاسای سروشتی (واتە سیستەمێکی مافی سروشتی کە هەڵگری فەرمان و قەدەغەکردنی دیاریکراوە) لە روی تیوریەوە قابیلی بەرگریکردن نیە. ئەو گرفتانەی هیوم و هیگڵ هێنایانە پێشێ، بێ وەڵامە. هەموو ئەمجۆرە رژێمانە لە رووی فەلسەفیەوە دڵخوازانەن. چەند سیفەتێک لە دۆخی سروشتیدا ئەخەنە پاڵ مرۆڤ و پاشان سیستەمێکی دیاریکراو کە پێکهاتووە لە هەندێک ماف و ئەرکی سروشتی یان خۆڕسک لـەوەی بە مەیلی خۆیان لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە وتویانە، هەڵئەهێنجێنن. نەک هەر هیوم و هیگڵ بەڵکو زۆرێکی تر لەوانە ژۆرژ سۆرێلیش ئەو خاڵەیان بە بیر هێناوەتەوە کە ئەکرێت بە دژی ئەو بۆچونەی کە وتران قایل بین. بە وتەی هیگڵ «بنەمای رێنمایکەر بۆ a pirori (واتە شتی پێش ئەزمون)، a posterior (واتە شتی دوای ئەزموون)ە«. رۆسۆش بەهەمان شێوە ناڕازیبونی خۆی لە پەیڕەوانی تیورەی یاسای سروشتی دەربڕیوە و ئەڵێت:

«ئەو (واتە ئەو کەسەی پەیڕەوی تیورەی یاسای سروشتیە) سەرەتا بـەدوای رێسایەکدا ئەگەڕێت کە رێکەوتن لەسەریان بە سود و قازانجی خودی مرۆڤەکانە، و پاشان بێ هیچ هۆیەک جگە لە مەزیەتێکی گریمانەی کە بڕیارە لەم رێگەیەوە بەدەست بێت، ناوی «یاسای سروشتی» بە رێسا ناوبراوەکان ئەدات. هەموو فەیلەسوفانی پەیڕەوی ئەم قوتابخانەیە، پەیرەوی ئەم شیوازەیان کردووە. دەرئەنجامی ئەمە ئەوەیە سەرجەم ئەو پێناسانەی ئەم زانایانە لەگەڵ ئەوەشدا کە ناکۆکن بەیەکتر، تەنها بەو ئەنجامە ئەگات کە بێ ئەوەی کەسێک لە حەکیمە میتافیزیکیەکان گەورە بێت، مەحاڵە لە یاسای سروشتی بگات و بە پەیڕەوکردنی کامەران بێت. ئەمەش دەربرینێکی تری ئەو مانایەیە کە مرۆڤەکان ئەبێت بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگا، خاوەن زیرەکی و حیکمەتێک بن کە تەنها هێواش هێواش کەمایەتیەکی بچوکی تاکەکان ئەتوانن بەدەستی بێنن، ئەویش بە زەحمەت و لەناو خودی کۆمەڵگادا»
بە بڕوای من مومکین نیە لەگەڵ ئەم رەخنانەدا هاوڕا نابین کە لەبارەی رواقیەکان و تۆماسی وقەدیس و هۆبز و پۆفندرۆف و لۆک و کانت و زۆرێکی ترەوە بەهەمانشێوە راستە.

## ٣

بەڵام ئەم رەخنانە تەنها بەو مەرجە راستە کە رووی لە یەکێک لەو سیستەمە دیاریکراوانەی ماف و ئەرک بێت کە لە یاسای سروشتیەوە هەڵێنجێنراوە. ئەگەر ئەم رەخنانە رووی لە بناغەی فەلسەفی ئەم یاسایە بێت، چیدی راست نیە. بناغەی هەر تیورەیەکی لایەنگری مافی سروشتی، بونی بونەوەرێکی عاقلە بەناوی مرۆڤەوە کە بونی سەربەخۆیە لەو کۆمەڵگا مەدەنی یان سیاسیەی تیایدا ئەژی. تەنها لایەنگرانی قوتابخانەی ئەفلاتۆن یان هەمەکیخوازان (universalism) رەنگە ئەم راستیە بنەڕەتیە رەد بکەنەوە. کاتێک باسی مرۆڤ ئەکەین، باسی بونەوەرێک ئەکەین کە خاوەنی بەهرەی عەقڵە (بە جیا لە بونەوەرە زیندوەکانی تر). بەڵام ئەگەر راستی ئەم مەسەلەیە قەبوڵبکەین، ئەبێت لانیکەمی ئەو شتانەش قەبوڵبکەین کە دەرەنجامی ئەم قەبوڵکردنەیە. ئەم لانیکەمە (کە گرنگ نیە لەزگەی مافی سروشتی لێبدەین یان نا) لەبەرانبەر هەر سیستەمێکی سیاسیدا، بەدەر لە ناوەڕۆکەکەی، تەنانەت لە بەرامبەر سیستەمە دیموکراتیەکاندا راستی و بایەخی خۆی ئەبێت.

تەنها تاکەکانی مرۆڤ - نەک کەسی یاسایی و دەوڵەتەکان و لەم بابەتە - رەنگە خاوەنی ئەم لانیکەمە بن.

چوار مەسەلەمان بەم رونکردنەوانە هەیە:

یەکەم) ناوەڕۆکی واقعی و دیاریکراوی ئەم لانیکەمە، سەرەتا تیورەی یەکسانی یاسایی هەموو تاکەکانی مرۆڤە. وەک چۆن مرۆڤ عاقڵە، ئەوا هەموو مرۆڤەکان عاقڵن. ناکرێت هیچ مرۆڤێک کۆیلە بکرێت. نەک هەر ئەو کەسەی ئەکرێتە ئامانج، بەڵکو هەموو کەسێک خاوەنی مافی یاخیبونە لە یاسایەک کە ئامانجی کۆیلەکردنی بەشێک لە تاکەکانی مرۆڤە. بابەتی ئەم مافە، مرۆڤایەتیە کە هەر تاکێکی مرۆڤ، دەرکەوت و نوێنەرێتی.

دوهەم) هەر یاسایەک کە کاریگەری لەسەر گیان و ئازادی خەڵک هەبێت، ئەبێت خەسڵەتێکی گشتی هەبێت. یاسای تایبەت یاسایەکە کە کەسانێک بەناو و بێ ئەوەی پێویستی بە دادگایکردن لە دادگای داد هەبێت بە تاوانبار ئەژمار ئەکات، و بنەمای یەکسانی پێشێل ئەکات. یاخیبون لەمجۆرە یاسایانە، رەوایە.

سێهەم) هەر یاسایەک بگەڕێتەوە بۆ دواوە، بە مانای یاساڕێژیە لەپاش تاوانە کە مرۆڤ لە ژیان و ئازادی مەحروم ئەکات و پێشێلکەری بنەمای گشتیبونی یاسایە، لەبەرئەوە رەوایەتی نیە و یاخیبون لێی رەوایە.

چوارەم) جێبەجێکردنی یاسا کاریگەرەکان لە گیان و ئازادی خەڵکدا، ئەبێت بە دەزگایەکی جیاواز لە دەزگا دەوڵەتیە بڕیاردەرەکان بسپێرێت. تیورەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان تا ئەم ئاستە (تەنهاش تا ئەم ئاستە) لە مەسەلەی دوهەم (واتە ئەو مەسەلەیەی کە ئەو یاسایانەی کاریگەریان لەسەر گیان و ئازادی خەڵک هەیە، ئەبێت خەسڵەتی گشتیان هەبێت) بە پێویست ئەزانرێت.

بە بڕوای من ئەو لانیکەمەی ناوەڕۆکی سیاسی کە لە عاقڵبونی مرۆڤەوە بەدەست دێت، لەم چوار مەسەلەیەدا - نەک زۆرتر- کورت ئەبێتەوە. پێشێلکردنی هەر یەکێک لەم چوار مەسەلەیە، پراکتیکی دەسەلاتی سیاسی ناڕەوا ئەکات و لێرەوە بە هەر کەسێک (جا چ پێی خۆی لە ئارادا بێت یان نەبێت) مافی یاخیبون ئەدات. بەڵام ئەوەی ئایا ئەم مافە قەبوڵبکرێت و بخرێتە پراکتیکەوە، مەسەلەیەکی ترە.

ئەوەی وتمان رەنگە زۆر کەم مایە دەرکەوێت و کەس رازی نەکات. بەڵام تەنها بە مەرجێک وا دەرئەکەوێت کە ئەوە فەرامۆش بکەین رەوایە مرۆڤ سەرپێچی لە هەر فەرمانێکی حکومەتی خۆی بکات، ئەگەر ویژدانی ناچار بەمەی بکات. تەنانەت هیگڵیش دانی بەم مەسەلەیەدا ناوە. بە بڕوای هیگڵ «بانگی دەرونـی» مرۆڤ رەنگە ناکۆک بێت لەگەڵ یاسا دانراوەکاندا. بەڵام ئەبێت تێبینی ئەوە بکەین کە مەسەلە، مەسەلەی «ماف» نیە. ناتوانرێت حوکمێکی گشتی دەربکرێت کە پێمان بڵێت چ کاتێک رەوایە کە ویژدانی کەسێک فەرمانی پێبکات کە ملکەچی یاساکانی دەوڵـەت نەبێت. ئەبێت هەر کەس بە تەنیایی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەست و پەنجە نەرم بکات. ئەگەر بەو ئەنجامە بگات کە ئەبێت سەرپێچی بکات، ناتوانێت پشت بە هیچ «هەقێک» ببەستێت، هەرچەندە رەزامـەنـدی و ئـارەزوی سەرکەوتن لە ئێمەوە بەدەست دێنێت. جگە لەو چوار مەسەلەیە لەبارەی مافی بێ قەید و شەرتی سەرپێچیەوە، هەر کەس ئەبێت بە شەخسی بڕیار بدات. لۆک و هیگڵ هاوڕان کە ئەگەر دەوڵەت بەهێز بێت، سەبارەت بەو کەسانەی کە بە حوکمی ویژدان ناچارن سەرپێچی لە فەرمانەکانی حکومەت بکەن، نەرمی ئەنوێنێت. ئەگەر نەرمیشی نەنواند، دیسان کەسی یاخی لەبری ئەوەی گوێڕایەڵ بێت و بە هێمنی بمێنیتەوە، یاخی ئەبێتەوە و خۆی ئەخاتە مەرسیەوە.

هیچ تیورەیەک ناتوانێت لەبەردەم دووڕیانی ویژدان و رێکخستنی کۆمەڵایەتیدا، رێگەیەک بخاتە بەردەممان، ئەگەر وای پیشان بدات کە ئەتوانێت، هیچ کارێک ناکات جگە لە دوبارە کردنەوەی فورمۆلە هەمەکی و بەتاڵەکان کە بڕیارە تەنیا ئەو راستیە بشارنەوە کە ئەمکارە مەحاڵە.

بەم ئاوازە گومانکاریانە، کۆتای بەم وتارە دێنم.

**وەرگێڕانی فەسڵێکە لەم کتێبەی خوارەوە:**

فرانس نۆیمان: ازادی و قدرت و قانون. ترجمه: عزت الله فولادوند. شرکت سهامی
چاپ اول /تهران ۱۳۷۳.

# کۆمیدیای ئەنتیك گاڵتەئامێز نەبووە

نووسینی: هانز ڕۆڵاند جۆنسۆن
لە سویدییەوە : دانا ڕەووف

ئەریستۆ لە یەکێک لە نووسینەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە مرۆڤ (تاکە بوونەوەرێکی زیندووە پێ دەکەنێت) ئەم وتەیەی ئەریستۆ بۆ جۆرە هاوبەشییەک لە گاڵتەوگەپ و نوکتە و قسەی ڕەخنەئامێزی کۆمیدی ڕاماندەکێشێت، کە بە درێژایی مێژوو لە هەموو کولتورەکاندا هەبووە و هەیە. بۆ نموونە ئێستا ئێمە بەهەمان شت پێ دەکەنین، کە خەڵکی لە سەردەمی گرێکەکان، ساڵانی سەدەی ١٧٠٠-ەکان، یان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا پێی پێکەنیون.

(ماری بێرد) پسپۆرێکی ئینگللیزییە لە بوارەکانی لێکۆڵینەوەی سەردەمی گرێک و ئەنتیک، دووپاتی ئەوەی کردۆتەوە کە گرێکیەکان لە ساڵەکانی ٣٠٠ ی بەر لە زایینادا، ئەنتۆلۆژیایەکی گاڵتەوگەپیان بڵاوکردۆتەوە زیاتر لە ٢٦٠ نوکتە و ڕەخنەی کۆمیدیئامێز و قسەی نەستەقی

**خاڵێکی تری لاوازی لێکۆڵینەوەکەی نیکلاس هۆڵتسباری ئەوەیە کە کۆمیدیای گریکی، بەتایبەتی لە ئەسینا بە تراژیدیا بەراورد دەکات، بێگومان ئەم بەراوردکارییە لە هەندێك لایەنەوە شتێکی ڕاستە، بەڵام تەنها لە هەندێك لایەنەوە**



ماری بێرد

لەخۆگرتووە، ئەم نوکتە و گاڵتەوگەپانە هەر هەموویان بۆ ڕۆژگـاری ئەمڕۆمان دەگونجێن و هەندێک لە هونەرمەندە (ستانداپ) کۆمیدییەکانی ئەمڕۆ لە نەمایشەکانیاندا بەکاری دەهێنن.
ئەگەر خودی ئەم ئەنتۆلۆژیایە لەلای زۆربەمان نەناسراو بێت، ئەوە شانۆنامە کۆمیدیا پڕ لە ڕەخنە و گاڵتەوگەپەکانی ئەرستۆفانیس لای زۆربەمان ناسراون.<١> ئەرستۆفانیس لە کۆتایی ساڵەکانی ٤٠٠ و سەرەتاکانی ٣٠٠ی بەر لە زاییندا، شانۆنامەکانی نووسیوە، لە کۆی بەرهەمەکانی تەنها یانزەیان بە تەواوەتی بەدەستمان گەیشتوون.<٢> شانۆنامە کۆمیدیاکان، بە شێوەیەکی گشتی هەمان سترکتوری شانۆنامە تراژیدییەکانیان هەیە، مەبەست لە هەمان سترکتور ئەوەیە کە شانۆنامەکە یـان نمایشەکە، بەهاوبەشی کـۆرس؛ سەرەتا ئەکتەرەکان لە دیالۆگەکایناندا لەگەڵ یەکتری و دواتریش کۆرس گۆرانی دەڵێن و سەما دەکەن.
ئـەوەی کۆمیدیاش لە تراژیدی جیادەکاتەوە، ئـەوەیـە کە نـاوەڕۆکـی شانۆنامە تراژیدیاکان چیرۆکەکانیان لـە میتۆلۆژیا دێرینەکانەوە وەرگرتووە و بابەتەکانیان گوزارشت لە کەسایەتی پاڵەوان، پادشا و خواوەندەکان... هتد دەکەن و زیاتر بەرجەستەی جیهانی گرێکییەکان لە دەرەوەی سنورەکانی ئەسیناوە دەکـەن، بەڵام کۆمیدیا باسی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاسایی، لە خۆشی، ناخۆشی و گیروگرفتەکانیان، بە تایبەتی لەو ڕۆژگـارەی ئەسینادا، کردووە. لەبەر ئەوەی کۆمیدیا باسی خەڵکی ئاسایی و گیروگرفتی ژیانی ڕۆژانە و هەندێک جار ڕووداوی ڕاستەقینەی خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی کردووە، بۆیە دەبێتە دۆکیومێنتێکی چڕ و دەوڵەمەند و گرینگ بۆ تێگەیشتن و زانینی چۆنیەتی گـوزەران و ژیانی خەڵکی و جۆری بیرکردنەوەیان، لـەو ڕۆژگـارەی گرێکییەکان بەگشتی و شاری ئەسینا بەتایبەتی. هاوتەریب لەگەڵ بەشێک لە دیالۆگەکانی ئەفلاتوندا، ئەو پرسیارە خۆی قوت دەکاتەوە، کە ئێمە لە نێو

تێکستەکانی ئەنتیک – دا، دەتوانین بەم شێوەیە لە ژیانی گریکییەکان نزیک ببینەوە. لەبەر ئەوەی کۆمیدیاکانی ئەرستۆفانیس، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەو ڕۆژگارەن و پابەندن بە کەسایەتی و ڕووداوەکانەوە، لەوانەیە بۆ بینەرێکی ئەمڕۆ شانۆنامە کۆمیدیاییەکان، بە بەراورد لەگەڵ شانۆنامە تراژیدیاییەکان، کە باسی کەسانێک دەکەن کە لەو ڕۆژگارەدا ژیاون، یان ڕووداوێک کە زۆر تایبەتمەند بووە بەو ڕۆژگارە، گران بێت، چ بۆ خوێندنەوە و چ بۆ بینین.
هەموو ئەو شانۆنامانەی ئەرستۆفانیس کە بەدەستمان گەیشتوون، جگە لە دوو شانۆنامە کە لە کۆتایی تەمەنیدا نووسیوونی؛ لەکاتی شەڕی سی ساڵەی نێوان ئەسینا و سپارتا، ئەو شەڕە خوێناوییەی لە ساڵی ٤٠٤ی بەر لە زاییندا بەکەوتنی ئەسینا کۆتایی هاتووە، نووسیوونی. هەر لەبەر ئەوەشە، ئەرستۆفانیس لە زۆربەی شانۆنامەکانیدا، باسی شەڕ و ئاشتی دەکات و خەونی ئاشتی و کۆتایی هاتنی شەڕ بابەتێکی سەرەکی و لەبەرچاوی شانۆنامەکانییەتی. بۆ نموونە لە شانۆنامەی Acharnerna کە یەکێکە لە دێرینترین کۆمیدیاکانی شارستانیەتی ئەورووپا بە تەواوەتی بە دەست ئێمە گەیشتبێت، لەم کۆمیدیایەدا جووتیارێکی گوندنشین بەناوی (دیکیە ئێوپۆلیس) دەتوانێت خۆی بەتەنها لەگەڵ سپارتەدا پەیمانێکی ئاشتی مۆربکات. لە شانۆنامەی (ئاشتی) یشدا، کارەکتەری سەرەکی ئەم کۆمیدیایە دەچێتە سەر (ئۆلیمپن) تا خواوەندی ئاشتی، کە لەو شوێنەدا بەندکراوە ڕزگار بکات. <٣> بەڵام دیارترین شانۆنامەکانی ئەرستۆفانیس، لەم بوارەدا شانۆنامەی (لیسیستراتا) Lysistrate یە، لەم دەقەدا ئەرستۆفانیس سێکس و جووتبوون لە نێوان ژن و پیاودا، دەکاتە چەکێکی گرینگی وەستانی شەڕ؛ ژنان مانگرتنێکی تەواوەتی ڕادەگەیەنن و پیاوەکانیش ناچار دەکەن، لە ڕێگای ئەوەوەی کە تا شەڕ بە تەواوەتی نەوەستێت و ئاشتی بڵاونەبێتەوە، بە هیچ شێوەیەک نەچنە لای مێرد و پیاوەکانیان و جووت نەبن لەگەڵیاندا.
لەناو بەرهەمەکانیشیدا تەنها شانۆنامەی (بۆقەکان) ە کە باسی شەڕ ناکات، ئەم شانۆنامەیە ساڵێک بەر لە چەک دانانن و کەوتنی تەواوەتی ئەسینا نووسراوە. <٤> (بۆقەکان) بەراوردکارییەکی ورد، شایستە و بە بەهای نێوان ئێسخیلوس و یۆربیدس–ە ، تراژیدیاکانیان دەخاتە ژێر تیشکی ڕەخنە و شاکارەکانیان بەراورد دەکات. هەرچەندە شانۆنامەکە بە زمانێکی ساکار و ڕاستەوخۆ نووسراوە و چەندین دیمەنی کۆمیدی و گاڵتەوگەپ لەخۆدەگرێت، دونیایەکی فەنتازی ئامێزیش دەخولقێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سەختە ئەم شانۆنامەیە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا نەمایش بکرێت، هۆکاری سەرەکی و گرینگی نمایشنەکردنی (بۆقەکان) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شانۆنامەکە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە زانیاری و قووڵبوونەوەیەکی تەواوەتی دەبەستێت سەبارەت بە بەرهەمە تراژیدیەکانی ئەم دوو نووسەرە و ستایلی کارەکانیان، ئەمە جگە لە ڕەوتی ژیانیان کە تووخمێکی سەرەکییە. <٥> لەوانەیە ئەم هۆکارانەش لەگەڵ ئاستی هۆشیاری و زانیارییەکانی بینەری ئەمڕۆ نەگونجێت و هەموو کەسێک ئەو تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە قووڵەیان سەبارەت بەو سەردەمە دێرینە و نووسەرەکانیان نەبێت. بەڵام لە هەندێک نمایشی (بۆقەکان) دا بە تایبەتی ئەو نمایشانەی کە لەم سەردەمە و لە لەندەن پێشکەش کراون، ئامادەکردنێکی

وردییان لە شانۆنامەکەدا کردووە و هەوڵیان داوە لەم ڕۆژگارەی نێزیک بخەنەوە؛ بۆ نموونە ئێسخیلۆس و یوربیدس-یان گۆڕیوە و لەبری ئەوان بەراوردکارییەکە لە نێوان شەکسپیر و بەرناردشۆدا بووە، بەم چەشنەش لە بینەری ئەمڕۆی ئینگلیزیی و ڕۆحی ئەم چەرخە نزیک بوونەتەوە.

لە شانۆنامەی (باڵندەکان)دا کە زیاتر لە هەموو بەرهەمێکی تری ئەرستۆفانیس بە نەفەسێکی شیعری بەرز و زمانێکی قووڵی پڕ لە وێنە نووسراوە، دوو کەسایەتی دانیشتووی شاری ئەسینا، داوا لە باڵندەکان دەکەن کە لەگەڵ ئەوان مەملەکەتێکی تایبەتمەند بە خۆیان لە ناو هەورەکان دروست بکەن، هەروەها شانۆنامەی (پلوتۆس) کە یەکێکە لە دوا بەرهەمەکانی، جۆرێکە لە ئامۆژگاری و بەرجەستەکردنی موراڵ و ڕێگا پێشاندان، بۆ نموونە ئەرستۆفانیس لەم شانۆنامەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و ئەو پرسیارە دەوروژێنێت، ئەگەر دەوڵەمەدەکان کوێر نەبوونایە و چاو و ویژدانیان کراوە بوایە، ئەوا دیاری و پاداشتەکانیان دەبەخشییە ئەو کەسانەی کە پێویستیانە و شایەنی ئەوەن.

لەم چەند ساڵەی دوایدا چەندین کتێبی دانسقە لەسەر ئەرستۆفانیس و شانۆنامەکانی، بۆ نموونە، ڕۆڵی کۆمیدیایەکی سیاسی لە کۆمەڵگا و سیاسەتی ئەو ڕۆژگارە و پێگەی ئەرستۆفانیس بڵاوکراونەتەوە، لە ناو ئەو کتێبانەدا کتێبی (ئەرستۆفانیس: سێکس، گاڵتەجاڕی و سیاسەت) لە نووسینی نیکلاس هۆڵتسباری، پرۆفیسۆری فەلسەفەی کلاسیکیی لە زانکۆی میونیش جێگای ئاماژە و لەسەر وەستانە.<٦> ئەوەی جێگای سەرنجە، لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەی بنەما کۆمیدییەکانی ئەرستۆفانیس دەروازەیەکە بۆ فەلسەفەی گرێکی و لە هەمانکاتدا تیشک خستنە سەر ئەو دید و ڕەخنە ساتەوەختە و هەنووکەییانەیە کە شیکردنەوەیان گرانە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە و ڕۆچوونە خوارەوەیەکی قووڵ هەیە. ئەم نووسەرە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە بنەما کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی شانۆنامەکانی ئەرستۆفانیس، لە کۆنتێکستەکانی خۆی و زەمەن و دەوروبەرەکەیدا ڕوون دەکرێنەوە، هەر لەبەر ئەوەشە کۆمیدیاکانی ئەرستۆفانیس لە دەروازەکانی نزیک بوونەوە بەو سەردەمەوە، وامان لێ دەکەن ئاسانتر تێیان بگەین و لە هەمانکاتدا سەیرکردن و خوێندنەوەشیان، وەک کۆمیدیا خۆشتر و پڕ لە خەندەتر دەبێت.

لەم کتێبەی نیکلاس هۆڵتسباریدا، شیکردنەوەکە بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوات کە ئەرستۆفانیس بە پلەی یەکەم مەبەستی ئەوە بووە بینەران بهێنێتە پێکەنین. ئەم بۆچوونەش چەندین کێشە و گرفت دەخولقێنێت، بۆ نموونە پەیام و ڕۆڵی کۆمیدیا هاوشان دەبێت لەگەڵ جۆرە (فاش) ێک کە هیچ جۆرە گرفتێک، ڕەخنە و پەیامێک لەخۆناگرێت و تەنها پێکەنین و تەهریج دید و بنەماکانی ئەم جۆرە کۆمیدیا (فاش)ە پێک دەهێنێت. فاش بنەما سەرەکییەکانی کۆمیدیا، خستنەڕووی گرفتە کۆمەڵایەتی، سیاسی، خودییەکان و پەردە هەڵماڵینی بارودۆخە نالەبار و دژوارو چەوتەکان، بەشێوەیەکی کۆمیدی لەخۆناگرێت، بەڵکو زیاتر لە دنیایەکی گاڵتەئامێزی پێکەنیناوی، بەبێ هیچ پەیامێک دەسوڕێتەوە. هەرچەندە ئەرستۆفانیس (فاش) یشی نووسیوە و چەند دانەیەکیشی بە دەست ئێمە گەیشتوون و پارێزراون، لە وانە: a la Georges Feydeau بەڵام ئەرستۆفانیس توانیوویەتی لەم (فاش) ە دا لەسەر چەندین ئاست ڕەخنە و گاڵتەی کۆمیدی لە ڕووی سیاسەت،

ئیرۆتیک و دیمەنی پڕ لە جۆش و خرۆشەوە ئاوێزانی بەرهەمەکەی بکات، هەروەها بە زمانێکی لیریکی و لە هەمانکاتدا توندوتیژەوە، دیمەن بە دیمەن شانۆنامەکەی داڕشتووە و وێنەیەکی قووڵ و لە هەمانکاتدا ساکار و پڕ لە چێژی (فاش)مان پێشکەش دەکات.

نیکلاس هۆڵتسباری لە لێکۆلینەوەکەیدا جەخت لەسەر ئەو ناو و کەسایەتیانەی لەو سەردەمەدا ژیاون دەکاتەوە، کە ئەرستۆفانیس لە کۆمیدیاکانیدا بەکاری هێناون و دەیانکات بە نوکتە و ڕەخنەی توندی گاڵتە ئامێزیان لێدەگرێت، زۆرجار وا ڕێکەوتووە کە ئەو کەسانەی بەو شێوەیە هێرشیان کراوەتە سەر، لەناو بینەراندا دانیشتون و سەیری شانۆنامەکەیان کـردووە. بێگومان تیرە ژەهراوییەکانی ئەرستۆفانیس هەمیشە گیراوەتە سیاسەتمەدار، سەرکردە سەربازییەکان، شانۆنامەنووسەکان، کاربەدەستانی باڵای وڵات و کەسە دیار و ناسراوەکانی ئەو ساتەی ئەسینا، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە ستایلی ژیان و گوزەران و کەسایەتییەکانیان جیاواز بوون و هەوڵیان داوە لە خەڵکی ئاسایی جیاوازتر بژین.

نیکلاس هۆڵتسباری بۆ لێکۆڵینەوەکەی پەنا دەباتە بەر لێکۆڵینەوەکانی نووسەرێکی تر بە ناوی (ماڵکۆم هیس) و باسە ناوازەکەی (کۆمیدیای سیاسی لەلای ئەرستۆفانیس)

Political comedy in Aristophanes

ئـەم نـووسـەرەش پێ لەسەر ئـەوە دادەگـرێـت کە ئامانجی کۆمیدیای گرێکی تەنها ئەوە بووە خەڵکی بخاتە پێکەنین. ئەرستۆفانیس لە ڕەخنەکانیدا چەندە توندوتیژ بووبێت، چەندە مەسەلەی دەسەڵاتی خستبێتە ژێر پرسیارەوە و پەردەی لەڕووی سیاسەتمەدارەکان هەڵماڵیبێت، دواجار ئامانجەکانی هەر ئەوە بووە بینەران بخاتە پێکەنین. پیاوی دەوڵەت و سەرکردەیەکی سەربازی بەناوی (کلیۆن)ەوە، بەشێوەیەکی بێ بەزەیی کەوتۆتە بەر شـاڵاوی شانۆنامەکانی سەرەتا و دەستپێکی بەرهەمەکانی ئەرستۆفانیس، تەنانەت دوای مردنیشی وازی لێناهێنێت، ئەم (کلیۆن)ە لە ساڵی ٤٢٢ی بەر لە زایندا، لە یەکێک لە بەرەکانی جەنگدا کـوژراوە. ئەرستۆفانیس بەشێوەیەکی بەردەوام گاڵتە بەم کەسایەتییە (کلیۆن) دەکات و ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ڕەخنە و تەنانەت جنێوەکانیشییەوە.

یەکێک لە خاڵە لاوازەکانی تێز و بۆچوونەکانی نیکلاس هۆڵتسباری و کتێبەکەی (ئەرستۆفانیس: سێکس، گاڵتەجاڕی و سیاسەت) ئەوەیە کە ئەو هۆکارانە ڕوون ناکاتەوە بۆچی ئەرستۆفانیس هەندێک لە سیاسەتمەدارەکان ڕیسوا دەکات و هێرشی توندیان دەکاتە سەر، بەڵام بە هیچ شێوەیەک لە هەندێکی تریان نزیک نابێتەوە و ناویان ناهێنێت. هەرچەندە هەندێک لە جنێو و گاڵتەکان بێکینەیە و هیچ ڕقێکیان تێدا نییە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ڕەخنەکانیش یەک لایەنەیە و بە شێوەیەکی تەواوەتی حسابیان بۆ کـراوە، شتێکی سەیرە گەر لە پشت ئەم هێرش و ڕەخنەو جنێوانەوە، مەبەستێکی سیاسی نەبووبێت. ئەرستۆفانیس هەمیشە پەیامی سیاسی خۆی هەبووە، لە یەکێک لە کۆمیدیاکانیشیدا ڕەخنەیەکی توند لە جەماوەری ئەسینا دەگرێت، لەبەر ئەوەی دەنگیان داوە بە کلیۆن، هەرچەندە ئەو، واتە ئەرستۆفانیس لە شانۆنامەی (ئەسپ سوارەکان) دا پەردەی لەسەر هەموو کەم و کوڕی و هەڵەکانی کلیۆن هەڵماڵیوە. ئەرستۆفانیس لەم شانۆنامەیەدا، وێنەیەکی ساکار و خراپی کلیۆن-ی وەکـوو (پێستە خۆشکەر)

کێشاوە (کلیۆن ئەم پیشەیەی لە بنەماڵەکەیانەوە بۆ ماوەتەوە و لەم ڕووەشەوە بازرگانی پێستەی کردووە) ئەمە جگە لەوەی وێنەیەکی کاریکاتێری، لە چەشنی سەرکردەیەکی بێ کەڵک و مەترسیداری ئەسینا دروست کردووە. نیکلاس هۆڵتسباری هیچ بەهایەک بۆ ئەم پەیامە سیاسییەی ئەرستۆفانیس دانانێت و دەڵێت: کلیۆن وەک هەموو ئەو سیاسەتمەدارانەی بەر لێشاوی ڕەخنە کەوتوون، ئەو ڕەخنە و گاڵتەوگەپانەیان بە سنگێگی فراوانەوە وەرگرتووە و لەگەڵیا پێکەنیوون. بەڵام کلیۆن بەو ڕەخنانە بێزار بووە و ئاماژەی ئەوەی کردووە کە ئەرستۆفانیس هەموو سنورەکانی بەزاندووە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە دواتر ئەرستۆفانیس ڕادەکێشێتە بەردەمی دادگا، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی ئەرستۆفانیس و لەیەکێک لە شانۆنامەکانی سەرەتای ڕەوتی نووسیندا، بەناوی (بابلییەکان) ەوە، هێرشێکی توندی کردۆتە سەر.<٧>

لەم باسەدا جێگای سەرنجە بزانین ئەرستۆفانیس لە شانۆنامەی (هەور) دا چۆن باسی سوکرات دەکات. ئەرستۆفانیس لەم شانۆنامەیەدا وێنەی سوکراتێکی فەیلەسوف و قوتابیەکانی، وەکوو کۆمەڵە کەسێکی سەیر و مەخسەرە و گێل بەرجەستە دەکات: سوکرات دەبێتە ئەو پیاوە زانستە سوفوستائییەی کە زۆربڵێیە و قسە زۆر دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت و خۆیی و قوتابیەکانی لە کۆمەڵە دیمەنێکی کۆمیدی شپرزە ئاسا و سەرلێشێواودا دروست دەکات. سوکرات لە وتاری بەرگرییەکەی خۆیدا، کە لەساڵی ٣٩٩ ی بەر لە زاییندا، لە بەردەم دادگادا (ئەو دادگایەی کە دواتر بە بڕیاری مەرگی سوکرات کۆتایی هاتووە) هەر وەکوو ئەفلاتون دواتر بڵاویکردۆتەوە، وتوویەتی: سوکرات دوو جۆر دادوەری گشتی هەبووە، یەکێکیان ئەوانە بوون ئەویان ڕاکێشاوەتە بەر دەم دادگا، ئەوانەشی کە هەر لە دەمێ ساڵەوە ئەویان تاوانبارکردووە. سوکرات لێرەدا مەبەستی لە شانۆنامەی (هەور) بووە کە لەوێدا وەکوو فیگورێک خولقێنراوە قسەی بێ مانا دەکات، تەنانەت خۆشی نە دەزانێت چی دەڵێت و نە ئاگاداری ئەو شتانەشە کە باسیان دەکات. ئاشکرایە سوکرات و ئەفلاتون هەستیان بەو تۆنە زبر و ڕەخنە ئامێزەی هێرشی نووسەرە کۆمیدیاکان کردووە، هەروەها ئەو کەسانەشی دواتر سەیری ئەم مەسەلانەیان کردووە و لێی وردبوونەتەوە، درکیان بەهەمان شت کردووە، هەر بۆ نموونە تەنها چەند ساڵێک لەمەوبەر و لە گۆڤاری Magazine Litteraire ئەم مەسەلەیە لە وتارێکدا بە ناوی (سوکرات بە دەستی ئەرستۆفانیس مردووە؟) وروژێنراوە.

خاڵێکی تری لاوازی لێکۆڵینەوەکەی نیکلاس هۆڵتسباری ئەوەیە کە کۆمیدیای گریکی، بەتایبەتی لە ئەسینا بە تراژیدیا بەراورد دەکات، بێگومان ئەم بەراوردکارییە لە هەندێک لایەنەوە شتێکی ڕاستە، بەڵام تەنها لە هەندێک لایەنەوە. پێناسەکردن و دەست نیشانکردنی کۆمیدیا وەکوو (خوشکی بچوکی) تراژیدیا، کەمکردنەوەی بەهاکانی کۆمیدیایە، چونکە جیاوازییەکان لەڕووی چۆنییەتییەوە (چۆنایەتیانە) نییە، بەڵکو مەسەلەکە زیاتر لە ڕووی ستایل و شێوازەوەیە. هەڵبەتە لێک جیاکردنەوە و جیاوازییەکی توندی بەم شێوەیە، بینەرانی شانۆی ئەسینای ئەوکاتەی تووشی ناڕەزایی و سەرسووڕمان کردووە.

لەکاتی فیستیڤاڵەکانی دیۆنیسیۆس دا، کە لە نێوان مانگی سێ و چواری هەموو ساڵێکدا کراوە، لە پێنج شانۆنامەی کۆمیدی کەمتر نمایش نەکراوە، هەروەها سێ ساتیریش (زیاتر نمایشی

گەمە و گاڵتەوگەپ بوون و لە میتۆلۆژیاکانەوە سەرچاوەیان وەرگرتووە) ئەمە شان بە شانی ئەو نۆ شانۆنامە تراژیدیانەی تر کە لە ماوەی سێ چوار ڕۆژی فیستیڤاڵەکەدا نمایشکراون.<٨> لە زۆر ڕووەوە کۆمیدیا شتێکە کە تراژیدیا ئەوە نییە، لەبەر ئەوەی تراژیدی لەلایەکەوە لە داستان و میتۆلۆژیاکانەوە وەرگیراون و بنەمایەکی پڕ لە ڕاز و نهێنی لە خۆدەگرێت و دیدێکی مێتا-فیزیکییان هەیە، لە لایەکی تریشەوە کێشە و دەستەویەخەی مرۆڤی پاڵەوان ئاسا، لەگەڵ چارەنووسی خۆیدا دەخاتەڕوو، بەڵام کۆمیدیا بە تەواوەتی پابەندە بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئەسیناوە. تراژیدیا کۆمیدیایە و کۆمیدیاش تراژیدیایە و بە پێچەوانەشەوە، ئەم دوو شێوازە دراماتیکییە، واتە تراژیدی و کۆمیدی تەواوکەری یەکترین و پێکەوە بەرجەستەی هەموو ژیانی واقیعی و ڕاستەقینەی ئەسینان، لەسەر ئاستێکی بەرز و نزم، لە لایەنی ڕۆحی و میتۆلۆژیا و دەنگۆی بێ بناغە، تا دەگاتە سەر مەسەلە ڕاستەقینەکان و ئەو شتانەشی کە بینەران تامەزرۆین، دەکەن.

هیچ شتێک نییە کە خەڵکی ئەسینا خۆیانیان تیا نەدۆزیبێتەوە، هەروەها هیچ شتێک لەو شانۆنامانەدا نەبوون کە لە فیستیڤاڵەکانی دیۆنیسیوس دا نمایشکراون، لە دەرەوەی واقیع و ئەزموون و ژیان و بۆچوونەکانی بینەران و خەڵکی ئەسیناوە بووبێت. شانۆی گریکی، بەتایبەتی لە ئەسینا، لە ساڵەکانی ٤٠٠ ی بەر لە زاییندا، تراژیدی، کۆمیدی یان گەمەی ساتیر پێکەوە، وێنەیەکی گشتگر و تەواوەتی گەردوون و کۆمەڵگای گریکی بووە.<٩> ئێمە ئێستا لەم زەمەنەدا، بەشێوەیەک لە شێوەکان دەتوانین دووپاتی ئەو وتەیەی فیکتۆر هیگۆ بکەینەوە کە دەڵێت (هەمان هێزی هەناسەدان کە لە هەناوی تراژیدیاکانی ئێسخیلۆس دایە، لە هەناوی کۆمیدیاکانی ئەرستۆفانیس-یشدایە)

ئەریستۆ لە کتێبی هونەری شیعرەکەیدا (پۆیەتیکا) مەبەستی ئەوە بووە (لەوانەیە ئەم کتێبە لە کۆتاییەکانی ساڵی ٣٠٠ ی بەر لە زاییندا نووسرا بێت) تراژیدیا باسی ئەو کەسانە دەکات کە لە ئێمە باشترن، بەڵام لەوانەیە بەو ڕادەیە باش نەبن، چونکە بەهۆی کارێکی هەڵەوە تێک دەشکێن و بەتەواوەتی خراپ دەبن.<١٠> بینەران لەو هاودەردیی و هەست و سۆز و ترسانەی کە لە بینینی نەمایشە تراژیدیاکانەوە، لەناوەوەیاندا سەرهەڵئەدات و دەوروژێت، پاکژدەبنەوە (کاتاریس) <١١> "کۆمیدیاکانیش خستنەڕوو و پێشاندانی ئەو مرۆڤانەیە کە خراپن، بەڵام نەک ئەوانەی کە هەر زۆر بێکەڵکن /.../ ئەو گاڵتەئامێزییە شتێکە کە بە هەڵە دەکەوێتەوە- ئەوە دزێوییە بەبێ ئازار و بە بێ وێرانکاریی."

نووسینەکانی ئەریستۆ لەم بارەیەوە بە تەواوەتی نەگەیشتوون بە دەستمان، بەڵام لە دووتوێی هەندێک تێکست و نووسینی تری ئەریستۆوە، دەگەینە دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە کۆمیدیاش. هەر لەم دەروازەیەوە، لەوانەیە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەریستۆ مەبەستی بووە بڵێت: کۆمیدیا چێژ و پێکەنین دەبەخشێت بە بینەرەکانی، لەم ڕێگایەشەوە دەمانگەیەنێتە کاتاریس، واتە پاکژبوونەوە، بە ڕەچاوکردنی گەڕانەوە بۆ هەست و سۆزەکانمان. بەلایەکی تردا ئەریستۆ ئەوەمان فێر دەکات کە تراژیدی و کۆمیدی، هەردووکیان هەست و سۆزێکی قووڵ و گەورە لە دەروونماندا، لە بێئاگایماندا بە ئاگادەهێنێتەوە و ئەو هەستە توندوتیژەی، کە لە ناوەوەماندایە و ئێمە نامانەوێت بەردەوام بە شێوەیەکی جێگیر

بوونی هەبێت، لە ڕێگای کارە هونەرییەکانەوە ڕزگارمان دەبێت لێیان. شیکارییەکانی ئەریستۆ بۆ کۆمیدیا هەمان شیکاری و لێکۆڵینەوەکانییەتی بۆ تراژیدیا و بەهەمان ئاراستە کاری کردووە، هەرچەندە ئەریستۆ ئەو دوو شێوازەی هونەر بە تەواوکەری یەکتری دادەنێت و هەر لەبەر ئەوەشە وەکوو دوو دیوی یەک چالاکی، چالاکییە گشتگرەکانی دراماتیک ناوزەدیان دەکات.
لەگەڵ ئەوەشدا کە لێکۆڵینەوەکەی نیکلاس هۆڵتسباری لە زۆر ڕووەوە بە شێوەیەکی باش نووسراوە، بەڵام کۆمیدیای گرێکی تەنها وەکوو ئامرازی چێژ وەرگرتنێکی ساکار، لە پەراوێزی کۆمەڵگادا دادەنێت، بەم شێوەیە تێزەکانی خۆیمان سەبارەت بە کۆمیدیای ئەرستۆفانیس، لە دید و بۆچوونێکی کۆنەوە پێ دەفرۆشێتەوە. ئەم بۆچوونە ساکارەش وێنەیەکی گشتگر و ڕاست نابەخشێتە ئەو سەراپاگیری و مەودا قووڵەی کە لەو هونەرە بەرزە کۆمیدی و گاڵتەوگەپەی ئەرستۆفانیس- دا هەیە. لە کۆتایدا تەنها شتێک کە لەم بارەیەوە ئاماژەی بۆ بکەم، ئەوەیە کە زۆر زەحمەت و دژوارە لەم خوێندنەوەیە بگەیت و بزانیت نووسەر مەبەستی چییە و بۆچی؟ هەر وەکوو ئەفلاتون نووسیوویەتی "ژنە خواوەندە هەوەسبازەکان کاتێک بە دوای پەناگەیەکی نەمردا گەڕان، ڕۆحی ئەریستۆفانیس- یان دۆزیەوە."

***سەرچاوە:***

SvD, Understrecket. Den antika komedin var ingen fars av Hans-Roland Johnsson, 2012

## پەراوێزەکانی وەرگێر

١- ئەرستۆفانیس لە ساڵی ٤٤٥ پ.ز لە دایکبووە و لە ساڵی ٣٨٥ پ.ز یشدا کۆچی دوایی کردووە. ئەم نووسەرە بۆ یەکمجار لە ساڵی ٤٢٧ پ.ز دا یەکێک لە شانۆنامەکانی نمایشکراوە. کۆنترین شانۆنامەشی کە دەست ئێمە کەوتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ٤٢٥ پ.ز، ئەم شانۆنامەیەش یەکێک لە کارەکتەرەکانی ناوی (یوربیدس) ە، وەک ئاماژەیەک بۆ نووسەری تراژیدیای گرێکی یوربیدس.

٢- ئەو شانۆنامانەی ئەرستۆفانیس کە بە دەست ئێمە گەیشتوون و پارێزراون بریتین لە: خەڵکی ئەفارینا، ئەسپ سوارەکان، هەور، زەردەواڵە، جەژنی تسمۆفۆریا، بۆقەکان، پەرلەمانی ستات، پلوتۆس، لیسیستراتا.

٣- ئۆلیمپن: ماڵی خواوەندی گرێکەکان کە بەسەر ترۆپکی چیای ئۆلیمپۆس-ەوە بووە، لە هەمانکاتدا مانای جیهانی خواوەندەکانی گرێکییە کۆنەکانیش دەگەیەنێت.

٤- شانۆنامەی (بۆقەکان) یەکێکە لەو شانۆنامانەی کە ئەرستۆفانیس توانا و سەلیقەی یوربیدس دەخاتە تەرازووی ڕەخنە و بەراوردکاری و تەنانەت دانپیانانیشەوە. ئەم شانۆنامەیە نیشانەیەکی گەورەی ڕەخنەی ئەدەبی و شانۆیی گرێکلاندە کە دوای مردنی هەر سێ شاعیری گرێکی: ئێسخیلوس، سۆفۆکلیس و یوربیدس نووسراوە. ئەرستۆفانیس شانۆنامەی "بۆقەکان" ی لە کاتێکدا نووسیوە کە گۆڕەپانی پێشبڕکێکان بەهۆی مردنی شاعیرە مەزنەکانەوە بۆشاییەکی گەورەیان دروستکردووە، ئەرستۆفانیس هەستی بەو بۆشاییە کردووە و لە دەروازەی شانۆنامەکەیەوە ڕۆڵی ئەو شاعیرانەی بەرز نرخاندووە. شانۆنامەی

بۆقەکان هەڵسەنگاندنێکی شانۆیی و وردی توانای شانۆنامەنووسیی هەر سێ شاعیرە مەزنەکەی تراژیدیای گریکە. ئەرستۆفانیس لەم شانۆنامەیەدا زیاتر بەراورد لە نێوان ئێسخیلوس و یوربیدس-دا دەکات، بەڵام یوربیدس و سۆفۆکلیس-یش بەشێکی ئەو بەراوردکارییەن. ئەرستۆفانیس بۆ یەکمجار لەم شانۆنامەیەیدا ددان بە توانای یوربیدس و ڕۆڵی شانۆنامەکانی و هێزی تراژیدیاکانیدا دەنێت، لە دەرئەنجام و کۆتایی شانۆنامەکەیدا بەم شێوەیە پلەی شاعیرەکان دەستنیشان دەکات: ئێسخیلوس پلەی یەکەم، سۆفۆکلیس دووەم و یوربیدس پلەی سێیەم.

٥- شانۆنامەی بۆقەکان لە ساڵی ٤٠٥ پ.ز دا پێشکەشکراوە و پاداشتی یەکەمی بەدەست هێناوە، دواتر بەهۆی سەرکەوتنی نمایشەکەوە بۆ چەندین جار لە ئەسینا پێشکەشکراوەتەوە.

٦- ئەم کتێبە ٢٤٠ لاپەرەیە و لە ساڵی ٢٠١٠ دا لە دەزگای C H Beck بەئەڵمانی بڵاوکراوەتەوە.

٧- ئەم شانۆنامەیە فەوتاوە و نەگەیشتووە بە دەستمان.

٨- (بیترستراتۆس) یەکەم فەرمانڕەوا بووە کە بڕیاری دامەزراندن و سازدانی فیستیڤاڵ و پێشبڕکێ هونەرییەکانی نێوان شاعیرە تراژیدیکانی داوە، بۆ ئەم مەبەستە هەموو ساڵێک لە ئەسینا ڕۆژەکانی جەژنی دیۆنیسیۆس، خواوەندی شانۆ و بەروبووم تەرخانکراوە بۆ ئەو دیاردە گرینگە، دوای دەرکردنی ئەم بڕیارە و پەسەندکردنی لەلایەن ئەنجوومەنی شاری ئەسیناوە، یەکەم شانۆگەری لە ساڵی ٥٣٤ پ. ز دا نمایشکراوە. ئەم ریتواڵ و فیستیڤاڵە شانۆییە لە وەرزی بەهاردا سازکراوە و دە ڕۆژی خایاندووە، شانۆنامەکانیش لە سێ ڕۆژی کۆتایدا پێشکەشکراون. لە سەرەتادا تەنها تراژیدیاکان بەشدارییان کردووە، بەڵام لە ساڵی ٤٨٦ پ. ز ەوە ڕێگا بە شانۆنامەنووسە کۆمیدییەکانیش دراوە بەشداری بکەن. بەهۆی بەشداری شاعیرە کۆمیدیاکانەوە، هەندێک ڕێسا و بنەمای تر بۆ تێکڕای نووسەرەکان دادەنرێت تا پەیڕەوی بکەن. بۆ نموونە شانۆنامەنووسە کۆمیدییەکان بوارێکی زیاتریان هەبووە بۆ گوزارشتکردن و جۆری دەربڕینەکانیان، بەڵام شانۆنامەنووسە تراژیدییەکان ئەو بوارەیان نەبووە. کۆرسی ناو شانۆنامە کۆمیدییەکان توانیویانە و بۆیان هەبووە ڕاستەوخۆ ڕووبکەنە بینەران، ڕەوتی شانۆنامەکە ڕابگرن و ڕای تایبەتی خۆیان سەبارەت بە مەسەلەیەکی هەنوکەیی، لە ڕووی ڕامیاری، ئابوری، هونەری، ڕۆشنبیری ... هتد دەرببڕن و دواتر بگەڕێنەوە ناو ڕووداوەکانی شانۆنامەکە.

٩- ئەریستۆ لە کتێبەکەیدا هونەری شیعر (پۆیەتیکا) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە شانۆگەری بە هەردوو جۆرەکەیەوە؛ تراژیدیا و کۆمیدی، لە هونەری شیعرەوە سەریهەڵداوە.

١٠- بە پێی هەندێک سەرچاوە بەشی دووەمی کتێبی هونەری شیعر دەربارەی کۆمیدیا بووە، بەڵام ئەو کتێبە فەوتاوە و نەگەیشتۆتە دەستمان.

١١- کاتاریس، پاکژبوونەوە یان قوتاربوون، وشەیەکی یان چەمکێکی گرانە و چەندین شیکردنەوەی بۆ کراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەموو پسپۆر و لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوە ڕێکن کە مەبەست لە پاکژبوونەوەی دەروونە لە ترس و بەزەیی، ئەمەش بە هۆی پێشاندانی بەرهەمە تراژیدیاکانەوە. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش پێویستە تراژیدیا خورپە یان ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو، گۆڕانکاری و جۆرە کارەساتێک لە خۆبگرێت.

# ئەخلاقی فەردی و کۆمەڵایەتی*

نووسینی: برتراند راسل
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

لەو وتارەدا ئەمەوێت دوو کار بکەم: سەرەتا ئەمەوێ ئەو دەرئەنجامانەی لە وتارەکانی پێشودا بەدەستهاتووە، بە کورتی دووبارە بکەمەوە، دووهەمیش ئەمەوێت تێزە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بە ئەخلاقی فەردیەوە ببەستمەوە کە هەر کەسێک ئەبێت بە ڕێنمایەکانی ئەو بڕواتە پێشێ. لەگەڵ هەموو ئەو خراپیانەی کە دیاریمانکرد و ئەو مەترسیانەی دانمان بە بونیدا نا، لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدگەلێک بەم بە ئایندەی زۆر دووری مرۆڤ نا، کە دەرئەنجامی لیکۆڵینەوەکانی ئێمەیە و من بڕوام وایە بەپێی هەڵسەنگاندنی بەهێزی ئەگەرەکان پاساویان هەیە.

سەرەتا پیاچونەوەیەکی خێرا بەسەر سەردێری بابەتەکانی پێشودا: بەشیوەیەکی گشتی دوو مەبەستی سەرەکیمان بۆ چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دەستنیشان کرد:

**لە سەرتاسەری مێژوودا تا ئەو جێگەیەی بەڵگە لەبەردەستدایە، بڕوا ئەخلاقیەکان دوو سەرچاوەی یەکجار جیاوازیان هەبووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوی تریان پەیوەستە بە باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکانەوە. لە کتێبی پیرۆزی دێریندا (تەورات) ئەم دوانە بە جیا لەیەك دەرئەکەون. یەکێکیان بەشێوەی شەریعەت و ئەوی تریان بەشێوەی پێغەمبەران**



برتراند راسل

لەلایەکەوە ئاسایش و دادپـەروەری، پێویستی بە ناوەندێتی کۆنترۆڵی حکومیە کە ئەگەر بڕیارە کاریگەر بێت، ئەبێت بۆ حکومەتی جیهانی گشتگیر بکرێت. پێشکەوتن پێویستی بە فراوانترین مەیدانە بۆ داهێنانی فـەردی کە ناکۆک نەبێت لەگەڵ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا.

شێوازی دابینکردنی هەرچی زیاتر ئەم دوو ئامانجە، بەخشینی دەسەڵاتە لە حکومەتی ناوەندیەوە بۆ بەرپرسیارە لۆکاڵی و ناوچەییەکان. حکومەتی جیهانی ئەبێت حکومەتە نیشتیمانیەکان لە هەموو شتێکدا جگە لە جەنگ ئـازاد بکات، حکومەتە نیشتیمانیەکانیش ئەبێت بەپێی خۆیان ڕێگا بە بەرپرسیارە لۆکاڵیەکان بـدەن. لە پیشەسازیدا نابێت وا تەسەور بکرێت کە بەتەئمینکردن هەموو کێشەکان چارەسەر ئەبن. بۆ نمونە پیشەسازیەکی گەورەی وەک ڕێگای شەمەنەفەر ئەبێت تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆ بێت، پەیوەندی کارمەندان لەگەڵ دەوڵەتدا لە پیشەسازیەکانی تەئمینکردندا، نابێت لاسایکردنەوەی پەتی بێت لەگەڵ کارمەندانی تایبەتی پێشویان، هەر شتێکی وەک ڕۆژنامە و کتێب و پڕوپاگەندەی سیاسی کە پەیوەندی بە بیروڕاوە هەیە ئەبێت ملکەچی ململانێیەکی ڕاستەقینە بێت و بە وردی لە هەموو کۆنترۆڵێکی حکومەت و هەروەها لە دەست هەموو شێوەیەکی پاوانخوازی بپارێزرێت. بەڵام ململانێ ئەبێت خاوەن چونایەتیەکی کلتوری و فکری بێت، نەک ئابوری. و نابێت ڕەهەندێکی سەربازی هەبێت یان لە ڕێگەی یاسای سزدانەوە ئەنجام بدرێت.

لە مەسەلە کلتوریەکاندا مەرجی پێشکەوتن، هەمەڕەنگی و جیاوازیە. دەزگاکانی وەک زانکۆ و ئەنجومەنە زانستیەکان کە جۆرێک سەربەخۆییان لە حکومەت هەیە، لەم ڕووەوە زۆر نرخیان هەیە. جێگەی داخـە کە ئەمڕۆ بۆ نمونە لە ڕووسیا (یەکێتی سوڤێت) ئەبینین بە فەرمانی ئەو سیاسیانەی هیج لە زانست نازانن، ئامادەن و ئەتوانن بڕیارە کۆمیدیەکانی خۆیان بە پەنابردن

بە هێزی ئابوری یان پۆلیسی ئەنجام بدەن، زانایان ناچارن قسە پڕوپوچەکانی تاریک بیران بسەلمێنن. تەنها بە شێوەیەک ڕێگری لەم دیمەنە بەزەیهێنەرە ئەکرێت کە چالاکی سیاسیەکان کورت بکرێتەوە بۆ ئەو بوارەی سەڵاحیەتیان تێدایە. بێ شەرمیە ئەوان دەستنیشانی بکەن مۆسیقای باش یان زانای بایەلۆجی باش یان فەلسەفەی باش چیە. من هەرگیز نامەوێت لەم وڵاتەدا ئەمجۆرە شتانە ببینم کە بەپێی سەلیقەی تایبەتی هیچ سەرۆک وەزیرێکی چ رابردوو یان ئێستا یان ئاینده دیاری بکرێت، تەنانەت گەر بە ڕێکەوت سەلیقەی کامڵ و بی کەموکوڕ بێت.

هەنوکە دێینە سەر مەسەلەی ئەخلاقی شەخسی بە جیاکردنەوە لە دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان. هیچ کەس نە بەتەواوی ئازادە نە بە تەواوی کۆیلە. مرۆڤ تا ئەوکاتەی سود لە ئازادی وەرئەگرێت، بۆ ڕێنمادکردنی خۆشی پێویستی بە ئەخلاقی شەخسی هەیە. کەسانێک هەن ئەڵێن مرۆڤ تەنها پێویستە پەیڕەوی لەو ڕێسا ئەخلاقیانە بکات کە لەلایەن ئەو کۆمەڵگایەوە قەبوڵکراوە کە بەشێکە لێی. بەڵام لەو بڕوایەدام هیچ ئەنترۆپۆلۆگێک بەم وەڵامە ڕازی نابێت. کاری وەک مرۆڤخۆری یان قوربانیکردنی مرۆڤەکان یان سەربڕین و نمایشکردنی کەلەسەری دوژمنان، تەنها بەهۆی نارەزایی ئەخلاقیەوە لە بیروڕا باوەکان، کەم کەم کەوتن. ئەگەر کەسێک بە جدی ویستی بە باشترین شێوەی شیاو بژی، ئەبێ فێربێت ڕەخنە لەنەریتی خێڵەکی و بیروباوەڕی خێڵەکیانە بگرێت کە لەلایەن هاوسێکانیەوە قەبوڵکراوە.

بەڵام ڕەنگە کەسێک سەر بە کۆمەڵگایەک بێت، بەڵام لەبەر هۆی ویژدانی ئامادە نەبێت ئەوە قەبوڵبکات کە کومەڵگا بەڕاستی ئەزانێت. لێرەدا ئەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان بەڵگەی سەنەدبونی دابونەریت و حوجیەتی یاسا. بۆ پاساوهێنانەوە بۆ کارێکی نایاسایی، هۆی زۆر بەهێزتر پێویستە تا پاساوێکی پراکتیکی کە ئەخلاقی باو ئەشکێنێت. ڕێزگرتن لە یاسا مەرجی پێویست و چاوپۆشی لێنەکراوی بونی هەموو جۆرە ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی قابیلی تەحەمولە. کاتێک یەکێک یاسایەک بە خراپ و نا پێویست بزانێت، مافی ئەوەی هەیە و بگرە ئەرکێتی هەوڵ بۆ گۆڕانی بدات، بەڵام لەزۆر حاڵەتی دەگمەندا هەقی شکاندنی ئەو یاسایەی هەیە. من نکوڵی لە بونی ئەو دۆخانە ناکەم کە یاساشکێنی، وەک ئەرکێکی لێدێت، هەر کاتێک کەسێک هەستبکات ملکەچی بۆ فلان یاسا گوناهە، شکاندنی ئەو یاسایە ئەرکی سەرشانێتی. ئەم حوکمە ئەو ڕەخنەگرانەش ئەگرێتەوە کە بە هۆکاری ویژدانی ڕەخنەیان هەیە. ڕەنگە کەسێک لەبەر هەندێک هۆی ویژدانی ڕەخنەی لە شتێک هەبێت، و ئێوە بڕواتان وا بێت کە ئەو کەسە زۆر هەڵەیە، بەڵام ناتوانن بڵێن کە ئەو نابێت بەو شێوەیە ڕەفتار بکات کە ویژدانی داوای ئەکات. ڕەنگە یاسا بەشێوەیەک داڕێژرا بێت کە لە دوو ڕێگا زیاتر بۆ کەسێکی بە ویژدان نەهێڵێتەوە: یان ڕەچاوی یاسا بکات و بەمشێوەیە دوچاری گوناه بێت، یان بۆ خۆپاراستن لە گوناه، کارێک ئەنجامبدات کە لە ڕووی یاساوە تاوانە. یاسادانەری عاقڵ تا ئەوپەڕی توانا هەوڵئەدات خۆی لە دانانی ئەمجۆرە یاسایانە بە دوور بگرێت.

هەستئەکەم هەروەها ئەبێت ئەوە قەبوڵبکرێت کە لەهەندێک دۆخدا شۆڕش پاساوی هەیە. لەهەندێک لە حاڵەتاکاندا حکومەت بە یاسا سەرچاوەی کارێکی هێندە خراپە، کە سەرنگونکردنی ئەوە ئەهێنێ ئاژاوە ببێت. ئەم مەترسیە بەڕاستی

واقعیە. شایەنی سەرنجە کە سەرکەوتوترین شۆڕشەکان _واتە شۆڕشی ١٦٨٨ی ئینگلتەرا و شۆڕشی ١٧٧٦ ئەمەریکا_ بەدەستی ئەو پیاوانە بەرپاکرا کە بونیان پڕ بوو لە ڕێز بۆ یاسا. لە جێیەک کە ڕێزگرتن بۆ یاسا نەبوو، ڕەنگە شۆڕش بە ئاژاوە یان دیکتاتۆری بگات. لێرەوە ئەگەرچی ملکەچی بۆ یاسا یەکێک لە بنەما ڕەهاکان نیە، بەڵام ئەبێت وەک بنەمایەک قورسایی بۆ دابنرێت و گرنگی پێبدرێت، و تەنها پاش بیرکردنەوەیەکی کامڵ و عاقڵانە ئەویش لە زۆر کاتی دەگمەندا، ڕێگە بە ئاوارتنی ئەدرێت.

ئەمجۆرە مەسەلانە ئێمە بە دوالیزمێکی ئەخلاقی قوڵ ئەگەیەنێت کە هەرچەند سەرگەردانکەر بێت، ئەبێ بناسرێت.

لە سەرتاسەری مێژوودا تا ئەو جێگەیەی بەڵگە لەبەردەستدایە، بڕوا ئەخلاقیەکان دوو سەرچاوەی یەکجار جیاوازیان هەبووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوی تریان پەیوەستە بە باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکانەوە. لە کتێبی پیرۆزی دێریندا (تەورات) ئەم دوانە بە جیا لەیەک دەرئەکەون. یەکێکیان بەشێوەی شەریعەت و ئەوی تریان بەشێوەی پێغەمبەران. هەر ئەم جیاوازیەش لەسەدەکانی ناوەڕستدا هەبوو: لەلایەک ئەخلاقی فەرمی کە بـەزۆرداری خـاوەن پلەکان ئەسەپێنرا و لە لایەکی تر پیرۆزکردنی شەخسی کە عارفە مەزنەکان فێری خەلکی ئەکەن و کاریان پێئەکرد. هەر تیورەیەکی ئەخلاقی پڕاوپڕ، ئەبێت ئەم دوالیزمەی نێوان ئەخلاقی مەدەنی و شەخسی کە هێشتا مـاوە ئەژمار بکات. بەبێ ئەخلاقی مەدەنی کۆمەڵگا توانای بەردەوامی ژیانی نیە، بەبێ ئەخلاقی شەخسیش مانەوەی نرخێکی نابێت. لەبەرئەوە بۆ ئەوەی جیهان باش و خوازراو بێت، بونی ئەخلاقی مەدەنی و شەخسی پێویستە.

ئەخلاق تەنها کورت ناکرێتەوە بۆ ئەو ئەرکانەی بەرامبەر دراوسێکانم هەمە، چەند وێنای من بۆ ئەو ئەرکانە دروسـت بێت. باش ژیانیش تەنها جێبەجێکردنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و گشتیەکان نیە. شتێکی تر بەناوی کەماڵی کەسێتیەوە هەیە. مرۆڤ گەرچی کەمێک بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، بەڵام هەمووی نیە. بیرکردنەوە و هەست و کردارگەلێکی هەیە عاقڵانە یان ناعەقڵانە، بەرز یان دزێو، پڕ لە میهرەبانی یان پڕ لە کینە. ئەگەر بڕیارە ژیانی مرۆڤ تەحەمول بکرێت، ئەبێ دەرفەت بەبیرکردنەوە و هەستەکان و کردارە باشەکانی بدرێت. ئەگەرچی ڕەنگە کەم کەس هەبێت بەختیار بێت بەوەی تەنیا و بیکەسە، ئەوا کەمتر کەس ئەتوانێت لەناو کۆمەڵگادا بە بەختیاری بگات کە دەرفەتێک بۆ ئازادی کرداری فەردی نەهێڵێتەوە.

کەماڵی فەردی بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لە ڕەفتاری دروست لەگەڵ ئەوانی دیدا، بەڵام لایەنێکی تریشی هەیە. ئەگەر بە هۆی خۆشگوزەرانی بێ نرخەوە لە ئەرکەکانی خۆت غافڵ بیت، توشی ئازاری ویژدان ئەبیت. بەڵام ئەگەر ئاهەنگێکی مەزن یا دیمەنێکی جوانی خۆرئاوابوون ئێوەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبێت، بێ ئەوەی هەست بە شەرمەزاری و بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کاتتان بە فیڕۆ داوە، دوبارە ئەگەڕێنەوە بۆ کارەکانتان. ترسناکە گەر بهێڵین سیاسەت یان ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان بەسەر وێنای ئێمەدا بۆ ماهیەتی کەماڵی تاکەکەسیدا زیاد لە سنوور زاڵ بێت. ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم گەرچی نەبەستراوە بە هیچ بڕوایەکی دینیەوە، هاوئاهەنگیەکی نزیکی لەگەڵ مەسیحیەتدا هەیە. سوقرات و حواریەکان (ی حەزرەتی مەسیح) وایان داناوە کە ملکەچی خوداوەند بین نەک مرۆڤ، لە ئەنجیلەکاندا ئەوەندەی جەخت لە عەشقی خوداوەند

کراوەتەوە، هەر هێندەش پێشنیاری خۆشەویستی دراوسێکان ئەکات. هەموو ڕابەرە مەزهەبیە گەورەکان و هەموو هونەرمەندان و داهێنەرە فکریە مەزنەکان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هێزە داهێنەرەکانی خۆیان بێ هەڵبژاردن بوون و کاتێک لەم کارەدا سەرکەوتو بوون، هەستیان بە هەژان و سەرمەستی کردووە. ئەم هەژانە بناغەی ئەو شتەیە کە لە ئنجیلەکاندا بە ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر خودا ناونراوە و (دوبارەی ئەکەمەوە) لە بڕوای دینی جیایە. ئەرکی من بەرامبەر دراوسێ، بەهەرحاڵ بەوشێوەیەی کە دراوسێ وێنای ئەکات، ڕەنگە هەموو ئەرکی من نەگرێتەوە. ئەگەر بە ویژدانەوە و بە قوڵی بڕوام وابێت کە ئەبێ بەشێوەیەکی دیاریکراو ڕەفتار بکەم، ئەگەرچی ئەو ڕەفتارە لە لایەن حکومەتەوە ئیدانەکراو بێت، ئەبێت پەیڕەوی لە بڕوای خۆم بکەم. بە پێچەوانەوە کۆمەڵگاش ئەبێت من لە پەیڕەوکردنی بڕواکانمدا ئازاد بکات، مەگەر ئەو کاتەی هۆی یەکجار بەهێز بۆ ڕاوەستانم هەبێت.

بەڵام ئەو کردارانەی ئیلهامیان لە هەستی ئەرکەوە وەرگرتووە، تەنها کردارێک نین کە ئەبێت لە فشاری زیاد لە سنووری کۆمەڵایەتی دوور بن. هونەرمەند یان دۆزەرەوەی زانستیش ڕەنگە سەرقاڵی کارێک بێت کە لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە زۆر سودمەند بێت، بەڵام ناتوانێت تەنها بە پاڵنەری هەستی ئەرک، کارەکەی خۆی بە دروستی ئەنجامبدات. ئەبێت پاڵنەرێکی خۆبەخۆیانەش بۆ وێنەکێشان یان دۆزینەوەی (ئیکتشاف) تیا بێت، ئەگینا وێنەکەی بێ نرخ و دۆزینەوەیەکەی بێ بەها ئەبێت.

بواری کاری تاکەکەسی نابێت لەڕووی ئەخلاقیەوە، لە بواری ئەرکی کۆمەڵایەتی لەخوارتر بێت. بەپێچەوانەوە بەشێک لەباشترین چالاکیەکانی مرۆڤ



لانیکەم لەڕووی هەستەوە، زۆرتر لایەنی تاکەکەسی هەیە تا کۆمەڵایەتی. پێغەمبەران و شاعیران و دۆزەرەوانی زانستی، کەسانێکن لەبنەڕەتدا دیدێکی تایبەت بەسەر ژیانیاندا زاڵە. کاتێک پاڵنەرە خۆبەخۆکە بەهێز بێت، هەست ئەکەن ناتوانن مل بۆ هیچ مەرجەعێک دانەوێنن ئەگەر فەرمانەکانی بەپێچەوانەی ئەو شتە بێت کە بە قوڵی بڕوایان بە باشیەتی. گەرچی بەگشتی لەبەر ئەم هۆیە لە ڕۆژگاری خۆیدا ئازاریان ئەچێژا، بەڵام ڕەنگە کەسانی ئایندە بەرزترین شانازیان پێببەخشن. نەک تەنها لەدین و هونەر و زانستدا، بەڵکو لەشێوەی هەستمان بۆ دراوسێکانیش، بەنرخترین شتەکان ئەم کەسانە بە جیهانی ئەدەن. چونکە باشبونی هەستی ئەرکناسی کۆمەڵایەتیش وەک هەر شتێکی تر، بەستراوە بەو تاکەکەسە تەنیایانەوە کە بیر و هەستیان ملکەچی خەڵکی نیە.

ئەگەر نەمانەوێت ژیانی مرۆڤ گەرد بگرێت و وەڕسکەر بێت، ئەبێت تێبگەین بایەخی هەندێک شتی سەربەخۆ لە سودمەندیاندایە. شتێک سودمەندە، چونکە ئامێرێکە بۆ شتێکی تر. بەڵام ئەو شتەی تر ئەگەر بڕیار بێت تەنها ئامێرێکی تر نەبێت، ئەبێت لەبەرخۆی بەهای هەبێت و ئەگینا سودمەندی لە خەیاڵیکی پوچ زیاتر نابێت.

دروستکردنی هاوسەنگیەک لەنێوان ئامانج و هۆکارەکاندا، هەم زەحمەتە و هەم گرنگ. ئەگەر بتانەوێت جەخت لەسەر هۆکار(وسیلە) بکەن، ڕەنگە بڵێن کە جیاوازی نێوان مرۆڤی شارستانی و دڕندە، یان گەورە و بچوک یان مرۆڤ و جانەوەر، بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لەو گرنگیدانە جیاوازەی هەریەکەیان لە ڕەفتاریاندا بە ئامانج و هۆکاری ئەدەن. مرۆڤی شارستانی ژیانی بیمە ئەکات، دڕندە شتی وا ناکات. گەورە بۆ ڕێگەگرتن لەکلۆربون، ددانی ئەشوات، مناڵ وا ناکات مەگەر ناچار بکرێت، مرۆڤ بۆ دابینکردنی ئازوقەی زستان لە کێڵگەدا خۆی ماندوو ئەکات، بەڵام جانەوەر شتی وا ناکات. بیرکردنەوە لەداهاتوو پێویستی بەوەیە کە بۆ شتە خۆشەکانی ئایندە، هەنوکە مل بۆ شتی ناخۆش بدەین. بیرکردنەوە لە ئایندە یەکێک لە گرنگترین نیشانەکانی پێشکەوتنی فکریە، بەڵام لەبەرئەوەی زەحمەتە و پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی خواستە هەنوکەییەکان هەیە، ئامۆژگاریکاران پێداگری لەسەر پێویستی ئەکەن و زۆرتر جەخت لەسەر لەخۆبوردوی پراکتیکی ئەکەن تا لەسەر خۆشی پاداشتی داهاتوو. ئەبێ کاری دروست لەبەر دروستبونی بکەن، نەک لەبەر ئەوەی ڕێگەیەکە بۆ بەهەشت. ئەبێ پاشەکەوت بکەیت، چونکە هەموو خەڵکی عاقڵ پاشەکەوت ئەکات، نەک لەبەر ئەوەی دەرامەتێکتان بۆ دابین ئەکات و ئەو ئەگەرە ئەڕەخسێنێت لەزەت لە ژیان وەربگرن و بەمشێوەیە.

بەڵام ئەگەر کەسێک بیەوێت لەبری هۆکار پتر جەخت لە ئامانج بکاتەوە، ڕەنگە بەڵگەی پێچەوانەی ئەوەی بێنێتەوە کە وتمان و بەهەمان ئەندازەش ڕاستبکات. شایەنی بەزەییە کاتێک ئەبینین بازرگانێکی پێرەمێرد و دەوڵەمەند بەهۆی کار و نیگەرانی زۆرەوە لە گەنجێتیدا، هەنوکە توشی خراپ هەرسکردن بووە کە جگە لە نانی وشک و ئاو هیچ شتێک ناتوانێ بخوات، لە کاتێکدا میوانەکانی بێ هیچ دوودڵیەک تێر نان ئەخۆن. لەزەتی ماڵ و سامان کە ئەو بە درێژایی چەندان ساڵ لە ڕەنج و زەحمەت چاوی ئومێدی تێ بڕیبوون، لە چنگی ڕائەکەن، و تەنها خۆشیەکی ئێستا ئەوەیە کە بەسودوەرگرتن لە توانا مادیەکانی، کوڕانی ناچار بکات بە هەمانشێوەی خۆیان ماندوو بکەن.

بەگشتی ئەوە ئەسەلمێنرێت ڕەزیل کە بەشێوەیەکی نەخۆشانە گرنگی بە هۆکار ئەدات، عەقڵانی نیە، بەڵام شێوە سوکترەکانی هەمان نەخۆشی بەگشتی ستایش ئەکرێت. ژیـان بێ جۆرێک هوشیاری بەرامبەر بەئامانج، سارد و بێ تین و گیان ئەبێت، و بەداخەوە پێویستی بەهەژان لەڕێگەی خراپتری وەک جەنگ و دڵڕەقی یان دەسیسە یان وێرانکاری ترەوە دەرئەکەوێت.
کەسانێک لافی ئەوە لیئەدەن "پیاوی کارن" زۆربەی جار بیریان بە هۆکارەوە سەرقاڵە، و لێرەوە لە نیوە عەقڵ زیاتریان نیە. کاتێک نیوەکەی تری عەقڵیش لەبەرچاو بگرین کە پەیوەندی بەئامانجەوە هەیە، پرۆسەی ئابوری و سەرتاسەری ژیانی مرۆڤ بەتەواوی سیمایەکی تر وەرئەگرێت: ئیتر ناپرسین بەرهەمهێنەران چی بەرهەمدێنن و مەسرەفیش بۆ مەسرەفکەران توانایداوە چی بەرهەمبهێنن؟ لەبەرامبەردا ئەپرسین: لەژیانی بەرهەمهێنەران و مەسرەفکەراندا چی بووە کە بۆتە هۆی ئەوەی خۆشحاڵ بن بەوەی ئەژین؟ هەستیان بە چیکردووە یان چیان زانیووە یان ئەنجامداوە، کە پاساوی بۆهەڵسوکەوتیان هێنابێتەوە؟ ئایا زانینێکی تازەیان بەدەستهێناوە کە لەزەتیان لێ دیبێت؟ ئایا دەرکی عەشق و خۆشەویستیان کردووە؟ ئایا لەژێر تیشکی خۆر و لە بەهاردا و لەژێر بۆنی خۆشی گوڵەکاندا بەیەک گەیشتون؟ ئایا چالاکی ژیانیان کە خەڵکی سادە بە سەما و گۆرانیەوە دەریئەخەن، هەست پێکردووە؟ ڕۆژێـک لە لۆس ئەنجلۆس منیان بۆ بینینی گەڕەکی مەکسیکیەکان برد و وتیان ئەمانە کۆمەڵێک سەرسەری و بێکار و تەمەڵن، بەڵام بۆ من وا دەرئەکەوت ئەوان زیاتر لە میواندارە ڕاڕاکەیان بەختی ئەوەیان هەبوو دەستیان بەوە بگات کە ژیان لەبری لەعنەت، ئەکات بە بەهرەیەک. بەڵام کاتێک ویستم ئەم هەستەی خۆم ڕوون بکەمەوە، ڕوبەڕوی تێنەگەیشتنی تەواو بومەوە.
خەڵک هەمیشە بیریان ناکەوێتەوە کە سیاسەت و ئابوری و بەگشتی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، سەر بە بواری ئامێرە نەک ئامانج. بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە توشی شتێک بووە کە دەکرێت ناوی بنێین "هەڵەی بەڕێوبەرایەتی"، واتە عادەتی بینینی کۆمەڵگا وەک گشتێکی سیستماتیک کە ئەگەر نمونەی ڕێکخستن و تەرتیب بێت و ئەگەر ئۆرگانیزمی بێت کە بەشەکانی بەشێوەیەکی جوان بەیەکەوە گونجابن و لە سەیرکردنیشی هەستێکی خۆش بەدەستەوە بدات، ئەوا ئەڵێن باشە. بەڵام کۆمەڵگا بۆ ئەوە دروستبووە یان لانیکەم ئەبێت بۆ ئەوە دروستبوو بێت کە بۆ ئەو کەسانەی کە دروستیان کردووە، ژیانێکی باش و خوازراو برەخسێنێت، نەک بۆ ئەوەی لە دەرەوە دیمەنێکی جوانی هەبێت. ئەبێ بالآترین بەهاکان لە تاکدا بدۆزینەوە، نەک لە گشتدا. کۆمەڵگای باش ئامێرێکە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا بە مەبەستی گەیشتن بە ژیانێکی باش، نەک وەک شتێکی جیا کە بۆخۆی جۆرێک کەماڵی هەیە.
کاتێک ئەڵێن نەتەوە جۆرێک ئۆرگانیزمە، تەشبیهێک بەکار ئەهێنن کە ئەگەر سنورداریەکانی لەبەرچاو نەگرین، ڕەنگە مەترسیدار بێت. مرۆڤەکان و جانەوەرەکان بالآترین ئورگانیزمن بە مانای وردی وشە: هەر باش یان خراپەیەک کە بە مرۆڤێک بگات، بەخودی ئەو وەک یەک کەس ئەگات، نەک بە فلان و فیسار بەشی ئەو. ئەگەر من دانم یان پەنجەی پێم ئازاری هەبێت، منیش ئەو ئازارەم هەیە، ئەگەر ئەو بەشەی لەشم بەهۆی دەمارەکانەوە بە مێشکەوە نەبەسترا بۆوە، ئازارێک نەبوو. بەڵام کاتێک فلان جوتیار لە فلان هەرێمی ئینگلتەرا لەناو بەفر و بۆراندا گرفتار ئەبێت، حکومەتی لەندەن نیە کە

هەست بە سەرما ئەکات. کەوابوو کەسی مرۆڤ بکەری خێر و خراپەیە، نەک هیچ بەشێکی جیا لەو یان هیچ کۆمەڵەیەکی مرۆڤەکان. هەڵەیە کەسێک بڕوای وابێت سەرەڕای چاکە و خراپەی لای تاکە جیاوازەکان هەیە، چاکە و خراپەش لەناو کۆمەڵە مرۆڤێکدا هەبێت- هەڵەیەک کە ڕاستەوخۆ ئەبێتە هۆی تۆتالیتاریسم، لەبەرئەوە مەترسیدارە.
لەناو فەیلەسوفان و پیاوانی دەوڵەتدا کەسانێک هەن کە پێیانوایە دەوڵـەت مومکینە نەک وەک ئامێری باشتربونی ژیانی هاوڵاتین، بەڵکو خۆی لە خۆیدا خاوەن کەماڵێک بێت. من هیچ هۆیەک نابینم بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم ڕایە بم. "دەوڵەت" بابەتێکی ئەبستراکتە کە نە هەست بە لەزەت ئەکات و نە هەست بە ئازار و نە ئومێدی هەیە و نە ترس، ئەوەی ئێمە بە مەبەستی دەوڵەتی دائەنێین لەڕاستیدا مەبەستی کەسانێکە کە هەڵیئەسوڕێنن و بەڕێوەی ئەبەن. کاتێک بەشێوەیەکی دیاریکراو و هەستپێکراو بیربکەینەوە نەک بە ئەبستراکتی، لەبری "دەوڵەت" کۆمەڵێک کەس ئەبینین کە زیاد لەبەشی زۆرینەی خەڵک دەسەڵاتیان هەیە. لێرەوە ستایشکردن و پیاهەڵدان بەسەر "دەوڵــەت"دا، لەڕاستیدا ئەبێت بە ستایشکردن و پیاهەڵدانی کەمینەی فەرمانڕەوا. هیچ کەسێکی دیموکرات توانای تەحەمولکردنی تیورەیەکی لەبنەڕەتدا نادایەروەرانەی نیە.
تیورەیەکی ئەخلاقی تر هەیە کە ئەویش بە بڕوای من کەموکوڕ و نەگونجاوە و ئەکرێت بە "تیورەی بایەلۆجی" ناوی بنێین (هەرچەند مەبەست ئەوە نیە کە بایەلۆجیەکان بڕوایان پێی بێت) و لە بینینی پەرەسەندن بەدەست دێـت. گریمانەکە ئەوەیە کە ململانێی مانەوە ئەبێتە هۆی پەیدابونی ئورگانیزمی ئاڵۆزتر و ئاڵۆزتر تا ئەوەی بۆتە هۆی پەیدابونی مرۆڤ. بەپێی ئەم دیدە باڵاترین ئامانج یان بەدەربڕینێکی باشتر، مانەوەی ڕەگەزە. ئەگەر ئەم تیورەیە دروست بێت، هەموو ئەو شتانەی زیادە بخاتە سەر ئاپۆڕەی مرۆڤ لەسەر زەویدا، ئەبێت بە "باش" بژمێرێت. هەرچیەکیش لێی کەم بکاتەوە، ئەبێ بە "خراپ" بژمێرێت.
من هیچ پاساوێک بۆ ئەمجۆرە تیورە میکانیکی و ژمارەییە نابینم، بەئاسانی ئەکرێت نیو هەکتار زەوی پەیدا بکرێت کە ژمارەی مێرولەکان تیاییدا زۆرتـر بێت لە ژمـارەی هەموو مرۆڤەکان لەسەر زەوی، بەڵام لەبەرئەمە ناڵێین مێرولە لە مرۆڤ باڵاترە. کام مرۆڤە، ئاپورەیەکی زۆر کە لە فەقیر و بەدبەختیدا ئەژین لەلای باشترە لە ئاپورەیەکی کەمتر کە لە خۆشحاڵی و ئاسایشدا ئەژین؟
ڕاستە مانەوە مەرجی پێویستی هەموو شتێکی ترە، بەڵام تەنها مەرجی بونی شتیکی بەنرخە و خۆی لەخۆیدا ڕەنگە نرخێکی نەبێت. مانەوە لە جیهانێکدا کە زانست و تەکنیکی تازە دروستیان کردووە، پێویستی بە ڕادەیەکی زۆری کاری حکومی هەیە، بەڵام ئەوەی مانەوە بەنرخ ئەکات، ئەبێ بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەرچاوەی دەرەوەی حکومەت سەرچاوە بگرێت. ئاشتکردنەوەی ئەم دوو مەرجە دژ بە یەکە، کێشەی سەرەکی ئیمە بووە لەم باسەدا.
ئێستا ئـەمـەوێ بـە کـۆکـردنـەوەی باسەکان و بیرهێنانەوەی مەترسیەکانی ڕۆژگاری ئێمە، جەخت لەسەر هەندێک دەرئەنجام بکەم و بەتایبەتی ئومێدگەلێک بهێنمە پێشێ کە بڕوام وایە بەهۆی عەقڵیەوە ئەتوانین لەبەرچاوی بگرین.
لەسەردەمی یۆنانی کۆنەوە جەنگێکی دێرینە هەبووە لە نێوان کەسانێکدا کە زیاد لە هەموو شتێک گرنگی بە ڕێکەوتن و پەیوەستی کۆمەڵایەتی ئـەدەن،

ئەوانەش کە لەپلەی یەکەمدا گرنگی بە داهێنانی فەردی ئەدەن. لە ململانێیەکی وا درێژخایەندا، ئەکرێت دڵنیا بین کە هەردوو لا ڕاست ئەکەن، و بەهێزترین ئەگەر ئەوەیە ڕێگەچارەیەکی نەک بڕاوە و ڕوون، بەڵکو هەڵگری هەندێک گۆڕانکاری و سازشی جوراوجۆر پەیدا بکرێت.
لەسەرتاسەری مێژوودا بەرزونزمیەک هەبووە لە نێوان قۆناغەکانی ئاژاوەی زۆر و قۆناغی کۆنترۆڵی زیاد لەسنوری حکومەتی. لەخودی ڕۆژگاری ئێمەدا جگە لەو کاتانەی باسی حکومەتی جیهانی ئەکەین، زیاد لەوەی ڕەوایە دەسەڵاتگەری هەبووە و کەمتر لەوەی پێویستە کەڵکەڵە بۆ پاراستنی داهێنانی تاکەکەسی. ئەو کەسانەی ڕکێفی دەزگا گەورەکانیان بەدەست بووە، دیدیان زۆرتر لەسەر شتە ئەبستراکتەکان بووە و لە بیریان بردۆتەوە کە مرۆڤە واقعیەکان چۆنن، و ویستویانە لەبری ئەوەی دەزگاکان لەگەڵ مرۆڤەکاندا بگونجێنن، مرۆڤەکان بخەنە قاڵبی دەزگاکانەوە.
نەبونی خۆهاندان کە کۆمەڵگاکانی ئێمە بە توندی گرفتاری بوون، پەیوەندی بەو کۆنترۆڵە زیادەڕەوەوە هەیە کە مەرجەعەکانی دەسەڵات لە ڕێگەی دورەوە بەسەر بواری فراواندا ئەنجامی ئەدەن.
یەکێک لەباشیەکانی داماڵینی ناوەندگەری، ئەو هەلە تازانەیە کە ئەیڕەخسێنێت بۆ ئومێدەواری و بۆ چالاکیە فەردیە ئومێدبەخشەکان. ئەگەر بیرکردنەوەی سیاسی ئێمە سەرقاڵی کێشە گەورەکان و کارەساتە جیهانیەکان بێت، نائومێدبون کارێکی زەحمەت نابێت. بە پێی میزاج و ئارەزوی حیزبی، ڕەنگە توشی ترس لە جەنگ یان ترس لە شۆڕش یان ترس لە کۆنەپەرستی بن، ڕەنگیشە وا هەست بکەن لەبەرامبەر ئەم مەسەلە گەورانەدا هیچتان لەدەست نایەت، مەگەر لە زومرەی تاکە دەسەڵاتدارەکان بن
کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن. بەڵام سەبارەت بەشتە بچوکترەکان — وەک مەسەلەی شار یا یەکێتیە کرێکاریەکان یان کۆمیتەی حیزبی ئەو ناوچەی کە تیایدا ئەژیت– ئەتوانن ئومێدوار بن کە کاریگەریەی پۆزەتیڤ بەجێئەهێڵن. ئەمە ڕۆحیەتێکی پڕ ئومێد دروستئەکات. ئەگەر بڕیارە ڕێگەیەکی سەرکەوتوانە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلە گەورەترەکاندا بدۆزرێتەوە، پێش هەموو شتێک ڕۆحیەتی ئومێد پێویستە. جەنگ و کەموکوڕیە جیاوازەکان و بێ پارەیی لەهەموو کەسێک و هەموو جێگەیەکدا ماندویەتی دروستکردووە و سیمایەکی ڕوکەشی بە ئومێدواران بەخشیوە. باشترین چارەی ئەم حاڵەتی هیلاکیەی هاوکاتە لەگەڵ بەدبینیدا، سەرکەوتنە ئەگەرچی بە پێوەری بچوکیش بێت. و بۆ زۆرێک لەخەڵکی سەرکەوتن یەکسانە بە دابەشکردنی کێشەکان بۆ بەشی بچوکتر و سەرقاڵی بەو بەشانەی کە ئەوەندە گەورە نین، نائومێدی دروستبکەن.
جیهان بووە بە داوی مەرامە سیاسیە دۆگماکان، بەهێزترین ئەم مەرامانە لەسەردەمی ئێمەدا سەرمایەداری و کۆمیۆنیسمە. من هەستناکەم هیچ یەکێک لەم دوانە بەشێوەیەکی دۆگمایی و توند دەرمانێک بۆ ئازارەکان پێشکەشبکات. سەرمایەداری هەلی داهێنان بە ژمارەیەکی کەم کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن ئەبەخشێت، کۆمیۆنیسم ئەتوانێت جۆرێک تەئمینی هاوکات لەگەڵ نۆکەری بۆ هەمووان ئامادە بکات (هەرچەند لە ڕووی عەمەلیەوە وانیەکات). بەڵام ئەگەر خەڵکی نەکەونە ژێر کاریگەری تیورە ساویلکەکان و یەخەی خۆیان لە ململانێکانی دەرئەنجامی ئەم تیورانە ڕزگار بکەن، ئەو ئەگەرە ئەڕەخسێت کە بە سودوەرگرتنی عەقڵیانە لە تەکنیکی زانستی، هەم هەل بۆ هەموان بڕەخسێت و هەم تەئمین. بەدبەختانە ئەو ڕادەیە

لە هۆشمەندی کە لە زانستەکاندا بەکار هاتووە، لە تیوەرە سیاسیەکانی ئێمەدا نابینرێت، هێشتا فێر نەبوین چۆن سود لە زانین و لێهاتووی بەشێوەیەک وەربگرین، کە ژیان نەک هاوتای شادمانی بەڵکو هاوتای شانازیش بێت. ئـەوەی ئێمە پەرێشان ئەکات، لە لایەکەوە ئەزمونی جەنگ و ترس لە جەنگە کە ڕەنگە هیچ خراپەیەک لەم سەردەمەدا لەو گەورەتر نەبێت، لە لایەکی ترەوە ئەو هێزە بێناو و بێ شوناسانەی کە حوکمڕانی ژیانی ڕۆژانەی ئێمەن، ئێمەیان گەرچی لە ڕووی یاساوە چیتر کۆیلەی کەس نین، کردۆتە کۆیلەی هەلومەرجەکان. بەڵام مەرج نیە بارودۆخەکە بەمشێوەیە بێت. بارودۆخەکە بەهۆی پەرستنی خوا درۆزنەکانەوە وای لێهاتووە. پیاوانی بزێو، دەسەڵات لەبری خۆشی و شادی و خۆشەویستی ئەپەرستن و خەڵکانی کەم جوڵەتر بێدەنگ بوون یان فریوی کەسانێکیان خواردووە کە لە دیاریکردنی سەرچاوەکانی خەم و ئازاردا هەڵەیان کردووە.

لــەوکـاتــەوەی مــرۆڤ کۆیلەیەتی داهـێـنـاوە، دەسەڵاتداران بڕوایان وابووە کە ئەتوانن بەهۆی ئامێرگەلێکەوە کە ئەبێتە هۆی ڕەنج و بەدبەختی کەسانی تر، بە خۆشبەختی بگەن. هێواش هێواش لەگەڵ پەرەسەندنی دیموکراسی و بە بەکارهێنانی ئەخلاقی مەسیحی لەسیاسەت و ئابوری بەشێوازە تازەکان، هەنوکە دروشمێکی تازە جێگەی دروشمی کۆیلەدارانی گرتوتەوە و زیاد لە هەموو کاتێکی ڕابردوو باسی پێویستی بەدیهێنانی دادپـەروەری ئەکرێت. بەڵام داوای دادپەروەری بەهۆی ڕژێمە پان و بەرینەکانەوە، بۆتە هۆی ئەوەی ئەوە فەرامۆش بکەین کە دادپـەروەری بەتەنیا بەس نیە. شادی ڕۆژانـە و ڕزگاربون لە خەم و نیگەرانی و هەل بۆ داهێنان و بیرکردنەوەی داهێنەرانە، بە هیچ شێوەیەک لەڕوانگەی دروستکردنی ژیانێکەوە کە هەست بکەیت نرخی ئەوەی هەیە تیایدا بژیت، گرنگیان لە دادپـــەروەری کەمتر نیە. ژیانێکی یەک ڕیتمی، ڕەنگە کوشەندەتر بێت لە ژیانێک کە لە نێوان خۆشی و ئـازاردا دێت و دەچێت. نەخشەی ڕیفۆرمی ئیداری و باشترکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەگشتی کەسانێک دایئەڕێژن کە چیدی گەنج نین و بەداخەوە زۆرجار بیریان ئەچێت کە بۆ زۆرینەی خەڵکی یەکێک لە پێداویستیەکانی بەختەوەری و شادی، نەک هەر خۆهاندان، بەڵکو هـەروەهـا غـروری شەخسیە. دنیای ئەمڕۆ کە ڕێکخستن و ڕێسا بەسەریدا حوکمڕانی ئەکات، چیدی ڕێگە نادات کەسێک لە داگیرکردنی وڵاتانی تر هەست بەغرور بکات، بـەڵام هیچ عەیب نیە هونەرمەندان و دۆزەرەوان و کەسانێک کە بیابانیان کردووە بە گوڵستان و شادی و خۆشیان بۆ ئەو جێگایانە بردووە کە بێ ئەوانە تەنها نەگبەتی و بەدبەختی هەبوو، هەست بە غرور بکەن.

ئەو غەریزانەی کە ماوەیەکی زۆر باوانی دڕندەی ئێمەی بۆ ڕاو و جەنگ ئـەوروژان، ئەمڕۆش هەر پێویستی بەشانۆیەکە بۆ ئەوەی خۆی تیا دەربخات، و ئەگەریش ڕێگەیەکی تری نەبێت، ئەگۆڕێت بۆ بەدنیازی و کینەخوازی سەرکوتکراو. خۆشبەختانە ڕێگەگەلێک بۆ ئەم غەریزانە هەیە کە خراپ و ئافەتیش نیە. ئەکرێت ڕکەبەرایەتی و وەرزش بکەینە جێگری جەنگ، و لەبری ڕاو ڕوو لە لەزەتی دۆزینەوە و داهێنان بکرێت. ئەم غەریزانە نابێت نادیدە بگیرێن یان مایەی ئەسەف بن، چونکە ئەتوانن نەک مایەی خراپە بن، بەڵکو هەروەها ئەتوانن ببنە سەرچاوەی باشترین ڕەگەزەکانی دەستکەوتەکانی مرۆڤ. پاش بەدەستهێنانی ئاسایش، کەسانێک کە باشتربونی ژیانی مرۆڤیان ئەوێت، کارێکی لەوە

گرنگتریان نیە کە بۆ ئەم غەریزە دێرین و بەهێزانە، نەک کۆتوبەند و ڕێگر و نە ڕێگەچارەی وێرانکارانە، بەڵکو تا ئەوپەڕی توانا بوارێکی زۆرتر بدۆزنەوە کە شادمانی و غرور و شکۆمەندی بە ژیانی مرۆڤ بدات.
بەدرێژای سەردەمەکان کە مرۆڤ بە پشکوتن و کامڵبوون گەیشتووە، مرۆڤەکان ڕوبەڕوی دوو جۆر ئازار و گرفتاری بونەتەوە: یەکێکیان ئەوەی سروشت بەسەریاندا سەپاندۆیێتی، ئەوی تریان ئەوەی خۆیان بەهۆی نەزانیەوە یەکتریان پێ تـوش کـردووە. لەسەرەتادا خراپترین بەڵاکان لە دەوروبــەرەوە ئەهات. مرۆڤ کەسایەتیەکی دەگمەنی گیان لەبەران بوو کە مانەوەی زۆر جێگەی دڵنیای نەبوو، نە خاوەن چالاکی مەیمون بوو نە پێستی سمۆرە، لەبەر ئەوە بەزەحمەت ئەیتوانی لە چنگی دان ڕابکات و لە زۆرترین خاڵەکانی جیهاندا بەرگەی سەرمای زستانی نە ئەگرت. تەنها دوو خەسلەتی سروشتی هەبوو: یەکێکیان باڵای ڕاست کە دەستەکانی ئازاد ئەکرد، دوهەمیان عەقڵێک کە ڕێگەی ئەدا ئەزمونەکانی بگوێزێتەوە. ئەم دوو خەسڵەتە هێواش هێواش بە بەرزترین پلەیان گەیاند. ژمارەی تاکی مرۆڤ لەهەر گیانلەبەرێکی گەورەی تر زیاتر بوو. بەڵام سروشت هێشتا ئەیتوانی بەهۆی لافاو و برسێتی و نەخۆشیەکانەوە، توانای خۆی دەربخات و لە زورینەی خەڵکی لەبری خواردنی ڕۆژانەیان، بە بێ وەستان کار بکێشێتەوە.
لە ڕۆژگاری ئێمەدا و لە ئەنجامی گەشەکردنی بیری زانستی، دیلێتی ئێمە لەدەست سروشتی دەرەکی، بەخێرایی ڕووی لە کەمیە. برسێتی و نەخۆشیە هەمەگیرەکان هێشتا دێنە پێشێ، بەڵام هەر ساڵێک باشتر لە ساڵی پێش تێئەگەین کە بۆ پێشگرتن لێیان ئەبێ چیبکەین. کاری ماندوکەرانە هێشتا پێویستە، بەڵام تەنها بەهۆی ناعەقڵانی ئێمەوە، چونکە ئەگەر هاوکاری هەبێت، ئەتوانین بە کارێکی نەرم و گونجاو، گوزەران بکەین. بەو تەکنیکانەی هەیە، ئەتوانین هەرکاتێک عەقڵانیانە بیر بکەینەوە، لە زۆرێک لە شێوەکانی دیلێتی دێرین بۆ سروشتی دەرەکی ڕزگارمان بێت.
بەڵام ئەو بەڵایانەی مرۆڤەکان بەسەر یەکدا ئەیهێنن، بەهەمان ڕادە کـەم نـەبـۆتـەوە. هێشتا جەنگ و ستەمکاری و دڵڕەقی ترسناک هەیە و هێشتا تەماعکاران، موڵک و سامانی کەسانێک کە وەک ئەوان لێزان و دڵڕەق نین، لە چنگیان دەربێنن. ئارەزوی دەسەڵات هێشتا بواری ستەمکاری فراوان ئەکات، لەهەر کوێ ستەمکاری بەشێوەیەکی ترسناک مومکین نەبێت، لانیکەم ڕێگری لە ئازادی ئەکات. ترس – ترسی قوڵ کە تەنانەت مرۆڤ بەزەحمەت ئاگای لە بونێتی – هێشتا پاڵنەرێکی زاڵە لە ژیانی زۆرێک لە خەڵکیدا.
هەموو ئەمانە پێویست نیە. هیچ شتێک لە خەسڵەتی مرۆڤدا نیە کە ئەم خراپیانە بکاتە شتێکی ناچاری. ئەمەوێت بەوپەڕی جەختەوە ئەوە لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا دوبارە بکەمەوە کە لەئارەزوی جەنگی ئێمەوە ئەو ئەنجامگیریە ئەکەن کە سروشتی مرۆڤ خوازیاری جەنگ و شێوازەکانی تری ناکۆکیە، بە هیچ شێوەیەک هاوڕا نیم. من بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. بڕواموایە ئارەزووە جەنگیەکان ئەتوانن دەورێکی سەرەکی ببینین و ئەکرێت شێوە زیانبەخشەکانی زۆر کەم بکەینەوە. ئەگەر ترس لە نەزانی و بێ نەوایی نەبێت، حەزی سامان کەمتر ئەبێت. حەزی دەسـەڵات ڕەنگە لە زۆر ڕێگەوە تێر بکرێت کە نەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە کەسانی تر: بۆ نمونە لە ڕێگەی دەسەڵاتکردن بەسەر سروشتدا لە ڕێی دۆزینەوە و داهێنانەوە، یان بەرهەمهێنانی کتێب و بەرهەمی هونەری بەرز و

جێی پەسەند، یان سەرکەوتن لە قەناعەت پێکردن و قەبوڵکردنی بیروڕاکان. هێز و جوڵە و ئارەزوی کاریگەری ئەتوانێت سودمەند بێت، ئەگەر ڕێگەی دروست پەیدا بکات، ئەگینا زیانمەند ئەبێت، وەک هەڵم کە ئەتوانێت هەم شەمەنەفەر بخاتە ڕێ و هەم مەنجەڵ بتەقێنێتەوە.

ڕزگاربونی ئێمە لە دیلێتی دەرەکی، باشتربونی ژیانی مرۆڤی بەجۆرێک مومکین کردووە کە هەرگیز پێشینەی نەبووە. بەڵام ئەگەر بڕیارە ئەم ئەگەرە ڕووبدات، ئەبێت بەهەر ڕێگەیەک کە بە دڵنیایی زیانبار نەبێت، ئازادی داهێنان بونی هەبێت و هانی ئەو داهێنانانە بدرێت کە ژیان زیاتر دەوڵەمەند ئەکات. ڕێگەی دۆزینەوەی جیهانێکی باشتر، هاندانی مرۆڤە کە بێ پەروا و نەترس بن، نەک دەستەمۆ و ترساو، مەگەر ئەوکاتەی زیان بە کەسانی تر بگەیەنرێت. لە جیهانێکدا کە ئێمە لەناویدا ئەژین، هەم بۆ باشە و هەم بۆ خراپی ئیمکانی بێسنور هەیە. سەرگەردانی هەنوکە پێش هەر شتێک دەرئەنجامی ئەوەیە بەشێوەیەکی ترسناک فێربووین هێزەکانی سروشتی دەرەکی کۆنترۆڵبکەین، بەڵام زۆر دەسەڵاتمان بەسەر هێزەکانی دەرونماندا نەبێت. زاڵبون بەسەر نەفس و خۆگرتن، هەمیشە وێردی سەر زمانی ئامۆژگاریکاران و مامۆستایانی ئەخلاق بووە، بەڵام لە ڕابردوودا زاڵبونێک بێ دەرککردن و تێگەیشتن. ئامانجی من لەم وتارانە دەرککردنی پێداویستیەکانی مرۆڤە، بە فراوانتر لەوەی زۆربەی سیاسەتمەداران و ئابوریزانان بە بەڵگەنەویستیان زانییوە، چونکە تەنها لەڕێی ئەم دەرککردنەوە ئەتوانین ئەو ئومێدانە بهێنینە دی کە تا هەنوکە بەهۆی ناعەقڵانیەت و ساوێلکەیەتی ئێمەوە بەدی نەهاتوون، بەڵام بەهۆی کارزانی و لێهاتویمانەوە لەبەردەستدان. فولادوند.

* لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگیراوە:
**خرد در سیاست. گزیده و نوشته و ترجمه: عزت اللەفولادوند. طرح نو.تهران.١٣٧٦**

# کاریگاریەکانی ماس کۆمونیکەیشن

**گێرهارد مالێتسکە**

**لە ئەڵمانییەوە: قوباد ڕەسوڵ**

پرسیارکردن لە کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن بریتیە لە گیروگرفتە سەرەکیەکەی زانستی ماس کۆمونیکەیشن. پێشتر لە تاوتوێکردنی فاکتۆرە سەرەکیەکان لە بواری ماس کۆمونیکەیشندا جێگای ئەم گیروگرفتە دەستنیشان کرا: کاریگەریەکان ناتوانرێت- وەکو ئەوەی لاسوێل لە پێناسە بەناوبانگەکەی خۆیدا ئاماژەی پێداون - وەکو فاکتۆرێکی پێنجەمی سەربەخۆی بواری کۆمونیکەیشن لێکبدرێنەوە.جا چونکە هەموو ئەو گۆڕان و پرۆسێسانە کە ئێمە لە ژێر چەمکی کاریگەریدا هەوڵدەدەین کۆیان بکەینەوە، لای ئەو کەسانە ڕوودەدەن کە قسە نێردراوەکە (لێکدەدەنەوە). پێویستە لەم باسەماندا لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە لە ژێر فاکتۆری (ڕێتسپییێنت - وەرگر -)دا دابنرێن. کە

**لە سەرتاسەری مێژوودا تا ئەو جێگەیەی بەڵگە لەبەردەستدایە، بڕوا ئەخلاقیەکان دوو سەرچاوەی یەکجار جیاوازیان هەبووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوی تریان پەیوەستە بە باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکانەوە. لە کتێبی پیرۆزی دێریندا (تەورات) ئەم دوانە بە جیا لەیەك دەرئەکەون. یەکێکیان بەشێوەی شەریعەت و ئەوی تریان بەشێوەی پێغەمبەران**


گێرهارد مالێتسکە

ئێمە لە چوارچێوەی ئەم کارەدا بەشێکی تایبەتی بۆ گیروگرفتی کاریگەری تەرخان دەکەین و هەوڵدەدەین جێگاکەی دەستنیشان بکەین، ئەوە لە لایەکەوە لەسەر بناغەی ئەو گرنگییە گەورەیەیە کە بۆ کاریگەری دادەنرێت، بەڵام لە لایەکی تریشەوە- وە ئەمەش خاڵێکی زۆر بڕیاردەرە- لە گیروگرفتی کاریگەریدا زۆر ڕوون و ئاشکراتر وەک لە هەموو پرسیارەکانی تری ماس کۆمونیکەیشن، ئەوە دەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەک هەموو فاکتۆر و توخمەکانی بواری کۆمونیکەیشن لەگەڵ یەک گونجاو و پێکەوە بەستراونەتەوە. ڕاستەوخۆ ئالێرەدا بە تایبەتی ئەوە گرنگە ئەو پەیوەندیانە دەستنیشان بکەین.

بە سەرنج دانێکی ووردتر پرسیارکردن دەربارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن بڵاودەبێتەوە بۆ چەندین گیروگرفتی پێکەوە بەستراو و جیاواز لە یەکتر و سەرئەنجام تێکەڵ بووەوە لەگەڵ یەکتر، بۆ ئەو گیروگرفتانەی کە هەندێکیان ئەوەندە کۆنن وەکو ماس کۆمونیکەیشن خۆی، وە هەندێکیان لەگەڵ پەیدابوونی ماس میدیای نوێدا سەریان هەڵدا. هەر بۆ نمونە زاناکانی بواری ئەدەب ئەوانەی گرنگی بە بواری زانستی کۆمەڵایەتی دەدەن دەپرسن: ( ئایا دەتوانین کاریگەریی کتێبێک لەسەر خوێنەرەکەی بە تەواوی دەستنیشان بکەین؟ ئایا هیچ کاتێک دەتوانرێت کاریگەری ساتیرێک وەسف بکرێت؟ ئایا ئەدیسۆن توانی بە ڕاستی دابونەریتی کۆمەڵگاکەی خۆی بگۆڕێت یاخود دیکنز ببێتە هێزی پاڵپێوەنەر بۆ ڕیفۆرمی بەندیخانە، قوتابخانەی سەرەتایی و خانوی هەژاران؟ ئایا هەر بە ڕاستیی هاریت بێخەر شتۆف (کەپرەکەی مامە تۆم) ئەو ئافرەتە بچوکە بوو کە بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگە گەورەکە؟ ئایا (دابڕان بەهۆی (با)وە) توانیی بیروڕای خوێنەری وڵاتەکانی باکور بۆ جەنگەکەی هاریت شتۆف بگۆڕێت؟ کاریگەریی هەمینگوای و فاوڵکنەر لەسەر خوێنەرەکانیان چۆن بوە؟ ئایا کاریگەریی ئەدەب لەسەر پەروەردەکردنی ناسیونالیزمی مۆدێرن

تا چ ڕادەیەک زۆربوە؟ هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەی سۆسیالەی خۆی لەگەڵ تەلەفزیۆن خەریک دەکات پرسیارەکانی خۆی نزیکەی بەم جۆرە دەهۆنێتەوە: ئایا تەلەفزیۆن دەبێتە هۆی زیادبوونی زانینی زۆربەی جەماوەر؟ ئایا دەبێتە هۆی یەکسان کردنی ئاستی چێژوەرگرتنی مرۆڤەکان؟ ئایا تەلەفزیۆن دەبێتە هۆی زووتر گەیاندنی منداڵان بە جیهانی گەورەکان؟ ئایا منداڵان و گەنجان لە تەلەفزیۆنەوە فێری زەبروزەنگ و تاوانکردن دەبن؟ ئایا تەلەفزیۆن دەبێتە هۆی سەرمەستکردنی ڕێتسپیێنت بۆ ئەوەی خۆی لە گیروگرفت و باری گرانی ژیانی واقیعی بدزێتەوە و پەنا بۆ جیهانی خەو و خەیاڵات بەرێت؟.

ئەگەر ئەم پرسیارانە و پرسیاری تری لەم جۆرە لە مناقەشاتی گشتیدا زیاتر فۆرمی دەربڕینی ڕاست و دروست وەربگرن، ئەگەر ئەمانە بەو شێوەیە پیشان بدرێن وەکو ئەوەی ئەم کاریگەریانە واقیعی سەلمێندراوبن، ئەوا ئەرکی زانست بریتی دەبێت لەوەی سنورەکانی ئەم زانیاریانەی ئێستامان ڕوون و ئاشکرا دیاری بکات و لەسەرو ئەوەشەوە ئەو دەربڕینانە بکاتە گریمانی (فەرەزیە) کارکردن و بەهۆی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی ئەزمونیەوە ڕاستی و دروستیەکەیان بپشکنێت.

هەموو ئەو دیراسە و لێکۆڵینەوە زۆرانە دەربارەی کاریگەری ماس کۆمونیکەیشن لەوانەیە ببنە هۆی دروست بوونی ئەو بیروڕایەی کە ئەم بوارە بەڕاستی تەواو لێی کۆکراوەتەوە. بەڵام بە سەرنجدانێکی وورد‌تر زۆر بە خێرایی ئەوە دەردەکەوێت کە لێرەدا زانینەکەمان زۆر سنوردار و پڕ لە کەموکوڕییە و زۆر بە نایەکسانی بەسەر گیروگرفتی تاک و تەنهادا دابەش بوە. لە هەندێک گیروگرفتدا لێکۆڵینەوە ئەزمونیەکان بەسەر یەکدا کەڵەکە بوون. هەندێک گیروگرفتی تر بە پێچەوانەوە تاکو ئێستا بە دەگمەن دەستیان بۆ براوە. هۆی ئەوەش لەلایەکەوە لەو واقیعەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەو میتۆدی لێکۆڵینەوانەی ئێستا لەبەردەستمان دان تەنها بۆ بەشێکی زۆر بچووکی ئەو بابەتە زۆر چڕ و ئاڵۆزە گونجاون، لەلایەکی تـرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکـەوێـت کە لێرەدا هیچ تیۆرییەکی تەواو و بەرفراوانی ماس کۆمونیکەیشنمان لەبەردەست دا نیە، کەواتە سیستەمێک کە بتوانێت هەموو فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی پرۆسێسی ماس کۆمونیکەیشن دەربخات و جێگا و نرخی هەموویان دیـاری بکات. لـەم حاڵەتەدا ئـەو هەوڵە کـەم و بچوکانەش بۆ پیشاندانی تەواو سەرجەمی گیروگرفتی کاریگەریی، لەڕاستیدا هەرچەندە وەکو ماتریاڵی کۆکراوەی بەنرخ و تەختیتی سەرنجڕاکێش سەیر دەکرێن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پێداویستیەکانی سیستەم و بەربڵاوی و سەرجەمییان زۆر سنوردارن. بەم پێیە پیشاندانێکی سیستەمییانەی سەرجەمی گیروگرفتی کاریگەری ئەوەندە گرنگە، ئەوەندەش ئەرکەکەی ئێمە بچووکە لە چوارچێوەی ئەم نووسینەدا بـە پیر ئـەو داواکـاریـانـەوە بچین. جێبەجێکردنی کارێکی ئاوەها گەورە پێویستیی بە لێکۆڵینەوەی فراوان و هەمەلایەنە هەیە. هەر لەبەرئەوەش ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی خۆمان لەگەڵ ئەوە خەریک دەکەین، سکێچێک بۆ گیروگرفتە بناغەییەکانی کاریگەری بکێشین و بەم هۆیەشەوە ئەو سنورانە دەستنیشان بکەین کە لەوانەیە بتوانن ببنە بناغەیەک بۆ پیشاندانێکی سەرتاسەری. چوار پرسیار لەم بابەتەماندا شی دەکەینەوە:

A– یەکەمجار پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە، ئایا لە وانەیەکی ماس کۆمونیکەیشندا چی لە ژێر وشەی (کاریگەریی)دا تێدەگەین.

B– پاشان پێویستە جۆرەکان و فۆرمەکانی کاریگەریی بدۆزینەوە.
C– پاشتر پێویستە لەوە بکۆڵینەوە، چۆن وە بە چ ڕادەیەک فاکتۆر و توخمەکانی بواری کۆمونیکەیشن نەخشیان لەسەر پرۆسێسەکانی کاریگەریی هەیە.
D– لە کۆتاییشدا پێویستە بە کورتی دەربارەی ئاستی ئەکتوێلی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بدوێین.

## A – دەربارەی چەمکی (کاریگەریی)

لەوکاتەدا کە مرۆڤ لە چوارچێوەی ماس کۆمونیکەیشندا ڕۆڵی ڕێتسپیێنت وەردەگرێت، چەندین پرۆسێسی سلوک و ڕووداو دروست دەبن کە بەبێ وجودی ماس کۆمونیکەیشن وە بەبێ ڕۆڵی ئەو وەکو ڕێتسپیێنت نایەنە دروست بوون. ئەم پرۆسێسانەی بەهۆی ماس کۆمونیکەیشنەوە (دروست دەبن) لە ئەدەبیاتی ئەنگلۆ – ئەمریکیدا بەزۆری لە ژێر ناوی (Effect)دا تەعبیریان لێدەکرێت، دەگمەنتر (،(reactions) ، (impact (responses)) وە یان (success) لەناو وشەی ئەڵمانیە جۆربەجۆرەکاندا وشەی (کاریگەریی) زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی جێگای خۆی کردۆتەوە.
لە بەرامبەر ئەو کارە زۆرانەی خۆیان بە کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشنەوە خەریک کردوە، ئەوە جێگای سەرسوڕمانە کە مرۆڤ چەند دەگمەن هەوڵی داوە چەمکی کاریگەریی دەقیقتر دیاری بکات. وادەردەکەوێت نووسەرەکان وەکو قاعیدەیەک بە بێدەنگی لە پێشدا ئەوەیان دیاری کردبێت کە کاریگەریەکان چین. ئەگەر بێت و سەرنجێکی ووردتر لەوە بدەین کە چ شتێک لەناو ئەو لێکۆڵینەوە هەمەجۆرانەدا وەکو کاریگەری نیشانەکراوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بە هیچ جۆرێک بۆ ئەم وشەیە وێناکردنی یەکگرتوو ڕوون و ئاشکرا دانەنراوە. لە کاتێکدا لێکۆڵەرەوەیەک لەژێر وشەی کاریگەرییدا ئەو گۆڕانانەی بیروڕا و هەڵوێستی ڕێتسپیێنتی مەبەستە، یەکێکی تریان لە ژێر هەمان ناودا کاریگەریەکان لەسەر سلوک تێدەگات، کەسێکی تری سێهەم کاریگەریەکان لەسەر وەعی و فێربون، یەکێکی تر تەنها ئەو گۆڕانانە وەکو کاریگەریی دەستنیشان دەکات کە پاش کارلێکردنی قسەکان دەتوانرێت بسەلمێنرێت، کەسێکی تر پرۆسێسەکانی پری کۆمونیکەیشن (پێش کۆمونیکەیشن) یاخود قۆناغی کۆمونیکەیشنە واقعیەکە دەبەستێتەوە بە چەمکی کاریگەرییەوە.
ئەگەر بمانەوێت چارەسەری ئەم ناوەڕۆکە لێڵ و تەمومژاویانە بکەین، ئەوە کارێکی باش دەبێت دوو چەمکی کاریگەریی لە یەکتر جیابکەینەوە، یەکێکی فراوان و بڵاو کە داخوازیە تیۆریەکان بهێنێتەدی، هەموو ئەگەرەکانی کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن بە سادەیی دیاری بکات، وە یەکێکی بچوک و سنوردار، تێگەیشتنێکی ئاراستە کراوی پراگماتیکی کە لەوە نزیک ببێتەوە کە ئایا لە ناوهێنان و بەکارهێنانی باو و بڵاودا چ شتێک وەکو کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن دیاری دەکرێت.
لە گۆشەنیگای بناغەکانی تیۆریەوە پێویستە چەمکی کاریگەریی لە مانا هەرە گەورە و فراوانەکەیدا دابنرێت، کەواتە لە فۆرمێکدا کە هەموو ئەوشتانە لەخۆ بگرێت کە بەهۆی ماس کۆمونیکەیشنەوە لای ڕێتسپیێنت دێنەدی. ئەم مانا فراوانەی چەمکی کاریگەریی هەموو ئەو سلوک و پرۆسێسی وەرگرتنانەی لای مرۆڤ هەستیان پێدەکرێت، دەگرێتەوە، کە دەتوانرێت بگێڕدرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو مرۆڤە لە بواری ماس کۆمونیکەیشندایە:

Whatever happens as a result of“ the medias or whatever happens as a result of reading, listening, or watching may be termed an effect of ”the media

The term effect refers to any result» “that follows the outcome

The overt acts eventuating from this” chain of events are generally what is meant by effects, although logically such subjective acts as paying attention to the message, perceiving “.it , and interpreting it also effects

ئەم چەمکە زۆر فـراوانـەی کاریگەریە لۆجیکیە بێ کەموکوڕیە و ڕەخنەی لێناگیرێت، هەموو ئەو پرۆسێسانەی لە ماس کۆمونیکەیشندا پەیوەندیان بە ڕێتسپییێنتەوە هەیە لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، کەواتە هەرسێ قۆناغەکانی کە ئێمە پێویستە لەکاتی بەیەکگەیشتنی مـرۆڤ لەگەڵ قسەکانی ماس کۆمونیکەیشندا لە یەکیان جیابکەینەوە: قۆناغی پری کۆمونیکەیشن (پێش کۆمونیکەیشن)، قۆناغی ڕوودانی کۆمونیکەیشن، وە قۆناغی پۆست کۆمونیکەیشن. تاکە لاوازیەکی - لە ڕاستیشدا تا ڕادەیـەک گرنگ -ی ئەم تێگەیشتنە لەوێدایە کە خۆی تەواو دووردەخاتەوە لە بەکارهێنانی باو و بڵاوەکە. ئەگەر قسە دەربـارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن بکرێت، ئەوا لە حاڵەتی زۆر دەگمەندا مەبەستەکە پرۆسێسەکانی قۆناغی پری کۆمونیکەیشن (پێش کۆمونیکەیشن) دەگرێتەوە. هـەروەهـا بـواری ڕووداو و وەرگرتـن لە قۆناغی کۆمونیکەیشندا زۆر دەگمەن وەکو کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن نیشانە دەکرێت. لە کاتێکدا ئێمە ئەم دوو بوارە دەخەینە ناو کەوانەیەکەوە، دێینە سەر باسی چەمکی کاریگەریی بە مانا تەسکەکەی: ئێمە لە ژێر ئەم نـاوەدا لە لایەکەوە هەموو ئەو پرۆسێسانە تێدەگەین کە لە قۆناغی پۆست کۆمونیکەیشندا وەکو ئەنجامی ماس کۆمونیکەیشن ڕوودەدەن. وە لە لایەکی ترەوە لە قۆناغی ڕوودانی کۆمونیکەیشندا هەموو ئەو جۆرە سلوکانەی کە لە ئەنجامی ڕووتێکردنی مرۆڤەکە بۆ قسەکانی ماس کۆمونیکەیسن دێنەدی. ئەم چەمکە تەسکە پراگماتیکی دانـراوەی کاریگەریە تەنها بەشێکی قۆناغی کۆمونیکەیشن (لایەنی سلوک) هەروەها سەرجەمی قۆناغی پۆست کۆمونیکەیشن دەگرێتە خۆی. ئەم جۆرە سنوربۆدانانانە هەڵبژێردراوە و لە کرۆکی بابەتەکەدا بناغەی بۆ دانراوە. بەڵام هێشتا هەر گونجاوترینە لەگەڵ بەکارهێنانی وشە باو و بڵاوەکەدا، چونکە هەموو ئەو شتانە دەگرێتە خۆی کە ئاسایی وەکو کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن نیشانە دەکرێن. لە چوارچێوەی ئەم کارەدا ئێمە چەمکی کاریگەریی بەم مانا تەسکەی بەکاردەهێنین.

## B – جۆرەکانی کاریگەریی

پـاش ڕوونـکـردنـەوەی چەمکەکە، ئێستا دەبێت بپرسین، چۆن دەتوانرێت کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن دەستنیشان بکرێت. ژمـارەی ئەو هەوڵانە بۆ وەڵامـدانـەوەی ئەم پرسیارە بە سەرسوڕمانەوە زۆر کەمن. هەرچەندە ناوبەناو دەربـارەی کاریگەریی گشتی و تایبەتی یاخود کاریگەریی کەم خایەن و درێژخایەن قسەدەکرێت، وە یان لە لایەکەوە دەربارەی کاریگەری لە بناغەکانی کاتی بێ ئیشی و لە لایەکی تـرەوە دەربـارەی کاریگەریەکان کە لە خودی قسەکانەوە سەرچاوە

دەگرن، قسە دەکرێت، بەڵام لەوەدەچێت مەیلی ئەوە کەم بێت، پرسیارەکە دەربارەی جۆرەکانی کاریگەریی، تیۆریانە- سیستەمیانە تاوتوێ بکرێت. تەنانەت کتێبە زۆر بەنرخەکەی کلاپەر دەربارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن تەنها هەندێک فۆرمی بناغەیی کەم دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، روون و ئاشکرا خۆی بە کاریگەریەکان لە بواری شێوەی پەروەردەکردن، ڕیکلام و بەڕێوەبردنی جەنگی سایکۆلۆژی ئینتەرناسیۆنالەوە خەریک دەکات و خۆشی لەوە دەپارێزێت پرسیارە تیۆریەکە دەربارەی جۆرەکانی کاریگەریی شی بکاتەوە. هۆیەکانی ئەم خۆپاراستنەش لەوەدەچێت لە لایەکەوە لە ڕێڕەوە ئاراستەکراوە پراگماتکیە زۆر بەهێزەکەی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەمریکیدا بێت، بەڵام لە لایەکی تریشەوە لەو گیروگرفتەدا بێت کە لە هەموو هەوڵێکی دەستنیشان کردنی تیۆریانەدا سەرهەڵدەدات و کە ئێمەش لێرەدا بە کورتی هەوڵی ڕوونکردنەوەیان دەدەین. لە هەوڵ داندا بۆئەوەی کاریگەریەکان تا ڕادەیەک بە تەواوی بخرێنە ناو کەتەلۆگێکەوە، گەورەترین گیروگرفت لەوێدایە کە سترکتوری سایکۆلۆژی (نفسی) مرۆڤ لە پەیوەندییەکی تێکەڵ و گونجاودایە لەگەڵ یەکتر، کە تیایدا هەر بەشێکی بە بەشەکانی تریەوە بەستراوەتەوە. بۆ گیروگرفتی کاریگەریی ئەمە ئەو مانایە دەبەخشێت: پرۆسێسەکانی سایکۆلۆژی، ئەوانەی ئێمە وەکو کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن دەستنیشانیان دەکەین، بە تەنها و سەربەخۆ لە یەکتر ڕوونادەن. بەڵکو زۆر زیاتر گۆڕان لە بەشێکیدا دەبێتە هۆی ئەوەی گۆڕان لە بەشەکانی تریشدا بە دوای خۆیدا بهێنێت. بۆ نمونە ئەگەر لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە هەڵوێستی مرۆڤێک

کاریگەریی لێبکرێت، ئەوا پێویستە لە سەرمان چاوەڕوانی ئەوەش بکەین کە بەم هۆیەشەوە زانینی ئەو کەسە، هێزی پاڵپێوەنەری (دافع)، بناغەکانی کاردانەوەی ئینفیعالی و سلوکیشی گۆڕانیان بەسەردا دێت. کەواتە کاریگەریە هەمەجۆرەکان بە شێوەیەکی میکانیکی وەزیفی لەگەڵ یەک پەیوەستن. لەم حاڵەتەدا ئەمە بەزۆریی ئەو مانایە دەبەخشێت، کە بریتی بێت لە بە سادەکردنێکی زۆر درشت و بەم هۆیەشەوە تەزویر کردنی ڕووداوەکە، ئەگەر بێت و مرۆڤ هەر یەکێک لە جۆرەکانی کاریگەریی بە تەنها و عەزل کراوی لەوانی تر سەرنج بدات و پەیوەندیەکانیان لەگەڵ یەکتر ئیهمال بکات، کە تیایاندا کاریگەریەکان ڕوودەدەن. کەواتە هەرکەسێک کەتەلۆگێک بۆ جۆرەکانی کاریگەریی دابنێت، دەتوانێت تەنها بەو وەعییەوە ئەم کارەبکات، کە هەموو بوارە سایکۆلۆژیەکان، ئەوانەی لە لایەن ماس کۆمونیکەیشنەوە دەتوانرێت کاریان لێبکرێت، بەبێ سنوری ئاشکرا و ڕوون تێکەڵی یەکتر دەبن. بەم شێوەیە لێکۆڵەرەوە زۆرجار توشی دیاردەی کاریگەریی وا دەبێت، کە نە دەتوانێت بیخاتە خانەیەک یاخود خانەیەکی ترەوە، وە نە دەشتوانێت لە هەردوو خانەکەدا دایبنێت، بۆ نمونە (sleeper effect) کە دەکەوێتە نێوان زانین و هەڵوێستەوە، وە یان کردەوەی هەڵبژاردنی سیاسی، کە مرۆڤ هەم دەتوانێت وەکو جۆری سلوک وە هەم دەشتوانێت وەکو دەربڕینی بیروڕا وە یان هەڵوێست لێکی بداتەوە. بەم پێیە دەتوانین جۆرە هەمەچەشنەکانی کاریگەریی تەنها بە مانای چەقی قورسایی ڕیز بکەین، بەڵام نەک وەکو دیاردەی جیاواز لە یەکتر دایان ببڕین. لێرەدا ئەو بیروڕایە بە تەواوی و بە مانای ڕاستەقینە خۆی



گێرهارد مالێتسکه

دەسەپێنێت کە لە سایکۆلۆژیدا زۆرجار دووبارە دەکرێتەوە: لە هەرجێگایەک پەیوەندیە یەکگرتو و گونجاوەکان هەبن، ئەوا دروستکردنی چەمک، چوارچێوە بۆ دانـراو و سنوردار نابێت، بەڵکو هەمیشە و تەنها دەستنیشانکراو و ئاماژەپێدراو دەبـێـت. بـە لەبەرچاوگرتنی ئـەم گیروگرفتە هەوڵدەدەین کەتەلۆگێک بۆ جۆرەکانی کاریگەریی دروست بکەین.

لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە هەندێک پرۆسێس ئەکتیڤ دەکرێن کە دەبنە هۆی گۆڕان لە:

١- سلوک
٢- زانین
٣- بیروڕا و هەڵوێست
٤- بواری هەڵچوون (ئینفیعال)
٥- قوڵاییەکانی سایکۆلۆژی

بێجگە لەوانەش پێویستە کاریگەریە فیزیۆلۆجیەکانیش ناوبەرین، وەکو زیان گەیاندن بە چاو لە ئەنجامی سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە، خـەوزڕانـدن بەهۆی فلیمەوە یاخود بەرنامەی تەلەفزیۆنی، کارلێکردنی فلیم لەسەر سیستەمی عەسەبی، پەیوەندی نێوان ڕووداوی ناو فلیم و دەورەی خوێن، پاشتر هیلاک بوون و کەمبونەوەی توانا بەهۆی ئەوەی لە ئەنجامی سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە کاتی خەوتن سنوردار دەبێت... هتد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم بـوارە لە چوارچێوەی ئەم کارەمان دەچێتە دەرێ، ئێمەش بە یەکجاری وازی لێدەهێنین.

### ١ – کاریگەریەکان لە بواری سلوکدا:

بە دوو ڕێگا ماس کۆمونیکەشن کار لە سلوکی مرۆڤ دەکات:

ا- جارێکیان کە مرۆڤ، ئەوکاتەی دەبێتە ڕێتسپیێنتی ماس کۆمونیکەیشن، ڕوودەکاتە قسەکان، پێویستی بە کاتێکی دیاریکراو هەیە بۆ ئەم ڕووتێکردنە و بەم هۆیەشەوە بناغەی کاتی بێ ئیشی خۆی دەگۆڕێت،
ب- جارێکی تریان لە ڕێگای خودی قسەکانەوە، لە ڕێگای ناوەڕۆکەکانیانەوە دەتوانرێت لای ڕێتسپیێنت هەندێک جۆری سلوکی دیاریکراو ئەکتیڤ بکرێن.

ا- چونکە مرۆڤ بۆ ماس کۆمونیکەیشن کات سەرف دەکات، ماس کۆمونیکەیشنیش دەست دەبات بۆ بناغەکانی کاتی بێ ئیشی مرۆڤ. چونکە کاتی بێ ئیشی سنوردارە، بەرهەم و بواری پڕکردنەوەی کاتی بێ ئیشیش - بە لایەنی کەمەوە لە وڵاتە پیشەسازیەکاندا- زۆر و گەورەیە، مرۆڤ پێویستە لەسەری لەم بەرهەم و بوارانەدا هەڵببژێرێت. ئەو پێویستە لەسەری بڕیاری ئەوە بدات، بەشی ماس کۆمونیکەیشن لە کاتە بێ ئیشیەکەیدا چەندبێت وە بەم هۆیەشەوە بەشی هەر تاکە میدیایەک چەندبێت. وەکو لە بەشی سێهەمی ئەم کتێبەدا ئەوەمان ڕوونکردەوە، هەر تاکە میدیایەک لەسەر بناغەی ممیزاتە تایبەتیەکانی خۆی بە پێوانەی زۆر جیاواز لە یەکتر کاردەکاتە سەر سلوکی مرۆڤ: خوێندنەوە پێویستیی بە وریابوونێکی تـەواوی ڕێتسپیێنت هەیە، بە شێوەیەکی وا کە هەموو کاتە تەرخان کراوەکە بۆخۆی دەبات و هاوکات هیچ کارێکی تری

لەگەڵدا جێبەجێ ناکرێت. لە سینەمادا مرۆڤ بۆ کاتێکی دیاریکراو تەواو بەستراوەتەوە، بەڵام کاتە بۆ تەرخانکراوەکە لە چوارچێوەی سەرجەمی کاتی بێ ئیشیدا قورساییەکی زۆری نیە. لە بەکارهێنانی قەوانی دەنگاردا گوێگر دەتوانێت لە پاڵیدا خۆی بە کاری تریشەوە خەریک بکات. تاکو ماوەی چەند ئەو کارە دەکات و بەشی گوێگرتن لە قەوانەکەی لە کاتی بێ ئیشیدا چەندە، ئەوە ئاشکرا نیە. ڕادیۆ کاتێکی زۆر گەورە لە کاتی بێ ئیشی دەبات، بەڵام تەنها بەشێکی پرۆگرامەکان بە وریای و بێ جێبەجێ کردنی کارێکی تر لەوکاتەدا گوێی لێ دەگیرێت، کە کاتە بۆ تەرخان کراوەکە لێرەدا زۆر گەورەنیە. سەیرکردنی تەلەفزیۆن پێویستیەکی زۆری بە کاتی بۆتەرخانکراو هەیە لەلایەن ڕێتسپییێنتەوە، خۆ خەریککردن بە کاری ترەوە لێرەدا تەنها بە سنورێکی زۆر کەم بواری هەیە. جا چونکە لە سەیرکردنی تەلەفزیۆندا بەرهەمە پێشکەشکراوەکان زۆر هەمەڕەنگ و بە هەرزانی و ئاسانی دەستدەکەون، ئەم میدیایە بە ڕادەیەکی زۆر گەورە و بەهێز کار لە کاتی بێ ئیشی مرۆڤ دەکات. بۆیە ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە پرسیارکردن لە کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر سلوکی کاتی بێ ئیشی بە پێوانەیەکی زۆر گەورە و وەکو گیروگرفتێکی زۆر پەلە، تەنها بەهۆی بڵاوبونەوەیەکی زۆر خێرای تەلەفزیۆنەوە دروست بوو. بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوەی تازە بە دەوری ئەو پرسیارەدا دەسوڕێتەوە، چ کارێکی کاتی بێ ئیشی لەلایەن تەلەفزیۆنەوە پاڵی پێوە دەنرێت و جێگاکەی داگیردەکرێت و وە چۆن بەم هۆیەشەوە بناغەکانی کاتی بێ ئیشی دەگۆڕێن. لێرەدا ناتوانین بە دووردرێــژی باسی ئەنجامی یەکەبەیەکەیان بکەین. بە گشتی ئەو پێشبینیە پشتگیریی کرا کە لە پێش هەمووشتێکدا گوێگرتن لە ڕادیـۆ، چـوون بۆ سینەما وە تاڕادەیەکیش خوێندنەوە سنوردارادەبن، لە کاتێکدا هەڵسوکەوتی تر وەکو هیوایەت و وەرزش زۆر کەم وە یان هیچ کاریان تێناکرێت. ئەو پرسیارەی کە گرنگیەکی زۆری هەیە و تاکو ئێستاش ڕوون نەبۆتەوە ئەوەیە، چ جۆرە مەیلێک لەم کاریگەریانەدا پاش تێپەڕبوونی ماوەی زۆر دەردەکـەوێـت. لێرەدا پێویستە لێکۆڵینەوە میتۆدەییە زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێشەکانی بێلسۆن باس بکرێت، کە تیایاندا ئەوە دەسەلمێنێت، سەرەتا کاریگەریە زۆر گەورەکەی تەلەفزیۆن لەسەر کاتی بێ ئیشی بە تێپەڕبوونی ساڵ جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، ئەگەرچی زۆر بە هێواشی و بە شێوەی جیاواز لە بوارە هەمەڕەنگەکانی کاتی بێ ئیشیدا. ئـەوەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە ئەو پرسیارەیە، ئایا چۆن لای منداڵان و گەنجان ڕووکردنە هەر میدیایەک پەرە دەسێنێت وە چۆن بەم هۆیەوە بناغەکانی کاتی بێ ئیشی پەیوەند بە تایبەتمەندیەکانی تەمەنەوە دەگۆڕێت.

ب – لە زۆر حاڵەتدا گۆڕانی سلوک لە ڕێگای ناوەڕۆکی قسەوە کاری تێدەکرێت. وەکو بناغەیەک بۆ ڕیزکردنی ئەم جۆرە کاریگەریانە سیفەتەکانی مەبەستی کۆمونیکاتۆر بەکاردەهێنین:

بەپێی هەر مەبەستێک، ئەگەر کۆمونیکاتۆر بە قسەکانی خۆی بە وەعی و بەپێی پلانی داڕێژراو هەوڵ بدات کار لە سلوکی ڕێتسپیێنت بکات یاخود ئەگەر کاریگەریەکان بەبێ پلانی داڕێژراو و ویست و خواستی کۆمونیکاتۆر دروست ببن، ئەوا پێویستە جیاکردنەوە لەنێوانی گۆڕانی سلوک بە وەعی و بەبێ وەعی لە ڕێگای ناوەرۆکی قسەکانەوە بکرێت. ئەگەر کۆمونیکاتۆر بیەوێت بەپێی پلان و بە وەعیەوە کار لە سلوک بکات، ئەوا ئەمە دەکەوێتە بوارەکانی مەبەستی پێداگۆگی (پەروەردە)، سیاسی یاخود بازرگانیەوە.

لەژێر لایەنی پێداگۆگیدا کۆمونیکاتۆر دەخوازێت ڕێتسپیێنت بۆ نمونە بۆ کاری دەستیی، وێنەکێشان، درووماــان، خوێندنەوەی کتێبی باش، وەرزش و جومناستیک، بۆ وەڵامدانەوە... هتد بجوڵێنێت. یاخود قسەکان ئامۆژگاری دەگرنە خۆیان بۆ بنیاتنانی ژیان، بۆ خێزان، پەروەردەکردنی منداڵ، هونەری چێشتلێنان، پاکوتەمیزی... هتد. دەربارەی کاریگەری ئەم جۆرە هەوڵانە لە رووی ئەزمونیەوە زۆر کەم زانــراوە. هەندێک ئاماژە ئــەوە پیشان دەدەن کە منداڵ ئەو داواکردنانەی ئاڕاستەی کراون بۆ کردەوەی سەربەخۆ و دەست پێشخەریی، تەنها بەشێکی زۆر سادە و کەمیان جێبەجێ دەکەن، کەواتە تواناکانی پێداگۆگی ماس کۆمونیکەیشن لەم بوارەدا ئەوەندە گەورە نین وەکو ئەوەی مرۆڤ چاوەروانی لێدەکرد و هیوای پێ دەخواست.

ئامۆژگاریەکان چ کاریگەریەکیان هەیە بۆ بنیاتنانی ژیــان، ئــەمــەش دیــســانــەوە نزیکەی نــەزانــراوە، پەیمانگای لێکۆڵینەوەی بیروڕای گشتی لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی خوێنەر، لە کارلێکردنێکی زۆر گــەورە دەدوێــت: (ئەگەر لە ڕۆژنامەی constanze دا ئامۆژگاریەک هەبووبێت کە چۆن مرۆڤ دەتوانێت یەخەی دڕاوی کراسێک تازە بکاتەوە، ئەوا یەک ملیۆن ئافرەتی خوێنەری ئەو ژمارەیە ئەوەیان تاقی کردۆتەوە. ئامۆژگاریەک دەربارەی چۆنیەتی قەدکردنی دەسڕی نان خواردن لەلایەن یەک ملیۆن و نیو خوێنەری ئەو ژمارەیەوە جێبەجێ کراوە. چۆنیەتی ئەوەی مرۆڤ بە ڕاست و دروستیی خزمەتی منداڵی نەخۆش بکات لە جێگادا، حەوسەد هــەزار خوێنەر بەپێی ئامۆژگاریەکانی ڕۆژنامەی constanze جوڵاونەتەوە. نزیکەی دوو ملیۆن خوێنەر چەند ڕۆژێک یاخود چەند هەفتەیەک هەموو سەعاتێک پێنج دەقیقە قاچیان بەرزکردۆتەوە بۆ سەرەوە چونکە ئەمە لە ڕۆژنامەی constanze دا نوسرابوو).

لە بواری سیاسیدا ماس کۆمونیکەیشن بە زۆری بۆئەوە بەکاردێت، داوا لە ڕێتسپیێنت بکرێت بۆ پیشاندانی جــۆری سلوکێکی دیاریکراو، بۆ دەست لەکارکێشانەوە، کۆبونەوە، خۆپیشاندان و شەڕکردنی کۆمەڵە خەڵکانی دین و نەتەوە جیاواز، بۆ نەکڕینی بەرهەم یاخود پچڕاندنی پەیوەندیی بە کارگەوە... هتد. کاریگەریی ئەم جۆرە داواکاریانە تاکو ئێستا زۆر کەم لێیان کۆڵراوەتەوە. دەنگدان لە هەڵبژاردنی سیاسیدا بوارێکە کە زۆر چڕوپڕ لێی کۆڵراوەتەوە، مرۆڤ بەگشتیی وای بۆدەچێت کە ئەمە بریتی نیە لە جۆری سلوک بەڵکو دەچێتە خانەی دەربڕینی بیروڕا و هەڵوێستەوە.

مەبەستی بازرگانیی لە خانەی ڕیکلامدایە کە بەزۆریی ماس میدیا بۆخۆی بەکاردەهێنێت بۆئەوەی ڕێتسپیێنت بۆ سلوکێکی کڕینی دیاریکراو ڕابکێشێت. جا چونکە بۆ ئەم مەبەستە پــارەی یەکجار زۆر خەرج دەکرێت، کە پێویستە بە ڕێژەیەکی گونجاو

لە بەرامبەر سەرکەوتنەکەدا بوەستێتەوە، خاوەن ڕیکلامەکان گرنگیی زۆر بە لێکۆڵینەوەی ڕاست و دروست و بێگومانی کاریگەریی دەدەن. بۆ نمونە زۆر لێکۆڵینەوە لەبەردەست دان دەربارەی کاریگەرییەکی ڕێژەیی ڕیکلامی ڕادیـۆ و تەلەفزیۆن، دەربـارەی کاریگەریی ڕیکلام لە پرۆگرامەکانی ڕادیـۆدا بۆ منداڵان، دەربارەی کاریگەریە گشتیەکانی ڕیکلامی تەلەفزیۆن، دەربارەی توانای کاریگەریی ڕیکلامی ماوە درێژ و جۆراوجۆر لە تەلەفزیۆندا، دەربارەی چەندین جۆری تەکنیکی ڕیکلام لە تەلەفزیۆندا، دەربارەی کاریگەریی تێکستەکانی ڕیکلام... هتد. پاشتر پێویستە لێرەدا ناوی لێکۆڵینەوە مەیدانیە گەورە و فراوان و نرخ گرانەکانی NBC و دامەزراوە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیە ئەمریکیەکانی تریش بهێنین.

ئەوەندەی ئەم کارانە دەربارەی ڕیکلام لە واقیعدا ڕوون و ئاشکرا و تـەواو دەردەکـــەون، ئەوەندە نرخە مەعریفەییەکان بۆ سەرجەمی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بەرز نانرخێنرێت. جارێک پرسیارەکان تەواو ئاراستەی بەکارهێنانە عەمەلیەکان کراون لە جۆرێکی زۆر تایبەتی و لەبەرئەوەش بۆ بوارەکانی تر تەنها لە سنورێکی دیاریکراودا گرنگن، جارێکی تر مەرجە سایکۆلۆژیەکان لای ڕێتسپییێنت شێوەیەکی ترن جیاواز لەوەی ناو ڕیکلامەکە. بەم شێوەیە بەپێی بیروڕاکانی کلاپەر کاریگەریە تارادەیەک گەورەکەی قسەکانی ڕیکلام لە ماس کۆمونیکەیشندا لەوێدا بناغەی بۆ دانراوە، کە قسەکان تەنها زۆر کەم خۆیان لە ئاستی کەسەکان و کۆمەڵ دەدەن، چونکە گەر وانەبێت دەبنە هۆی لاوازکردنی کاریگەریەکان یاخود بێ لایەن کردنیان، بۆ نمونە وەکو هەبونی هەڵوێستی سەرەتایی، پێوەر گروپێک... هتد.

بـە پـێـچـەوانـەوە لێکۆڵینەوەیەکی لـە ڕووی پسیکۆلۆژیەوە زۆر گرنگ هەیە کە لە ڕاستیدا ئەویش هەر دەکەوێتە ژێر چەمکی ڕیکلامەوە بەڵام بەکارهێنانەکەی بەوجۆرە ڕاستەوخۆیە دانەنراوە: کـارە سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیە چڕوپڕەکەی مێرتۆن دەربارەی پڕۆگرامە ڕادوییەکەی CBS لە ڕۆژی ٢١ سێپتەمبەری ١٩٤٣دا بۆ کۆکردنەوەی کۆمەکی جەنگ. لێکۆڵینەوەکە ڕوون و ئاشکرا دەریدەخات کام فاکتۆر و توخمانە - لەبارترین مەرجی گونجاو لای جمهور، بەکارهێنانی زیرەکانەی ئەستێرەی ڕادیۆ کاتە سمیث، بانگەوازی مەبەستدار و بە ئامانج... هتد- بوونە هۆی ئەوەی کە گوێگران لە ماوەی ١٨ سەعاتدا ٣٩ ملیۆن دۆلار ببەخشن.

بەگشتیی ئـەو هـەوڵـی گـۆڕانـی سلوکانە بە مەبەستەوە لەلایەن کۆمونیکاتۆرەوە، تائێستا کەم لێیان کۆڵراوەتەوە، هەروەها لە ڕووی تیۆریشەوە ئەو پرۆسێسانەی کە بەم هۆیەوە ڕوودەدەن بە هیچ جۆرێک تـەواو ڕوون نەکراونەتەوە. یەکێک لە بـیـروبـاوەڕە هـەرە گرنگەکان بـەم ئـاکـارەدا لێکۆڵینەوەکەی کارت ڕایتە دەربارەی ئەگەرەکان و سنورەکانی هەڵمەتی سیاسی. کارت ڕایت بە شیکاریەکی سیستەمیانە لەو مەرجانە دەکۆڵێتەوە کە پێویستە جێبەجێ بکرێن بۆئەوەی بە هۆیانەوە بتوانرێت جۆری سلوکێکی دیاریکراو لەلای زۆربەی کۆمەڵانی خەڵک ئەکتیف بکرێت. بیروباوەڕەکە کە لێرەدا بەشێکی لە چاودێریە ئەزمونیەکان و بەشێکی تریشی بە شێوەی هەڵێنجان لە زانیاریە سایکۆلۆژیە گشتیەکانەوە وەردەگیرێت، کارت ڕایت بەم شێوەیە باسیان دەکات:

١ — قسەکە پێویستە لەلایەن ئەو کەسانەوە بە وەعیەوە وەربگیرێت، کە پێویستە کاریگەریان لێبکرێت.

٢ — قسەکە پێویستە لەلایەن ڕێتسپیێنتەوە وەکو بەشێکی سترکتوری خودی خۆی قبوڵ بکرێت. قسەکە لەگەڵ سترکتورە سەرەتاییەکانی خوددا یەکسان و جووت نەبێت، ئەوا یان ڕەت دەکرێتەوە وە یاخود دەگۆڕدرێت بۆئەوەی یەکسان بێت، وە یان گۆڕانێک لە سترکتورەکانی خوددا ڕوودەدات.

٣ — ئەو جۆری سلوکە کە مرۆڤ دەیەوێت لای ڕێتسپیێنت دروستی بکات، پێویستە لەلایەن ئەوەوە وەکو ڕێگایەک بۆ ئامانجێکی خوازراوی خۆی بناسرێتەوە و قبوڵ بکرێت.

٤ — بۆئەوەی کردەوەیەک بخرێتە گەڕ پێویستە سلوکی ڕێتسپیێنت لەلایەن سیستەمێکی پاڵ پێوەنەری گونجاوەوە کۆنترۆڵ بکرێت کە لە حاڵەتێکی دیاریکراودا ڕێتسپیێنت بۆ کردەوە خوازراوەکەی بجوڵێنێت.

ئەگەر ئەمانە ئەو جۆری سلوکانە بن کە لەلایەن کۆمونیکاتۆرەوە بە وەعی و پلانەوە هەوڵیان بۆ دەدرێت، ئەوا لە پاڵ ئەمانەشەوە ڕیزێک لە جۆی سلوک هەن - بە لایەنی کەمەوە تاڕادەیەک - کە لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە کاریان لێدەکرێت یاخود دروست دەکرێن، بەهێز دەکرێن یاخود جیادەکرێنەوە، بێ ئەوەی کۆمونیکاتۆر ئەم کاریگەریانەی مەبەست بووبێت.

ئەم کاریگەریە نەخوازراوانە دێنە پێشەوە بۆ نمونە ئەگەر ڕێتسپیێنت سلوکی کەسایەتیە خەیاڵیەکان لە کردەوە دراماتیکیە بەهێزەکانیاندا، بەڵام هەروەها کۆمونیکاتۆرە واقیعیەکان وەکو مایستەرەکانی وتوویژ و پرسیار و وەڵام، کەسانی کۆمێدی، کەسانی قسەزان و بێژەر... هتد لاسایی بکاتەوە. گیروگرفتەکە تازە نیە: لەبارەی (ڤێرتەر) ی گۆتەوە دەوترێت کە بۆتە هۆی خۆکوشتنی زۆر خوێنەر. بەڵام بە دڵنیاییەوە کاریگەریی فراوانی سلوکی لاسایی کردنەوە لە ئەنجامی ماس کۆمونیکەیشنی مۆدێرنەوە بەبێ شک زۆر گەورەترە وەک لە سەردەمانی پێشوو. ژمارەیەکی زۆر لە ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوە و مناقەشە، چەندین ساڵە خۆیان بەم بابەتەوە خەریک کردوە، دەربارەی لاسایی کردنەوە لە جلوبەرگ، قژبڕین، ڕۆیشتن، جوڵەی لەش، قسەکردن، مامەڵەکردن لەگەڵ دایک و باوک و برادەر، لە حاڵەتی هەست وروژاندنی سێکسیدا... هتد، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەم لەو بارەیەوە دەزانین کە ئایا وە لەژێر چ مەرجێکدا ئەم کاریگەریانە پەیوەندیان بە کۆپیکردن بە وەعیەوە یاخود پرۆسێسەکانی ناسینەوەی خود بەبێ وەعی هەیە، تا چ ڕادەیەک و بە چ هێزێکەوە بەردەوام دەبن، کام گروپانە بەتایبەتی دەگرێتەوە... هتد. کارێکی پوخت و ڕێکوپێک لەسەر ئەو ماتریاڵانەی لە بەردەستدان هەروەها لێکۆڵینەوەی ئەزمونی بە میتۆدە مۆدێرنەکان پێویستیەکی زۆر گەورەیە.

بۆ سەر ئەو کاریگەریە مەبەست نەخوازراوانەی کۆمونیکاتۆر ئەو حاڵەتانەش دەژمێردرێن کە تیایاندا میدیایەک سەرنج بۆلای میدیایەکی تر ڕادەکێشێت، بۆ نمونە ئەگەر فلیم و کتێب لە هەمان بابەت بدوێن و داوا لە بینەرانی سینەما بکرێت بۆ خوێندنەوە وەیان خوێنەر بۆ چوونە سینەما. هەروەها لە تەلەفزیۆنیشدا ئەم کاریگەریە بە زۆر شێوە دەبینرێت، لە پێش هەمووشتێکیشدا ئەو چیرۆکە هەڵقەییانەی لە کتێبەوە وەرگیراون.

گیروگرفتێک کە بۆ ماوەیەکی زۆر بە چڕیی مناقەشەکرا و زۆرجاریش یەک لایەنی وەکو هۆ و ئەنجام لێکدەدرایەوە بریتیە لە کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر تاوانکاریی گەنجان.

هەروەکو لێکۆڵینەوەی قسە بە چەندین شێوە پشتگیریی کردوە، قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن بەشێکی یەکجار زۆر لە باسی تاوان و شەڕانگێزی و زەبروزەنگ دەگرنە خۆیان. کەواتە ئەو بیروبۆچونە ئەگەری هەیە کە ئەم قسانە لەسەر جۆری سلوکی ڕێتسپییێنت، لەپێش هەمووشیاندا گەنجانی نەخەملّیو و نەچەسپاو کاریگەریی خراپیان هەبێت، ئەم بیروباوەڕە لێڵ و تێکەڵ و پێکەڵە دەربارەی ئەو پەیوەندیانە، کلاپەر لە شەش خاڵی سەرەکیدا کۆی کردونەتەوە، قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن بە باسی تاوان و زەبروزەنگەوە لەوانەیە – وای دادەنێین – ١ – بە شێوەیەکی زیان بەخش بن ٢ – ڕاستەوخۆ لاساییان بکرێتەوە ٣ – ببنە قوتابخانەیەک بۆ تاوانکاری ٤– لە هەندێک حاڵەتی تایبەتیدا لای خەڵکانی ئاسایی کردەوەی زەبروزەنگ یاخود تاوانکاری دروست بکەن ٥ – نرخی ژیانی مرۆڤ کەم بکەنەوە ٦ – ببنە هێزێکی پاڵپێوەنەر بۆ توڕەیی و شەڕانگێزی. ئەگەر مرۆڤ لەپێشدا وای بۆ چوبێت کە قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن ڕاستەوخۆ دەگۆڕێن بۆ سلوکی تاوانکاریی، ئەوا پێویست بوو لەسەری ئەم بۆچوونە زۆر سادەیە بە زوویی چاوپیابخشێنێتەوە: مرۆڤ گەیشتە ئەوەی لەنێوان کاریگەریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا جیـاوازیـی هەست پێبکات. ژمـارەیـەکـی زۆری لێکۆڵینەوەی ئەزمونی و قووڵ بوونەوەی هەمیشە زیاتر لە پرۆسێسە ئاڵۆزەکانی ماس کۆمونیکەیشندا بوونە هۆی ئەو بیروڕا زۆر قبوڵکراوەی ئەمڕۆ کە پەیوەندیی هۆ و ئەنجامی ڕاستەوخۆ لەنێوان قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن و تاوانکاریی گەنجاندا بەبێ بەشداری کاریگەریی زۆر فاکتۆری تر بونی نیە، کەواتە هۆیە ڕاستەقینەکانی تاوانکاریی گەنجان بە سادەیی وەکو تاکە کردەوە تاوانکاریەکان بە هیچ جۆرێک بە تەنها لە قسەکاندا نیە تەنانەت ناکرێت بە تەنها لەواندا بە دوایاندا بگەڕێین، بەڵکو بە دەرەجەی یەکەم لەلای خودی ڕێتسپییێنت، لە ئامادەیی و بیرکردنەوەی کەسایەتیدا. لەسەر بناغەی ئەم زانیاریە، مناقەشەکە دەربارەی بابەتی (ماس کۆمونیکەیشن و تاوانکاری گەنجان) پاش ئەوەی جارێکی تر بەهۆی تەلەفزیۆنەوە پەرەی سەندەوە، لەم سەردەمەی دواییەدا ئەو توندوتیژیەی جارانی نەما.

حاڵەتێکی شازی چڕوپڕ لێکۆڵراوەی کارتێکردن لە سلوک بەبێ مەبەست، بریتیە لەو ترس و لەرزەی لە ڕۆژی ٣٠ ئۆکتۆبەری ١٩٣٨ لە ئەمریکا بەهۆی پرۆگرامی CBS وە (the war of the worlds) لەناو خەڵکدا بڵاوبوەوە. لێکۆڵینەوەکەی کانترلیس دەربـارەی ئەم حاڵەتە ڕوونکردنەوەیەکی یەکجار زۆری سایکۆلۆژی پێشکەش دەکات، دەربارەی هۆیە نادیارەکانی پشتەوە کە بوونە هۆی ئەم کاردانەوە چاوەڕوان نەکراوە، دەربارەی کاتی بیستنەکە لای گوێگران، جۆرەکانیان و دافعەکانیان، دەربارەی حاڵەتە تایبەتیەکەی سیاسەتی نێودەوڵەتی کە تا ڕادەیەکی زۆر دەوری تێدابینی... هتد.

## ٢ – کاریگەریەکان لە بواری زانیندا:

هیچ شکێک لەوەدا نیە کە مرۆڤ لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە زانینی خـۆی زیـاد دەکـات، کە زانـیـاری و ڕووداوی واقعی و لێکدانەوە و ڕوونکردنەوە وەردەگرێت، بە کورتی (فێردەبێت). هەر لەبەرئەوەش مەسەلەکە لێرەدا زۆر بە دەگمەن بریتیە لە لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بۆئەوەی بسەلمێنرێت کە زانین پێشکەش ڕێتسپییێنت

دەکرێت، بەڵکو لە بناغەدا مەسەلەکە بریتیە لەو پرسیارە زۆر فـراوان و چڕ و ئاڵۆزە، چەند وە چی فێردەبێت وە لەژێر چ مەرجێکدا ڕێتسپیێنت قسەیەکی تایبەتی باشتر و یەکێکی تر کەمتر بە وەعیەوە وەردەگرێت و لای خۆی دەیهێڵێتەوە. کەواتە لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەمڕۆ یەک لایەنی خۆی بەوەوە خەریک دەکات، ئەو فاکتۆر و کاتانەی لە پرۆسێسی پێشکەش کردنی زانیاری و توانای خەزن کردن و هێشتنەوەدا بەشدارن، بیدۆزێتەوە، نزیکەی وەکو پەیوەستبوونی ئەو پرۆسێسە بە ناوەڕۆک و جۆری پێشکەش کردنی قسەکەوە، بەو میدیایەوە کە پێشکەشی دەکات، بە ممیزاتی کەسایەتی و سۆسیالی خودی ڕێتسپیێنتەوە، بە تەمەنیەوە، بە توخمەکەیەوە (نێر و مێ)، بە زیرەکی و ئاستی خوێندەواریەوە... هتد، بە سەربوون بە گروپێکی ئارەزوومەند لە زانیاری، بە پەیوەندی نێوان قسەکە و بیروڕا سەرەتاییەکانی ڕێتسپیێنتەوە، کەواتە بەو ئاستەوە کە تیایدا قسەکە لەگەڵ چاوەڕوانیەکانی ڕێتسپیێنتدا، لەگەڵ ئارەزوەکانی و هەڵوێستەکانیدا، لەگەڵ ئامادەگی ناسینەوەی خودی خۆیدا، لەگەڵ ڕادەی تێکەڵ بوون و هەست بە هاوبەشی کردنیدا... هتد لە هەمەئاهەنگیدایە یاخود لە نەشازیدایە. بەم هۆیەشەوە پرۆسێسی وەرگرتن و هێشتنەوە (هەروەها بیرچوونەوە)ی زانیاری وەکو تەفاعلێکی تایبەت بە خود لێکدەدرێتەوە کە بە پێوانەیەکی زۆر گەورە لە ڕێگای ئەم هەموو فاکتۆرانە و زۆری تریشەوە ئاراستە دەکرێت.

هەموو گەیاندنی زانیاریەکان لە ڕێگای ماس میدیاوە دەتوانرێت لە دوو بەشی گەورەی جیاوازدا دابنرێن، بەپێی هەرکامێکیان، ئایا مـاددەی زانینەکە بۆ ڕێتسپیێنت لە چوارچێوەی پەروەردەکردنی ڕەسمیدا یاخود لە دەرەوەی دامـەزراوە فێرکاریەکاندا لە پەروەردەکردنی ناڕەسمیدا ئامادە دەکرێن و فێری دەکرێن.

بەکارهێنانی مـاس میدیا لە پـەروەردەکـردنـی ڕەسمیدا، کـەواتـە لە قوتابخانەکان و هەموو هاوشێوەکانی و فۆرمەکانی تریدا، لە دامودەزگاکانی فێرکردنی کەسانی گەورەدا، بریتیە لە بوارێکی زۆر تایبەتی کە لێکۆڵینەوە زانستیەکەی بە دەرەجەی یەکەم دەکەوێتە خانەی پێداگۆگیکەوە (زانستی پـــەروەردە) بـەڵام تاڕادەیەکیش سایکۆلۆژیەوە (نفسی). گیروگرفتە سایکۆلۆژیەکان لەپێش هەموو شتێکدا لە لێکۆڵینەوەی پرۆسێسی فێربووندا دەردەکـەون بەڵام نەک لە پرسیارکردن دەربارەی کاریگەریەکانی مـاس کۆمونیکەیشن لە وانـەدا (دەرس). لێرەدا ئەمڕۆ سەرنجدانەکە لەپێش هەموو شتێکدا لەسەر کاریگەریە ڕێژەییەکەی میدیا ئاودیۆڤیژۆێلەکان (میدیاکانی دەنگ و وێنە) چڕبۆتەوە، هەروەها لەسەر توانای کاریگەریی ئەم میدیایانە بە مقارەنە لەگەڵ وانەوتنەوەی تەقلیدی ناو پۆلەکان لەلایەن مامۆستاوە. بە تەنها دەربارەی کاریگەریی ڕێژەیی وانە وتنەوە لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە هەروەها لە ڕێگای مامۆستاوە نزیکەی ٤٠٠ لێکۆڵینەوەی ئەزمونی لە بەردەستدا هەن کە زۆربەیان گەیشتونەتە ئەم ئەنجامە: ٪٦٥ ی ئەم کارانە هیچ جیاوازیەک لە توانای فێرکردندا بەدی ناکەن (بەپێی پێوانی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان یان تاقیکردنەوە ئاساییەکان) ٪١٤ وانەکە لە ڕێگای مامۆستاوە کاریگەرتر بوە، ٪٢١ لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە کاریگەرتر بوە. تەلەفزیۆن بەتواناترە لە پێش هەمووشتێکدا لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا، کاریگەریەکەی لە وانەی زانستە سروشتیەکان و

پەروەردەی نیشتیمانیدا گەورەترینە، پاش ئەوان وانەی زمان وە پاشتر بە ئاستی جیاواز وانەکانی تر. قوتابیەکانی قۆناغی سەرەتایی، تەلەفزیۆن وەکو هۆی وانەوتنەوە لە بەرزترین ئاستدا دەنرخێنن، لەگەڵ بەرزبوونەوەی تەمەندا ئاستی نرخاندنەکە بەرەو خـوارەوە دێـت. هەروەها مامۆستاکانیش تەلەفزیۆن لە وانەدا لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا لە پۆزەتیڤترین ئاستدا دەنرخێنن.

ئێمە لـێـرەدا ناتوانین دەربـارەی یەکەیەکەی گیروگرفتەکانی کاریگەریی فێرکردن لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە لە پەروەردەکردنی ڕەسمیدا بدوێین. سەرجەمی بوارەکانی بابەتەکە – وەکو کلاپەر جەختی لەسەر دەکات– پێویستی بە کارێکی بەرفراوانی پوخت و تایبەتی هەیە.

ئەوەی بەڕاستیی گیروگرفتی زۆری تێدایە بریتیە لە لێکۆڵینەوەی کاریگەری لە بواری ناڕەسمیدا کەواتە پەروەردەکردنی دەرەوەی دامودەزگا. ئەو گیروگرفت و بەرهەڵستیانەی لێرەدا سەرهەڵدەدەن، دەتوانرێت لەوێدا دەستنیشان بکرێن کە پرۆسێسی تێگەیشتن بە وەعیەوە، نزیکەی بە پەنهانی و بەبێ سنوری ئاشکرا و دیار ڕووەو کاریگەریکردن لە هەڵوێست دەڕوات، کە زۆربەی جار ناتوانرێت بە ڕوونی بڕیار لەسەر ئەوە بدرێت کە ئایا هەندێک کاریگەریی تایبەتیی بۆ نمونە وەکو گۆڕان لە حەز و ئارەزوو و چێژوەرگرتندا وەکو پرۆسێسی زانین یاخود هەڵوێست بژمێردرێت. بێجگەلەوەش هەردوو بوارەکە، ئەگەرچی تاڕادەیەکیش دەتوانرێت لە یەکتر جیابکرێنەوە، بە شێوەیەکی فراوان وەزیفی لەگەڵ یەک پەیوەستن: هەڵوێست نەخشی لەسەر پرۆسێسی فێربوون هەیە، وە بەگەیاندنی زانین هەڵوێستیش زۆرجار دەگۆڕێت. لەسەر بناغەی ئەو



گۆتە

توخمە زۆر چڕوئاڵۆزانە و بەشدار لەو کاریگەریەدا، ئەم پەیوەستیە وەزیفیانە هەمیشە دەرناکەون: وەکو زۆرێک لە لێکۆڵینەوە پیشانمان دەدەن، زۆرجار کاریگەریی فێربوون دەتوانرێت بە ئاسانی بپێورێت و مراقەبە بکرێت، بەڵام بەبێ گۆڕانە داخوازی کراو و چاوەڕوان کراوەکانی هەڵوێست.

لـەگـەڵ ئـەوەشـدا کـە ژمـارەیـەکـی یەکجار زۆر لێکۆڵینەوەی ئەزمونیی هەن، هەندێکیان لە فۆرمی تاقیکردنەوەی لابۆردا و هەندێکی تریشیان لە فۆرمی لێکۆڵینەوەی مەیدانیی دوورودرێـژدا، لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی زانیاریە ئەزمونیەی کاریگەریدا هەتا ئەمڕۆ هێشتا هەر هیچ وێنەیەکی ڕوونی مەدا و جۆر و ئاراستەی کاریگەریی زانینی ناڕەسمی لە ڕێگای

ماس کۆمونیکەیشنەوە دیار نیە. لێکدانەوەیەکی بە نرخی پرۆسێسەکانی فێربوون لە تەلەفزیۆندا وە ئاماژەکردنیش بەوەی کام ئەرکانە لەم حاڵەتەدا دەکەونە سەرشانی لێکۆڵینەوە، هەر سێ زانا شرام، لیلێ وە پارکەر پێشکەشمانی دەکەن. بۆ نمونە ئەوە پێویست دەبێت جیاکردنەوە لەنێوان ئەو کاریگەریی زانینانەدا بکرێت کە تیایاندا ڕێتسپییێنت بە خواستی خۆی مەبەستێتی ئاستی زانینی بەرزبکاتەوە، کەواتە فێرببێت، وە لەلایەکی ترەوە ئەو گەیاندنی زانینانەی بەبێ خواست و مەبەستی ڕێتسپییێنت تەنها بە لاوەکی دروست دەبن. شرام و هاوکارەکانی ئاماژە بەوە دەدەن کە لە ماس کۆمونیکەیشندا بەگشتی و لە تەلەفزیۆندا بەتایبەتی ئەم فۆرمەی دوهەمی گەیاندنی زانینە زۆر گەورە و باڵادەستە، ئەم فێربوونە لاوەکیە - بە شێوەیەکی سەرەکی بە هۆی گیروگرفتی چۆنیەتی بەکارهێنانی میتۆدەوە - نزیکەی تائێستا لێی نەکۆڵراوەتەوە.

گۆشەڕوانینی بە پێز و کەڵکدار بۆ ڕوونکردنەوەیەکی تیۆریانە - پێداگۆگیانەی ماس کۆمونیکەیشن دەتوانرێت لەو ڕێگایەوە دروست بکرێت کە مرۆڤ ئەو دوو بەشەی زانین بە مەبەست و زانین بەبێ مەبەست ببەستێتەوە بە هەردوو چەمکی دوانەی پەروەردەکردنی بە مەبەست و پەروەردەکردنی وەزیفیەوە، بەم هۆیەوە مرۆڤ چوار خانەی بناغەیی دەست دەکەوێت کە دەتوانن وەکو هەیکەلێک بۆ لێکۆڵینەوەی ئەزمونیی - پێداگۆگی ماس کۆمونیکەیشن بەکەڵک بێن.

گیروگرفتێک کە سایکۆلۆژی ئەزمونی و کۆمەڵ لە دەیان ساڵەوە پێوەی خەریکە، کە بەڵام لە بواری گەیاندنی زانیندا لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە تائێستا تەنها زۆر کەم و ناتەواو و کەموکوڕ لێی کۆڵراوەتەوە، لەو پرسیارەوە دروست دەبێت دەربارەی کات بەسەرچوون بەسەر کاریگەریی فێربوندا، کەواتە دەربارەی هەڵگرتن و هێشتنەوە و کەم و زۆریی بیرچوونەوەی زانیاریە گەیەندراوەکان لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان خۆیان تەنها بە کاریگەریی قسەکانەوە خەریک دەکەن ڕاستەوخۆ پاش ناردنیان. تەنها بەشێکی زۆر کەمیان نەبێت خۆیان بەوەوە خەریک دەکەن، تا ماوەی چەند شتە فێرکراوەکە هەڵدەگیرێ وە بە چ قەبارەیەک وە چ شتێک بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵدەگیرێت و چ شتێک بیر دەچێتەوە. بۆ سەرجەمی پرۆسەی فێرکردن ئەم پرۆسێسی هەڵبژاردنە زاتیە گرنگیەکی یەکجار گەورەی هەیە. لە لێکۆڵینەوەی ئەمەدا مرۆڤ پێویستە لەسەری لەپێش هەمووشتێکدا ئەوە بپشکنێت، ئایا لە چ فۆرمێکدا وە لەژێر چ مەرجێکدا ئەم پرۆسێسانە لە ڕێگای حاڵەتێکی تایبەتی ماس کۆمونیکەیشنەوە دەتوانرێت چاکتر بکرێن.

پاشتر ئەو شتەی کە نزیکەی بە هیچ جۆرێک لێی نەکۆڵراوەتەوە چونکە بەکارهێنانی میتۆدە بۆی یەکجار قورس و گرانە، بریتیە لە گیروگرفتی کۆبونەوە و زۆربونی کاریگەریی لەکاتی فێربوندا لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە. لە ڕاستیدا هیچ کەسێک شکی لەوەنیە کە بەکارهێنانی ئەو دووبارەکردنەوە نەخوازراو و زۆرجاریش بەمەبەست و پلانەوەی هەمان ماددە، کاریگەریەکان زیاد دەکەن، بەڵام دەربارەی قەبارە و بەڕێوەچوونی کاریگەریەکان زۆر کەم زانراوە.

حاڵەتێکی تایبەتیی فێربوون، کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر زمان پیشانمان دەدات. لە ڕاستیدا هیچ شکێک لەوەدانیە کە وشەی چاپکراو

لە کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار و هەروەها بەهەمان شێوەش وشەی وتراو لە فلیم و ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا بەشداریەکی گـەورە لـە دروستکردنی فۆرمی قسەکردنی بازنەیەکی گەورەی کۆمەڵدا دەکەن. بەڵام لێرەدا مرۆڤ بێجگە لە چەند فەرەزیەیەکی گشتی نەیتوانیوە زۆر دوور بڕوات. ئەو چەند کارە ئەزمونیە کەمانەش دەربـارەی ئەم بابەتە خۆیان لەپێش هەمووشتێکدا بە کاریگەریی تەلەفزیۆنەوە لەسەر دەوڵەمەندکردنی منداڵان بە وشە خەریک دەکەن. پاش ئەوە تەلەفزیۆن لەژێر هەندێک مەرجی دیاریکراودا کاریگەریی لەسەر زمان فێربوونی منداڵان هەیە. بەپێی شرام و هاوەڵەکانی، پێشکەوتنی فێربوونی وشە لای ئەو منداڵانەی تەلەفزیۆنیان هەیە بە مقارەنە لەگەڵ ئەو منداڵانەی تەلەفزیۆنیان نیە لە ساڵەکانی سەرەتای خوێندندا نزیکەی ساڵێک دەبێت. ئەم کاریگەریە بەتایبەتی لای ئەو منداڵانەی زیرەکیەکی سەرو ئاسایی هەروەها خوار ئاساییان هەیە گەورە و دیارە، بەڵام نەک لای ئەو منداڵانەی زیرەکیەکی ئاساییان هەیە. بەڵام ئەم جیاوازیانە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵی خوێندندا نامێنن.

بەشێوەیەکی گشتی دەربارەی گەیاندنی زانین لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە زۆر هەوڵ و تێکۆشان لەبەردەستدا هەن، بەڵام بەشێکی زۆری گیروگرفتە سەرەکیەکان تەنها لە هەنگاوەکانی یەکەمدا پشکنراون و لێیان کـۆڵـراوەتـەوە. لێرەدا کاتی ئەوە هاتوە بناغەیەکی بەهێز بۆ لێکۆڵینەوەکانی پاشەڕۆژ دابنرێت لە ڕێگای هەوڵدانێکی تیۆریانەی بەرفراوانەوە لەسەر فێربوون و پرۆسێسەکانی هێشتنەوە و هەڵگرتن لەژێر مەرجە تایبەتیەکانی ماس کۆمونیکەیشندا. لەگەڵ ئەوەشدا پشکنین لەسەر ئەوە بکرێت تا چ ڕادەیەک خاڵە جیاوازەکانی ئەم تیۆری فێربونە دەگونجێت بۆ وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارە تایبەتیانە.

## ٣ – کاریگەریەکان لە بواری بیروڕا و هەڵوێستدا:

دەربـارەی کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر بیروڕا و هەڵوێستی ڕێتسپیێنت ژمارەیەکی بێ شوماری لێکۆڵینەوەی زانستیی لەبەردەستدا هەن. کلاپەر لە بەرهەمەکەی خۆیدا دەربــارەی ماس کۆمونیکەیشن ئەم گیروگرفتە بەرفراوان و پڕ لە لق و چڵەی بە تێر و تەسەلی بەپێی تازەترین ئاستی لێکۆڵینەوە باس کردوە و تاوتوێ کردوە، کە ئێمەش لێرەدا بەکورتیی لە زۆر جێگادا کەڵک لەو کتێبە وەردەگرین. بۆ ئێمە ئەوەندە بەسە کە گیروگرفتە سەرەکی و جەوهەریەکانی ئەو بوارە لە ڕەگوڕیشەوە دەست نیشان بکەین و لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر ئەو پرسیارانە تاوتوێ بکەین کە لێکۆڵینەوەکانی پاشەڕۆژ پێویستە لەسەریان وەڵامیان بدەنەوە.

لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی ساڵەهای ساڵدا تاکو ئێستا ئـەوە هەر جێگای مشتومڕە کە وشەکانی بـیـروڕا و هەڵوێست چ مانایەک دەبەخشن وە چۆن بتوانرێت ئەم دوو چەمکە لە یەکتر جیابکرێنەوە. وەکو دەردەکەوێت ئەم دوو دیاردەیە خزمایەتیەکی ئەوەندە نزیکیان لەگەڵ یەک هەیە کە لە حاڵەتێکی زۆر کۆنکرێتدا بە زەحمەت بتوانرێت سیفەتی ڕوون و ئاشکرا بۆئەوە بدۆزرێتەوە کە ئایا لێرەدا مەسەلەکە بیروڕایە یاخود هەڵوێستە. هەربۆیەشە زۆرجار ئەو پرسیارە کراوە کە ئایا هەر لە بناغەدا شتێکی سودبەخش و بە ئامانجە لێرەدا دوو چەمک لە تەنیشت یەکترەوە بەکاربهێنرێن. بەڵام زۆربەی زانا سۆسیالەکان تەواو

بڕوایان بەوە هەیە. هەردوو دیاردەکە لە ناوەڕۆکدا لە یەکتر جیابکەینەوە، ئەگەر تەنانەت وەکو چەند بەشێکی جیاوازی یەک پرۆسێسی یەکگرتوی بۆچوونی مرۆڤایەتیش بێت بۆ شت و مەک، کەسەکان، پەیوەندیەکان و ڕووداوەکان: لەکاتێکدا بیروڕا زیاتر سروشتی دەربڕینێکی دەرەکی هەیە کە نیسبیا دەتوانرێت بە ئاسانی بە قسەکردن بکرێت و تەنها نیسبیا هێزێکی پاڵپێوەنەری بچووک بۆ کردەوە پیشان دەدات، پێویستە لە هەڵوێست وەکو دەربڕینێک تێبگەین کە زۆر قووڵتر لە کەسایەتی مرۆڤدا چەسپیوە و بە پێوانەیەکی گەورە لەگەڵ بوارەکانی تری کەسایەتیدا گونجاو و وەزیفی پێکەوە بەستراونەتەوە، لەبەرئەوە هەڵوێست چەسپاوترە و کەمتر بە ئاسانی بە قسەکردن دەکرێت و هێزێکی پاڵپێوەنەری بەهێزتری هەیە وەک لە بیروڕا. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەگەڵ زۆربەی پێناسەکانی چەمکی هەڵوێستدا یەک دەگرێتەوە، کە لێرەدا تەنها دوانیان بە نمونە دەهێنمەوە:

Attitude is «the total of a man›s - inclinations and feelings, prejudice or bias, preconceived notions, ideas, fears, threats, and convictions about «any specified topic

Attitude is the predisposition of the» - individual to evaluate some symbol or object or aspect of his world in a favorable or unfavorable manner. Opinion is the verbal expression of an attitude, but attitudes can also be expressed in nonverbal behavior. Attitudes include both the affective, or feeling core of liking or disliking, and the cognitive, or belief, elements which describe the object of the attitude, its characteristics, and its relations to other objects. All attitudes thus include beliefs, but not all beliefs are attitudes. When specific attitudes are organized into a hierarchical structure, «they comprise value systems

پەیوەندی هاوبەشی هەڵوێست و بیروڕا پاشتر دەتوانین وا لێکی بدەینەوە کە هەردوو دیاردەکە بە پلەی جیاواز لە ڕێگای مەبەستی دەربڕینەکەوە جیاوازییان لەگەڵ یەکتر هەیە. بێجگە لەوەش بواری هەڵوێست زۆرجار وەکو زەمینە خۆشکەر بۆ ئەو دەربڕین و بە قسەکردنەی بیروڕا لێک دەدرێتەوە. کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر بیروڕای ڕێتسپییێنت لە ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوەدا لە پێش هەمووشیاندا لە بواری سیاسیدا بە چڕیی پشکنراوە. بەم هۆیەشەوە نەک هەر توانراوە چەند بارە ئەوە دیاریی بکرێت کە ماس کۆمونیکەیشن وەکو فاکتۆرێکی یەکجار گەورە و گرنگ دەردەکەوێت لە پرۆسێسی دروستکردنی بیروڕای سیاسیدا، بەڵکو لە زۆر لێکۆڵینەوەدا لەسەروشیانەوە لە چوارچێوەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی سیاسیدا، فاکتۆر و توخمەکانی تری بەشدار و کاریگەر لەم پرۆسێسەدا جوانتر دەستنیشان کران. لەلایەکی تریشەوە لەسەر بناغەی پەیوەندیە زۆر ئاڵۆز و چڕەکانی ئەم بوارە و هەروەها گیروگرفتی نەبونی شێوازی لێکۆڵینەوە، کارێکی زۆر گرانە تەواو ئەوە دیاری بکرێت ئایا لە حاڵەتێکی دیاریکراودا بەشی دروستکردنی بیروڕای سیاسی ماس کۆمونیکەیشن بە گشتی و هەروەها یەکەیەکەی میدیاکان بەتایبەتی چەندە.

ئەرکێکی لێکۆڵینەوەی گرنگ بریتیە لە پشکنینی ئەوەی کە ئایا بە چ قەبارەیەک و بە چ ئاکارێکدا پرۆسێسی سایکۆلۆژی دروستکردنی بیروڕا، وەکو ئەوەی هۆف شتێتەر بە درێژیی شیکردۆتەوە، لە ڕێگای حاڵەتە تایبەتیەکانی ماس کۆمونیکەیشنەوە دەتوانرێت گۆڕانیان بەسەردا بهێنرێت.

لەسەر بناغەی ئەو واقعە حاشا هەڵنەگرتوەی کە ماس کۆمونیکەیشن بە پێوانەیەکی گەورە بەشدارە لە دروست بوونی هەڵوێستی ڕێتسپیێنتدا، ژمارەیەکی زۆر لە گیروگرفتی لێکۆڵینەوە پەیدادەبن کە خزمایەتیەکی نزیکیان لەگەڵ یەک هەیە و بەڵام تەواو ئاشکراش لە یەک جیادەکرێنەوە:

ئەو تێزە زۆر گشتیەی کە دەڵێت، ماس کۆمونیکەیشن بەشداریەکی جەوهەریی هەیە لە فۆرم پێدان و نەخشاندن و گۆڕینی وێناکردنی دونیا و مرۆڤ و ژیاندا، لە مناقەشە گشتیەکاندا زۆرجار ئاوازێکی ڕاچڵەکێنەر و ئینزارپێدەر و ڕەخنەگرانە لە کلتور و دەنگ بەرز بە خۆوە دەگرێت: ماس کۆمونیکەیشن- بەم شێوەیە باس دەکرێت- وێنەیەکی جیهانی یەک لایەنی شێوێندراو یاخود هەڵە دەگەیەنێت، هەندێک لایەنی بابەتێک بەرزدەکاتەوە و لایەنەکانی تریشی گوێ ناداتێ و وەلادەخات، هەوڵ دەدات خۆی لەگەڵ چاوەڕوانی و دافعە شک لەخۆگرتوەکانی زۆربەی جمهوردا بگونجێنێت و بەم هۆیەشەوە پێوەر و بەهای نادروست دەگەیەنێت یان بەهێزدەکات، خووڕەوشت (مۆراڵ)ی خراپ کەم زیان دەکات و بەم شێوەیەش دەبێتە هۆی بێ نرخ کردنی ژیانی مرۆڤ و توندوتیژی و بێ حەیا و شەرمی. ئەم بیروڕایانە لە ڕێگای ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەوەی شیکاریی قسەوە پشتگیریان لێدەکرێت، کە تیایاندا ئەوە دەسەلمێنرێت کە لە زۆر حاڵەتدا ئەو دونیایەی لە قسەکانی ماس کۆمونیکەیشندا پیشان دەدرێت جیاوازیەکی ڕوون و ئاشکرای لەگەڵ دونیای واقعیدا هەیە. بەڵام بە دڵنیاییەوە بەم ئەنجامانە هێشتا هەر زۆر دەربارەی کاریگەریی ڕاستەقینەی ئەو بیروڕا جیاوازانە نەوتراوەتەوە. تەنها بە لێکۆڵینەوەیەکی سیستەمیانەی کاریگەریی دەتوانرێت ئەم بۆچوون و بیروڕایانە ڕاستی و دروستیەکەیان تاقیبکرێتەوە، ئەرکێکە کە بۆ زانا لێکۆڵەرەوەکان هەندێک گیروگرفتی دۆزینەوەی میتۆدەی گونجاو دروست دەکات. نمونەیەک بۆ هەوڵێکی سەرکەوتوانە و بەپێز بەم ئاکارەدا بریتیە لە لێکۆڵینەوەی ئینگلیزیە گەورەکەی هیمڵ ڤایت و ئۆپن هایم و ڤینس: تەلەفزیۆن - لێرەدا خۆی وا دەردەخات - ڕوون و ئاشکرا کاریگەریی لە وێناکردنی منداڵ دەکات بۆ کار، بۆ بە هاونرخەکانی کار وە بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە کاردا. دەبێتە هۆی بەهێزکردنی هەیبەتی کاری چینی سەروناوەڕاست، بێجگە لەوەش وێناکردنی چینی ناوەڕاست بۆ کار دەگەیەنێت. تەلەفزیۆن بەهای دەستپێشخەری و دەستپێکردن و هاتنەناوەوەیەکی چاک زەقتر دەکاتەوە، وەکو ڕێگاش بەرەو سەرکەوتن نەک هەر تەنها جۆریەتی مۆراڵیی بەڵکو بیرتیژیی و بڕوابەخۆبوون و ئازایەتیش دەهێنێتە پێشەوە.

منداڵان لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە تێڕوانینێکی فراوانتر دەربارەی کارە جۆراوجۆرەکان وەردەگرن و بەشێوەیەکی فراوان ئەو هەیبەتی کارەی لای گەورەکان هەیە، وەردەگرن. لە ئاوات خواستن بۆ کاری پاشەڕۆژیان ئەو منداڵانەی کاریگەریی تەلەفزیۆنیان لەسەرە خاوەن بیری فراوانترن وەک لەوانەی بێ تەلەفزیۆنن. هەروەها وێناکردنی دونیای ماتریاڵی، وەکو ئەوەی لە زۆر یاریی تەلەفزیۆنیدا

دەردەکەوێت، کاریگەریی لە منداڵان دەکات: لە وێناکردنیاندا بۆ ژیانی پاشەڕۆژیان وەکو مرۆڤی گەورە، پارەپەیداکردن و خاوەنداریەتیی دەکەونە پێش کوالیتێتی کەسایەتیەوە. نمونەیەکی تر بۆ ڕۆڵی ماس کۆمونیکەیشن لە پرۆسێسی سۆسیالیسەیشنی منداڵان و گەنجاندا، کەواتە لە گەورەبوونی مرۆڤی گەنج لەناو کۆمەڵگادا، لە خۆگونجاندا لەگەڵ پێوەر و نرخە باو و بڵاوەکانی کۆمەڵ و لە گەشەپێدانی جۆری سلوکی کۆمەڵایەتیدا، لێکۆڵینەوەیەکی زاینۆک zajonc پیشانمان دەدات: دوو بەشی جیاواز لە یەکتری پرۆگرامێکی ڕادیۆ بۆ منداڵان پێشکەشی دوو گروپ کرا، لە هەردوو بەشەکەدا دوو پاڵەوان هەبوون، ڕۆکی و بودی، لەکاتێکدا ڕۆکی وەکو کوڕێکی کاڵ و کرچ پیشان درابوو، کە هەوڵی دەدا گیروگرفتەکانی لە ڕێگای سلوکی ئاوتۆریتێر و توندوتیژیەوە چارەسەر بکات، بودی وەکو مرۆڤێکی ڕووخۆش و هێمن و لەسەرخۆ دیاریکرابوو کە گیروگرفتەکانی لە ڕێگای ڕووخۆشی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتیەوە بەرەنگار دەبۆوە. لە بەشێکیاندا پاڵەوانێکیان و لە بەشەکەی تردا ئەوی تریان سەرکەوتوبوو. کاتێک کە منداڵەکان پرسیاریان لێکرا، کام لەم دوو پاڵەوانەیان زیاتر خۆش دەوێت، هەرجارەی پاڵەوانە سەرکەوتوەکەیان هەڵدەبژارد. هەروەها لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە ئایا منداڵەکان خۆیان لە حاڵەتێکی لەوجۆرەدا چی دەکەن، وەڵامەکان بە ئاراستەی سلوک و کاراکتەری پاڵەوانە سەرکەوتوەکە بوون، یەکجار پاڵەوانە توندوتیژەکەیان هەڵبژارد و جارێکیش ڕووخۆشەکە. هەرچەندە ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕووی میتۆدەوە و لە ڕووی ژمارەی کەسە هەڵبژێردراوەکانەوە ناتوانرێت بکرێتە گشتیی، بەڵام ئەوە پیشان دەدات کە سەرکەوتن (نجاحات) لەلایەن منداڵانەوە وەکو نرخێکی بەرز سەرنج دەدرێت وە لە بیروڕا دەربڕینیاندا وەکو مەرجێک نیشانەدەکرێت، لەکاتێکدا کوالیتێتی کەسایەتی پاڵەوانەکان گرنگیی کەم دەبێتەوە.

دەربارەی پرسیار لەو وێنەیەی مرۆڤ کە چۆن لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە بە جمهور دەگەیەنرێت، گیروگرفتی Stereotype یشی دەچێتەسەر (ڕستە و دەستەواژەی ئامادەکراو و هەمیشە دووبارەکراو) ئەو وێناکردنە بەستو و کلێشەئاسا و شێوێندراو و مەبەست نەپێکاوانە دەربارەی ئەندامانی گروپێکی دیاریکراو، میللەتان، توخمی مرۆڤ، کار و سەردەمەکانی تەمەن و... هتد. زانستی سۆسیال سایکۆلۆژی زۆر بە چڕیی خۆی بە پرۆسێسی دروست بوونی Stereotype و هەروەها شێوەی کارکردنەکانیانەوە خەریک کردوە. لە بەرامبەر ئەوەدا ئێمە زۆر کەم دەزانین دەربارەی قەبارەکەی، کە لە فۆرم پێدان و چەسپاندنی ئەم Stereotype دا بەر ماس کۆمونیکەیشن دەکەوێت. هەرچەندە لە ڕێگای شیکاریی قسەوە دەتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێت کە کۆمونیکاتۆرەکان لە قسەکانیاندا زۆر بە خۆشییەوە ئەم Stereotype بەکاردەهێنن، بۆئەوەی خۆیان بە ئامادەکردن و وردەکاریەکانی سیفەتەکانەوە خەریک نەکەن و هیلاک و ماندوونەبن، وە یاخود بۆئەوەی چاوەڕوانی و حەز و ئارەزوەکانی جمهوری گەورە و فراوان جێبەجێ بکەن، بەڵام تاکو ئێستا ئەوە کارێکی گرانە کاریگەریی ئەم کلێشانە لای ڕێتسپیێنت بە تەواوی دەستنیشان بکرێن.

گیروگرفتێکی تری بە ئاستەم سەرنجدراو و تەنها لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە بەتەواوی دەرکەوت

و زۆر پێویست بریتیە لە لێکۆڵینەوە لەو واقعەی کە منداڵانی ئەمڕۆ لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە بە پێوانەیەکی پێشتر نادیار، لەگەڵ بیرکردنەوە و مشتومڕ و گیروگرفتەکانی مرۆڤە بە تەمەنەکان ڕووبەڕوو دەبنەوە و ئاشنا دەبن. لەسەر بناغەی ئەو مراقەبانەی کە زۆربەی منداڵان هەتا ئێوارانێک درەنگ ئەو پرۆگرامە سەیردەکەن کە لەلایەن خەڵکانی بەتەمەنەوە بۆ خەڵکانی بەتەمەن بەرهەمهێنراون، ئەو پرسیارەمان بەرەوڕوو دەبێتەوە کە ئایا پیشاندانی ئەم پرۆسێسی سۆسیالیسەیشنە چ کاریگەریەکی هەیە. ئەم گیروگرفتە لەلایەن ڕودی Roody یەوە ساڵی ١٩٥٢ زۆر جوان دەستنیشان کراوە و پاشتر لە لێکۆڵینەوە ئینگلیزیەکەی هیمڵ ڤایت و هاوکارەکانیدا ئەزمونیی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیە وا دەردەکەوێت کە منداڵان لە ڕێگای ئەو هەست پێکردنەوە پێش وەخت و زۆرجار قورس و گران و پڕ لە هیلاکی و ماندوویە پیشاندراوەی ژیانی گەورەکانەوە، تەنها بە ترس و دوورەپەرێزییەوە بیر لەوە دەکەنەوە خۆشیان ڕۆژێک لە ڕۆژان گەورە ببن. منداڵانی (بینەر) کەمتر وەک لە منداڵانی (نەبینەر) بیر لەوە دەکەنەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان قوتابخانە تەواوبکەن و ماڵی دایک و باوکیان جێبهێڵن و کارێک بدۆزنەوە و خێزان دروست بکەن. لە لێکدانەوەیەکی چڕوپڕی ئەم گیروگرفتەدا کلاپەر چەندین کاریگەریی جۆراوجۆر باس دەکات کە لەم پێککگەیشتنەی جیهانی منداڵان بە جیهانی گەورەکان لە تەلەفزیۆندا ئەگەری دروست بوونیان هەیە: جارێکیان ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەم تەفاعلە بە شیوەیەکی گشتیی ببێتە هۆی پێگەیشتن و گەورەبوونێکی سەرزارەکی و ڕووکەش، جارێکی تر ئەگەری ئەوە هەیە منداڵەکە زۆر بە ئاسانی و پێشوەخت وابزانێت کە گەورەکان و گیروگرفتەکانیان دەناسێت و دڵخۆش بێت بەم زانیاریە خەیاڵاویە ناتەواوانە، سێهەمیش کە وێنەی گەورەکان لە تەلەفزیۆندا لە هەندێک لایەنەوە شێوێندراوە و یەک لایەنی پیشان دەدرێت و ئەمە پیشاندانەوەی واقع نیە، چوارەم منداڵەکە لەوانەیە پێشوەخت جۆری سلوکی گەورەکان وەربگرێت، پێنجەم لە هەندێک حاڵەتدا لای منداڵەکە ترسیک لەوە دروست دەبێت کە خۆی ڕۆژێک لە ڕۆژان گەورە ببێت، وە دوایەمینیش لەوانەیە منداڵەکە بڕوای بە (زۆر زانینی) گەورەکان نەمێنێت وە لە پێش هەمووشیاندا دایک و باوکی خۆی.

بۆ پرۆسێسی سۆسیال ئەم پرسیارە گرنگییەکی گەورەی هەیە، ئایا ماس کۆمونیکەیشن چ وێناکردن و بیرکردنەوەیەک دەگەیەنێتە ڕێتسپیێنت دەربارەی کۆمەڵگا و ئەرکەکانی و چۆنیەتی کارکردنیان، دەربارەی دامەزراوەکانی و پەیوەندیەکانی ناوەوەیان، وە تا چ ڕادەیەک ماس کۆمونیکەیشن لەو ئاستەدایە گرنگی پێدان و بەشداریی کۆمەڵانی خەڵک بۆ ئەو شتانەی سەرەوە بەئاگا بهێنێت و بە ئاگاییش بهێڵێتەوە. وەڵامی ئەو پرسیارە لەلایەکەوە پەیوەستە بە فۆرمی ڕێکخستنی میدیای ڕۆژنامەگەریەوە. وەکو لە سەرەوە باسکرا کۆمونیکاتۆرەکان لە پێش هەمووشتێکدا لە دامەزراوە بازرگانیەکاندا قسەکانیان بە ڕادەیەکی زۆر گەورە بە ئاکاری تاموچێژ و حەز و ئارەزو و چاوەڕوانیی جمهور هەڵدەبژێرن و دەگونجێنن وە خۆشیان لە هەموو بابەتێک لادەدەن کە لەوانەیە ببنە هۆی تووڕەبوونی کۆمەڵە خەڵکانێک یاخود لەتە گروپێک. هەر بۆیەشە ئەم سیستەمە بە شێوەیەکی بەرفراوان خۆشبارییەکی سادە و ساکار و بێ وەی پێشکەش

دەکات و ئاسنە گەرمەکەی ژیانی گشتیی (واتە بابەتە گرنگ و جەوهەریەکانی ڕۆژ) لە پرۆگرامەکانی خۆی لادەبات و دووردەخاتەوە. ئەنجامی ئەمەش بریتی دەبێت لە نابینایی و گوێ پێنەدانی جمهور بە گیروگرفتەکانی کۆمەڵگا (سارد و سڕیی سۆسیال)، ماس کۆمونیکەیشن (کاری بورانەوە) جێبەجێ دەکات. بەڵام پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەش بکەین و سنورێک دەستنیشان بکەین کە ئەم چاودێری کردنانە بە هیچ جۆرێک هەموو قسەکانی سیستەمی بازرگانی ناگرێتەوە و بێجگەلەوەش گیروگرفتی (ئاسنە گەرمەکە) لای فۆرمی ڕێکخستنەکانی تریش شتێکی نەناسراو نیە.

ئەگەر لە هەڵوێست وەکو بیروڕا دەربڕینێکی تاڕادەیەک بەردەوام و نرخێنەر تێبگەین، ئەوا


شکسپیر

بۆ سەر ئەمەش ئەوەی ناوی چێژوەرگرتنی لێنراوە دەژمێردرێت، بیروڕا نرخێنەرەکە لە بواری جەمالیاتدا، بیروڕایەک کە لە دەرخستن و پیشاندانی ژیانی کەسایەتیدا، لە جلوبەرگ و ئسلوبی ژیاندا، لە بەڕێوەبردنی کاتی بێ ئیشیدا... هتد خۆی دەردەخات. ئەوە هیچ سەلماندنێکی پێویست نیە کە لێرەشدا ماس کۆمونیکەیشن بەشێوەیەکی نەخشێنەر و فۆرم بەخش خۆی دەخزێنێتە ناو ژیانی مرۆڤەوە. بەشێکی یەکجار زۆری قسەی بڵاوکراوە لە ڕێگای ماس میدیاوە – فلیم، قەوان، پرۆگرامی مۆسیقی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا – ژیانی هونەر دەگەیەنن بە ڕێتسپیێنت، هەروەها لە دەرەوەی قسە هونەریەکانیش، لە ماس کۆمونیکەیشندا بەزۆریی بیروڕای جەمالی، شێوە و شتی نمونەیی پێشکەش دەکرێن، کەواتە ئەمە لە جەوهەری ماس کۆمونیکەیشندایە کە بازنەیەکی فراوان و گەورەی کۆمەڵانی خەڵک بە پێوانەیەکی پێشتر نەزانراو، بە کاری هونەری و بیروڕای نرخێنەری جەمالی ئاشنادەکرێن. با تەنها نمونەیەک بهێنینەوە، ڕۆژی ١٩٥٦/٣/١١ لە تەلەفزیۆنی NBC دا جەماوەرێکی ئەوەندە زۆر سەیری بەرهەمەکەی شکسپیر (ڕیچاردی سێیەم)یان کرد، زۆر زیاتر لە هەموو ئەو جمهورەی کە لە سەردەمی شکسپیرەوە لەسەر شانۆکانی هەموو دینیا سەیری ئەو شانۆگەریەیان کردوە. ئەگەر لێرەدا شانسی دروست بوونی چێژوەرگرتنێکی پۆزەتیف لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە هەبێت، ئەوا لەلایەکی ترەوە ترس لەوە هەیە کە جمهورە فراوان و گەورەکە وەکو بناغەیەک کەمتر ڕووبکاتە ئەم قسە باش و بە کەڵکانە وەک لە ڕووکردنە خۆشبارییەکی زۆرجار سووک و تەنک، کە نەبنە هۆی چێژوەرگرتنێکی ئاست بەرزی خوازراو. سەرجەمی ئەمە کە لە ڕوونکردنەوەدا زۆر ئاڵۆز و تا ئێستا تەواو نەزانراوە، بەزۆریی گیروگرفتێکی سۆسیۆلۆژیە، ئەم بابەتەی ئێمە لێرەدا بە کورتی باسمان کرد لە USA لەژێر ناوەکانی (Mass)، (Popular arts)، (Popular culture)، (culture)دا بە چڕیی وتوێژی دەربارە دەکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا مرۆڤ لە سنووری سەرنجدان و بیرکردنەوە و کۆکردنەوە و بیروڕا گۆڕینەوە لەسەر دەلیلەکان و گریمانەکان هەروەها لێکدانەوەی سۆسیۆلۆژیانەی واقیعە مێژوویەکان نەچۆتە دەرەوە.

تا ئێرە ئەوەندە زۆر بە کورتی دەربارەی دیاردەی فۆرمە هەمە جۆرەکانی هەڵوێست و کارتێکردنیان لە ڕێگای ماس کۆمونیکەیشنەوە. لە کۆتاییدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە بەشی هەرە زۆری ئەو لێکۆڵینەوە ئەزمونیانەی باسمان کردن خۆیان بە (ماوە کورت خایەنەکان)ی گۆڕانی هەڵوێستەوە خەریک دەکەن کە ڕاستەوخۆ پاش ناردنی ناوەرۆکەکەی هەستیان پێدەکرێت، هەرچەندە لەڕاستیشدا لێرەولەوێ گۆڕانی هەڵوێست پاش چەند ڕۆژێک، پاش چەند هەفتەیەک و چەند مانگێکیش توانراوە بپێورێت، بەڵام ئەم زانیاریانە بە گشتی هێشتا هەر زۆر ناسیستەمی و پڕ لە کون و کەلەبەرن و بۆئەوە ناشێن لێیانەوە بناغەی گشتی دەربارەی کاریگەریی درێژخایەن وەربگیرێت.
گیروگرفتێکی تایبەتی لەو واقیعە زۆرجار باسکراوەوە دروست دەبێت، کە هەڵوێست خزمایەتیەکی زۆر نزیکی لەگەڵ بوارەکانی تر هەیە، زۆرجار بەبێ هیچ سنورێکی دیاریکراو تێکەڵیان دەبێت و بە پێوانەیەکی گەورە وەزیفی پێیانەوە بەستراوەتەوە،

لەپێش هەمووشیاندا لەگەڵ فێربوون و سلوکدا.
پەیوەندیی نێوان هەڵوێست و فێربوون لە چوارچێوەی پرۆسێسی کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشندا دەتوانرێت بە شێوەیەکی زۆر گشتی بەم شێوەیە باس بکرێت: فراوانکردنێکی پێکهاتەی زانین، لە زۆر حاڵەتدا لەگەڵ خۆی گۆڕان لە هەڵوێستیشدا دەهێنێت. زۆر هەوڵ و تێکۆشان ئەم بۆچوونەیان بۆ خۆیان کردوە بە بناغە، بۆئەوەی لە ڕێگای گەیاندنی زانینەوە، لە ڕێگای زانیاریەوە، لە ڕێگای فراوانکردنی ئاسۆی هەست و هۆشەوە کار لە هەڵوێستی مرۆڤ بکەن. بەم شێوەیە لەژێر چەند مەرجێکدا ئەگەری ئەوە هەیە لە ڕیگای بابەتی بوون و زانیاریی نەشێوێندراوەوە حوکم دان بەسەر ڕەگەزی مرۆڤ یاخود کلێشەی جۆری ستریۆ لەناوببرێت. هەرچەندە لەڕاستیشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستوە کە ئەم پەیوەندیەی نێوان زانین و هەڵوێست زۆرجار بەڵام نەک هەمیشە دروستن.
لە زۆرێک لە تاقیکردنەوەکاندا کاریگەریی فێربوون دەرکەوتوون، بەڵام گۆڕانی هەڵوێستی چاوەڕوانکراو و خوازراو نەهاتۆتە دی، کە بەم هۆیەوە مەبەستی ڕاستەقینە و سەرەکی کۆمونیکەیشن نەپێکراوە. ئەم چاودێری کردنە لێکۆڵینەوە دەخاتە بەر ئەرکی تازە: ئێستا هەر بەتەنها ئەوە بەس نیە بسەلمێنرێت، کەی وە لەژێر چ مەرجێکدا فێربوون لەگەڵ گۆڕانی هەڵوێستدا دروست دەبێت وە کەی نابێت، بەڵکو لە پێش هەمووشتێکدا ئەوە ڕوون بکرێتەوە، بۆچی لە حاڵەتێکدا هەردوو بوارەکە لەگەڵ یەک دەگونجێن و لە حاڵەتێکی تردا ناگونجێن. ئەم پرسیارانە دەتوانرێت تەنها لە ڕێگای شیکردنەوەیەکی سیستەمیانە و گۆڕانی فاکتۆر و کاتە بەشدارەکانی پرۆسێسی کاریگەریەوە وەڵام بدرێنەوە. دەربارەی ئاستی ئێستای لێکۆڵینەوە بۆ ئەم بابەتە کلاپەر بە چڕی تاوتوێی کردوە و لێی کۆڵیوەتەوە.
ئەو دیاردەیەی کە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم نەگونجانە لەنێوان فێربوون و گۆڕانی هەڵوێستدا لەوانەیە بە کەڵک بێت، بریتیە لەوەی ناوی لێنراوە (sleeper effect)، ئەوە شتێکی دەگمەن نیە کە ئەو کاریگەریانەی قسە نێردراوەکان ڕاستەوخۆ پاش ناردنیان نیسبیا بچوک و کەمن، بەڵام پاشتر بە تێپەڕبوونی کات، وردەوردە بەرز دەبنەوە. لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە لەوانەیە ئەم پرۆسێسە بەم جۆرە ڕووبدات، کە ڕێتسپیێنت سەرچاوەی قسەکە، کەواتە یا کۆمونیکاتۆر یاخود دەزگایەکی ڕۆژنامەگەریی وە یان میدیایەک، لەپێشدا ڕەفز بکات و کەمتر ئارەزووی قبوڵ کردنی و چەسپاندنی بێت لە ناخی خۆیدا، بەڵام پاشتر ڕێتسپیێنت بەپێی پرنسیپەکەی (وەعی جیاواز)ی فێستینگەر سەرچاوەکەی خێراتر لەبیر دەچێتەوە وەک لە قسەکە وە بەم هۆیەشەوە بە تەدریجی کەمتر بەرهەڵستیی ناوەڕۆکی قسەکە دەکات.
پرسیارێکی تری زۆر گرنگ بۆ گیروگرفتی کاریگەریی بریتیە لە پەیوەندیەکانی نێوان هەڵوێست و سلوکی گونجاو- یاخود بە واتایەکی تر- دەربارەی هێزی پاڵپێوەنەر و بەگەڕخەری هەڵوێست بۆ سلوک. ئەگەر هەڵوێست لە ڕێگای هێزە پاڵپێوەنەرە نیسبیە گەورەکەیەوە خۆی لە بیروڕا جیابکاتەوە، وە ئەگەر ئەوەش سەلمێنراوبێت کە هەڵوێست بە پێوانەیەکی گەورە بەشدارە لە ئاراستەکردنی سلوکی مرۆڤدا، ئەوا ژمارەیەکی زۆری نمونەش ئەوەمان فێردەکەن کە هەڵوێست بە هیچ جۆرێک هەمیشە کاریگەریی لە سلوک ناکات. زۆر زیاتر، بە گشتی

گۆڕانی هەڵوێست هەیە بێ هیچ کاریگەریەک لەسەر سلوک، لە هەندێک حاڵەتی تایبەتیشدا تەنانەت سلوک پێچەوانەی هەڵوێست دەوەستێتەوە. ئەم پەیوەندیانەش دیسانەوە هەر دەتوانرێت لە ڕێگای شیکاریەکی سیستەمیانەی بواری کۆمونیکەیشنەوە بە هەموو فاکتۆر و کاتە بەشدارەکانیەوە ڕوون بکرێتەوە.

پرسیارێکی تری تا ئێستا کەمتر سەرنج دراو، کە ئەویش دیسان لە ئەنجامی بەیەک گەیشتنی فاکتۆر و توخمەکانی بواری کۆمونیکەیشن دەتوانرێت لێکبدرێتەوە، بە هۆی (Bumerang –Effekt)وە دێتە ئاراوە (ئەم وشەیە لاتینیە و لێرەدا بە مانای ئاراستەکردنی سلوک بە ئاکارێکدا کە پێچەوانەی مەبەستی خوازراوی لێبکەوێتەوە.– و). بەڵام لێرەدا پێویستە مرۆڤ ئەوە لەبەرچاو بگرێت کە ئەم وشەیە نیشانە نیە بۆ دیاردەیەکی یەکگرتو و تەواو چوارچێوە بۆ دانراو، بەڵکو زۆر ڕووکەش هەموو ئەو حاڵەتانە لە خۆیدا کۆدەکاتەوە کە تیایاندا کاریگەریەکان پێچەوانەی مەبەست و ئامانجی خوازراوی کۆمونیکاتۆر دەوەستنەوە. ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوەی هەڵوێست ئەم کاریگەریە دەسەلمێنن و لە هەمان کاتیشدا ئەوە پیشان دەدەن کە لەوانەیە زۆر مەرج و بناغە لە پشتەوە وەستابن کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە. شیکردنەوە و لێکدانەوە و بە یەکگرتنی هەموو (Bumerang – Effekt) زانستیە کۆکراوە و سەلمێندراوەکان نەک هەر تەنها بۆ بوارە عەمەلیەکانی ڕیکلام و پڕوپاگەندە و پەروەردەکردن گرنگن، بەڵکو لەپێش هەمووشتێکدا بۆ چوونەناوەوەی تیۆریانەی گۆڕانەکانی هەڵوێست گرنگیەکی یەکجار گەورەیان هەیە. چەند بیروباوەڕێک بۆ ڕۆشنکردنەوەیەکی تیۆریانەی (Bumerang –Effekt) هەر سێ زانا مێرتۆن و کۆپەر و دینەرمان پێشکەشیان کردووە. مێرتۆن چوار حاڵەت دیاریی دەکات کە دەشێت لە (Bumerang – Effekt)دا دەوریان هەبێت:

١ – کۆمونیکاتۆر لە ئامادەکردنی قسەکەیدا وێنەیەکی هەڵەی جمهور دەهێنێتە پێش چاوی خۆی و بەم هۆیەشەوە ئامانجەکەی خۆی ناپێکێت.

٢ – کۆمونیکاتۆر لەبەردەم ئاستەنگێکی (مازق) بێ چارەسەردا وەستاوە: جمهورەکەی ئەوەندە لێک جیاوازن کە ناتوانێت ڕووبکاتە هەموو لەتە گروپەکان.

٣ – بەشە پێکهێنەرەکانی قسەکە لە وەرگرتنێکی خێرا و سەرزارەکیدا وا دەردەکەون نێوان دژبن لەگەڵ یەکتر.

٤ – ئەو نمونانەی کە کۆمونیکاتۆر بە هۆیانەوە قسەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە، لەگەڵ خیبرەی ڕێتسپیێنتدا ناگونجێن.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی گۆڕانەکانی هەڵوێست لە ڕێگای پێشکەشکردنی فلیمێکەوە، کۆپەر و دینەرمانیش چوار حاڵەت باس دەکەن کە لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ ئەوانەی مێرتۆن ڕێک دەکەون:

١ – قسەکە بۆ گروپێکی تایبەتیی بەرهەمهێنراوە، جیاوازە وەک لەو گروپەی پێشکەشی دەکرێت، بەم هۆیەشەوە قسەکە بە هەڵە لێکدەدرێتەوە.

٢ – توخمە پێکهێنەرەکانی قسەکە نێوان دژن لەگەڵ یەکتر.

٣ – قسەکە نێواندژە لەگەڵ ئەو ئاستی زانین و خیبرەیەی ڕێتسپیێنت هەیەتی.

٤ – قسەکە لە هەندێک خاڵیدا هاوشێوەی قسەی ترە کە مەبەستی جیاوازتریان هەیە، بەم شێوەیە ئەو ڕێتسپیێنتەی بە سەرزارەکی قسەکە

وەردەگرێت، لەیەکچوونی قسەکان مانایەکی هەڵەی لا دروست دەکات.

بەڵام کۆپەر و دینەرمان ئەوەش دیاریدەکەن کە لێرەدا تەنها ئاماژە بە هەندێکی کەم لە ئەگەری لێکدانەوە زۆرەکان کراوە.

لەم ساڵانەی دواییدا دەربارەی (کاریگەریی هەست پێنەکراو) قسەی زۆر کرا، هۆکار بۆ مناقەشەکردنی گشتیی ئەم دیاردەیە ئەو دەنگوباسانە بوون، کە بەپێی ئەوانە دەبێت زانا سایکۆلۆژیەکانی ڕیکلام و پروپاگەندە توانیبێتیان لە ڕێگای کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراوەوە لە ماس میدیادا بگەنە ئامانجەکانی خۆیان، کەواتە لە ڕێگای شێوازێکەوە کە تیایدا ڕێتسپیێنت هیچ شتێک دەربارەی کاریگەریی نازانێت وە بەم هۆیەشەوە ناتوانێت خۆی لە دژی ئەو کاریگەریە بپارێزێت وە یان بشارێتەوە. مەترسیە پەیوەستەکانی ئەم شێوازە خۆی لە دەستەواژەی بەناوبانگی وشەکانی (ئیغرای نهێنی) دا دۆزیەوە. هەرچەندە گیروگرفتی کۆمونیکەیشن و وەعی هەست پێنەکراو بۆ زانستی سایکۆلۆژی ئەزموونی لە چەندین ساڵەوە زۆر ئاشکرایە، بەڵام ئەوەی تازەیە لەم بابەتەدا بریتیە لەوەی کە ئایا کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو دەبێتە هۆی کاریگەریی هەست پێنەکراویش، کەواتە ببێتە هۆی گۆڕان لە هەڵوێست یاخود سلوکدا. لایەنی تازەی تریش پاشتر خۆی لەو ئەگەرەدا دەبینێتەوە، کە بە هۆی ماس کۆمونیکەیشنەوە کاریگەریی هەست پێنەکراو لەسەر گەورەترین بازنەی کۆمەڵانی خەڵک بەڕێوەببرێت. لەبەر گرنگیی زۆری ئەم لایەنانە، ژمارەیەکی زۆر تاقیکردنەوە جێبەجێ کران، کە بەهۆیانەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەوەدرا، تا چ ڕادەیەک کاریگەریی کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو لە واقیعدا گەورەیە. لێرەدا قسەکردن دەربارەی یەکەیەکەی ئەو لێکۆڵینەوانە ڕێگاکەمان درێژ دەکاتەوە، هەروەها تاقیکردنەوەکان خۆشیان ئەنجامی تەواو ڕوون و ئاشکرا و کۆتاییان بە دەست نەهێناوە.

دوو کاری لێکۆڵینەوە سەرنجێکی چاک دەدەنە چۆنیەتی گیروگرفتەکە و ئەدەبیاتی بابەتەکە و ئاستی ئەمڕۆی لێکۆڵینەوە. ڕاپۆرتێکیان بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژی پسپۆڕە ئینگلیزەکان کە بەم ڕستانە کۆتایی دێت:

(بەپێی ئاستی لێکۆڵینەوەکانی ئێستامان تەنها ئەگەرێکی کەمی کاریگەریی کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو لە بواری فرۆشتن و قەناعەت پێکردندا هەیە. مەترسیەکانی ئەم جۆرە میتۆدەی کۆمونیکەیشنە، کە بوونە هۆی مشتومڕێکی گشتیی گەرم و گوڕ، بە هیچ جۆرێک نەسەلمێنراون. کۆمیتەی لێکۆڵینەوەکە ئەوەی بۆ دەرکەوت کە تاکە حاڵەتەکان، وەکو ئەوەی لە ڕاپۆرتە گشتیەکاندا لە ئینگلتەرا و وڵاتانی تریشدا پیشان دەدرێن، یان بەم جۆرە فۆرمە بەهیچ جۆرێک بوونیان نیە وە یاخود زیادەڕەویەکی یەکجار زۆریان پێوە دەکرێت.

جا چونکە زانا پسپۆڕەکانی بواری سایکۆلۆژی هەمیشە بەردەوام تاقیکردنەوەی ئەکادیمیانە دەربارەی کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو بەڕێوەدەبەن، ئەو تاقیکردنەوانەی کە بۆ خودی زانست پێویستن، ئەوە هەمیشە ئەگەری هەیە کە میتۆدەی تازە بدۆزرێنەوە، کە بتوانن بەشێوەیەکی ئاسایی و بێ فێڵکردن لە بواری زانیاری و قەناعەت پێکردنیشدا کاریگەربن.

### ئەمە بڕوای کۆمیتەکەیە بە کۆی دەنگ:

١ - بەکارهێنانی کۆمەنیکەیشنی هەست پێنەکراو،

گرنگ نیە لە هەر فۆرمێکدا بێت، لە بواری ڕیکلام وە یاخود بۆ بەرزکردنەوەی فرۆشتن، پێویستە بە توندیی ڕەتبکرێتەوە. هەڵبژاردنی سەربەستانەی کۆمەڵانی خەڵک شت قبوڵبکەن یاخود ڕەتبکەنەوە، بریتیە لە بەشێکی سەرەکی و چەسپاوی خووڕەوشتی ڕیکلامی باش و ڕێکوپێک، وە ڕاستەوخۆ ئەم پرینسیپە لە ڕێگای کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراوەوە دێتە شکاندن.

٢- کە ئەمڕۆ ناتوانرێت بزانرێت، کەی ئەو میتۆدانە بۆ چاکەی مرۆڤ بەکاردەهێنرێن و توانای کۆنترۆڵ کردنیشیان نیە، هەر لەبەرئەوە ئامۆژگاریی پەیمانگای (Institute of Practitioners in Advertising) دەکرێت کە جێبەجێکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیەی خواست: نابێت هیچ ئەندامێکی پەیمانگاکە، جا ئەوە لە هەر فۆرمێکدا بێت، کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو بۆ ئامانجی ڕیکلام و بەرزکردنەوەی فرۆشتن بەکاربهێنێت وە خۆیان بپارێزن لە هەر جۆرە تاقیکردنەوەیەک کە بەکارهێنانی کۆمونیکەیشنی هەست پێنەکراو لە بواری عەمەلیدا بگرێتەخۆی).

لە هەوڵداندا بۆ ئەوەی گیروگرفتی کاریگەریی لە هەڵوێست تەواو دیاری بکرێت، ئێستا لە لێکۆڵینەوەکانی سۆسیال سایکۆلۆژیدا چەند ڕێگایەک هەیە:

لێکدانەوەیەکی چڕ و تەواوی سترەکتورەکانی ناوەوەی هەڵوێست پێویستە ئەو پەیوەندیانەی نێوان بەشە پێکهێنەرەکانی هەڵوێست ڕوونبکەنەوە، کەواتە نێوان بەشەکانی هۆشمەندیی (وەعی)، هەست و هەڵچوون (ئینفعال) وە هەروەها سلوک، لێرەدا لە پێش هەمووشتێکدا ئەوە دەپشکنرێت، چۆن ئەم بەشە پێکهێنەرانە لە هەمەئاهەنگیدا لەگەڵ یەکتر یاخود لە جیاوازیدا لەگەڵ یەکتر ڕەنگ دەدەنەوە.

خاڵێکی تری بیرکردنەوە پرسیار لە چۆنیەتی کارلێکردنی هەڵوێستەکان دەکات لە مرۆڤ، دەربارەی ماناکانیان و ئەرکەکانیان. بەم شێوەیە بەپێی بۆچوونەکانی سارنۆف، هەڵوێست تەنها ئەوکاتە قبوڵدەکرێت و وەردەگیرێت، ئەگەر خزمەتی مرۆڤ بکەن بۆ ئەوەی a- سترکتورێکی عەقڵانی بۆ دونیا دابنێت، b- خۆی لەگەڵ ئەو پاداشت و سزایانەی لە حاڵەتە کۆمەڵایەتیەکانەوە دروستدەبن، بگونجێنێت، c- تاکەکەس یارمەتی بدات بۆ پاراستن و دیفاعکردن لە خود.

بۆچوونێکی تری سێیەم لە پرۆسێسەکانی بەڕێوەچوونی هەڵوێست دەکۆڵێتەوە و ئەوە دەپشکنێت، کەی وە چۆن هەڵویستەکان، a- تازەدەکرێنەوە، b- بەهێزدەکرێن، c- لاوازدەکرێن، d- بۆ پێچەوانەکانی خۆیان هەڵدەگێڕدرێنەوە، وە لەژێر چ مەرجێکدا، e- بە هیچ جۆرێک کاریگەریی هەستی پێناکرێت. کلاپەر لە کارێکی گەورە و فراوانی خۆیدا پاش هەڵسەنگاندنی یەکەیەکەی ئەو ژمارە زۆرەی لێکۆڵینەوانە، دەربارەی ئاستی لێکۆڵینەوەی ئەمڕۆ بۆ چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەو پرۆسێسانە بە دوورودرێژی باسی کردووە.

زۆر نزیک و پەیوەست بەوانەوە، مرۆڤ لێکۆڵینەوە لە توخم و فاکتۆرە بەشدارەکانی پرۆسێسی گۆڕانی هەڵوێست دەکات (mediating factors). ئەم گیروگرفتە کە لە بناغەدا لە هەموو جۆرەکانی کاریگەریدا بەشدارە، دەتوانرێت تەنها بەهۆی مۆدێلێکی سیستەمیانەی- تیۆریانەی کۆمونیکەیشنەوە چارەسەر بکرێت. لە بەشێکی تایبەتیدا باسی لێوەدەکەین.

لەکۆتاییشدا ئەرکی تازەتری لێکۆڵینەوەی هەڵوێست لە بواری ماس کۆمونیکەیشندا لەو واقیعەوە دروست دەبێت، ئەو زانیاریانەی کە مرۆڤ ئەمڕۆ پشتیان پێدەبەستێت، لەژێر ئەو مەرجانەدا کاریان تێدادەکرێت کە هیچ پەیوەندیەکیان بە ماس کۆمونیکەیشنەوە نیە وە یاخود زۆر کەم هەیە. لە سەرەتای بناغەدانانی لێکۆڵینەوەی کاریگەریەوە، کەواتە لەو بوارەدا کە تاکو ئێستا ناتوانرێت وەکو کۆتایی پێهاتوو بژمێردرێت، ژمارەیەکی زۆر لە بیروڕای گشتیی لێکۆڵینەوەی هەڵوێست بەبێ سەرنجدانی تەواو و ڕەخنەلێگرتن گوازرانەوە بۆ بوارە تایبەتیەکەی ماس کۆمونیکەیشن. ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە لەوە بکۆڵرێتەوە، کەی وە تا چ ڕادەیەک پرۆسێسەکانی فێرکردن و گۆڕانی هەڵوێست لە ڕێگای تایبەتمەندیەکانی ماس کۆمونیکەیشنەوە گۆڕانیان بەسەردادێت. بەتایبەتی گرنگە ئەوە ڕوونبکرێتەوە کە چۆن حاڵەتە تایبەتیەکەی ڕیتسپینت لە ماس کۆمونیکەیشندا کاریگەریی لە پرۆسێسەکانی هەڵوێست دەکات. جا چونکە ماس کۆمونیکەیشن هەمیشە ناڕاستەوخۆ و یەکلایەنی بەڕێوەدەچێت، کەواتە ڕۆڵگۆڕینەوەی لەنێوان قسەکەر و قسەوەرگردا تێدا ڕوونادات، ئەگەری ئەوەش هەیە پرۆسێسی کاریگەریی لە هەندێک لایەنەوە لە پرۆسێسی کۆمونیکەیشنی ئاسایی جیاوازبێت. نمونەیەک لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەزمونیدا بۆ ئەم مەبەستە دەهێنینەوە، لە لێکۆڵینەوەیەکی یانیس و کینگدا دەردەکەوێت کە کەسانی ئەنجامدەری تاقیکردنەوەکە کە توانیان وەکو لایەنێکی قسەکردنەکە ئەکتیڤ لە پرۆسێسی کۆمونیکەیشندا بەشداربن، بەهێزتر کاریگەریی قسەکەیان لەسەربوو وەک لەوانەی پاسیڤ قسەکەیان خوێندەوە یاخود بە گوێگرتن وەریان گرت.

## ٤ – کاریگەریەکان لە بواری هەڵچووندا (ئینفیعال):

ئەگەر وەکو لە سەرەوە باسکرا قسەمان دەربارەی پرۆسێسەکانی هەڵچوون بێت لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕێتسپیێنت لەگەڵ قسەکەدا، ئەوا ئێستا ئەو پرسیارە سەر هەڵدەدات، ئایا لەژێر چ مەرجێکدا، تاکو ماوەی چەند و بە چ مەبەستێکەوە ئەم ڕووداوانە لە قۆناغی پۆست کۆمونیکەیشندا (پاش کۆمونیکەیشن) بەردەوام دەبن. دەربارەی ئەم بابەتە – لەسەر بناغەی ئاڵۆزی گیروگرفتی نەبوونی میتۆدی گونجاو – لێکۆڵینەوەی زۆر کەم لە بەردەستدان.

ئەوەی ئاشکرایە بریتیە لە (کاریگەریی بەگەڕخەر (پاڵپێوەنەر))ی فلیم، ئەو دڵخۆشکردن و پشووپێدان و خەمڕەوێنیەی کە لە ڕێگای زۆر فلیم و هەروەها لەوانەشە لە ڕێگای ڕادیۆ و پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆن و وە هەروەها کتێبەوە بەرهەم دەهێنرێت وە زۆرجاریش بۆ ماوەیەک لە قۆناغی پۆست کۆمونیکەیشندا بەردەوام دەبێت. بەم شێوەیە ئافرەتانی ماڵ لە ئەمریکا لەو بارەیەوە دەڵێن پرۆگرامەکانی ڕادیۆ بناغەی سوککردنی باری شان و یارمەتیدەری ژیانیانن، چونکە مرۆڤ دەتوانێت لەلایەکەوە لەگەڵ پرۆگرامەکاندا بگریەت، پاشتر چونکە مرۆڤ ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە خەڵکانی تریش نزیکەی هەمان گیروگرفتی ئەویان هەیە، چونکە بەهۆی کەسانی بەناوبانگەوە خۆی دەناسێتەوە، وە هەروەها چونکە مرۆڤ ئامۆژگاری و جۆری سلوک بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ژیانی ڕۆژانە دەدۆزیتەوە. بەڵام تاکو ئێستا هیچ پێوانەیەکی تەواو دەربارەی بەردەوامبوونی ماوەی ئەم خەمڕەوێنیانە پاش ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ قسەکەدا لەبەردەستدا نیە.

دەربـارەی هەست کردن بە ترس و دڵەڕاوکێ لە قۆناغی کۆمونیکەیشنە واقیعیەکەدا – وەکو پێشتر باسکرا – هەندێک لێکۆڵینەوە لەبەردەستدان، بەڵام نەک دەربارەی کاریگەرییەکانی ئەم جۆرە هەڵچوونانە پاش وەرگرتنەکان.

### ٥ – کاریگەرییەکان لە بواری قووڵایی سایکۆلۆژیدا (نفسی):

لەژێر کاریگەریی لە بواری قووڵایی سایکۆلۆژیدا هەموو ئەو گۆڕانانە لە بناغەکانی کاردانەوەی (ردفـعـل) بـێ ئاگایی (بـێ وەعـی) لـە ڕێگای کارتێکردنی ماس کۆمونیکەیشنەوە تێدەگەین. بەڵام لێرەشدا دیسانەوە گیروگرفتی جیاکردنەوەی جۆرەکانی کاریگەریی دەردەکـەوێـتـەوە، چونکە هەندێک لەو کاریگەرییانەی کە ئێمە لە جەدوەلەکەی خۆماندا لەژێر هەڵوێست یاخود هەڵچووندا ڕیزمان کردبوون، لێرەشدا بە هەمان شێوە دەتوانرێت دابنرێنەوە، بۆ نمونە وەکو جۆری ستریۆ وە یان کاریگەریی بەگەڕخەر، ئەو دیاردانەن کە تەنها بەهۆی بەرنامەی میکانیزمێکی نادیارەوە دەتوانرێت تەواو لێکبدرێنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرەوەی ئەم سنورە هەندێک دیاردە هەن کە ناکەونە ناو هیچ کامێک لەو بەشانەی باسمان لێوەکردن وە بەم هۆیەشەوە دەتوانرێت بەشێکی کاریگەریی تایبەت بە خۆیان بۆ دابنرێت، ئەوانەش بریتین لەلایەکەوە لە هەندێک کاریگەریی باری دەروونـی لەلایەکی ترەوە گۆڕان لە حاڵەتەکانی بەگەڕخستن وە پاشان کاریگەریی قسەکان لەسەر خەوت ڕێتسپییێنت.

وەکو نمونە بۆ کاریگەریی باری دەروونی، هەندێک حاڵەت دەتوانن یارمەتیدەرمان بن کە تیایاندا پەیوەندیدار بە قسەکانی ماس کۆمونیکەیشنەوە توانرا هەندێک دیاردەی نەخۆشی عەسەبی وە یان تێکچوونی باری دەروونـی دەست نیشان بکرێن. کچێکی تەمەن پانزە سـاڵان ترسێکی زۆری لا پەیدابوو، کە دکتۆرە دەروونیەکەی هۆیەکەی گێڕایەوە بۆ سەیرکردنی فلیمی (زەنگلێدەرەکەی نۆترێدام). لە حاڵەتێکی تـردا کچێکی تەمەن چواردە ساڵان ناوبەناو تووشی کوێربوون دەبوو پاش سەیکردنی فلیمی (سیمفۆنیای پاستۆراڵ). بەڵام ئەم جۆرە کاریگەرییانە وادەردەکەوێت لە زۆر حاڵەتی دەگمەندا هەمیشە تەنها لەکاتی هەبوونی جـۆرە گیروگرفتێکی دەروونـی لای ئەوکەسانە پەیدا ببن، قسەکە لێرەدا دەبێتە هۆی دەرخستنی حاڵەتەکە بەڵام نەک دروستکردنی.

گۆڕانەکان لە حاڵەتی بەگەڕخستندا تەنها کاتێک دروستدەبن، ئەگەر لە ڕێگای وەرگرتنی قسەکەوە بێتاقەتیەکانی ڕێتسپییێنت کەم بکرێنەوە، پشوویان پێبدرێت، ئاسایی بکرێنەوە، وە یاخود بە پێچەوانەوە قسەکە هەندێک غەریزەی تایبەتی وەکو سێکس وە یان مەیلی شەڕانگێزی دروستبکات یان بەهێزبکات. ئەم گیروگرفتە لە بەشی تایبەت بە کارەکانی قسەدا باسکراوە.

دەربارەی کاریگەریی قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن لەسەر خەوی ڕێتسپییێنت بێجگە لە هەندێک شک و مەزەندە تەنها ژمارەیەکی زۆر کەم لێکۆڵینەوە لەبەردەستدان کە ئەوانیش لەوە زیاتر ناڵێن کە مرۆڤ زۆرجـار بەهۆی هەندێک قسەی تایبەتەوە تاخود هەندێک بەشی قسەکانەوە خەو دەبینێت.

### C – فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی پرۆسێسی کاریگەریی

بـۆ کەسێکی سـەرنـجـدەری سـادە، پرۆسێسی کاریگەریی وەکو تەفاعلێکی ڕاستەوخۆی یەکلایەنی دەردەکـەوێـت، کە تیایدا فاکتۆرێک – قسەکە –

لەسەر فاکتۆرێکی تر- ڕێتسپییێنت- کاریگەریی دەکات و هەندێک گۆڕانی تایبەتی دروست دەکات. بەپێی ئەم مۆدێلی بیرکردنەوەیەی کاریگەر و کاریگەرلێکراو، قسەکە وەکو هێزێکی پاڵپێوەنەر و وەرگریش وەکو کاریگەرلێکراوێکی پاسیڤ لێکدەدرێنەوە. ئەم بیروڕایە کە بیروڕای سەرجەمی زاناکانی سەرەتای لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بوو وە ئاشکراش وەکو (کاریگەریی) دەردەکەوێت، لەگەڵ پەیوەندیە چڕوئاڵۆزەکانی بواری ماس کۆمونیکەیشندا جووت نایەتەوە. زۆر بە خێرایی لە لێکۆڵینەوەکاندا ئەوە دەرکەوت کە وێناکردن بۆ ڕێتسپییێنت وەکو ماددەیەکی خام و سەرەتایی، بە هەڵەدا چوونە، بێجگە لەوەش پرۆسێسی کاریگەریی تەنها هەر فاکتۆرەکانی قسە و ڕێتسپییێنت ناگرێتە خۆی، بەڵکو ژمارەیەکی زۆری تری (هێز)ی لەخۆ گرتووە، ئەو هێزانەی لە ئەدەبیاتی ئەنگلۆ- ئەمریکیدا وەکو (mediating factors) نیشانە دەکرێن و ئێمە لێرەدا لە وەرگێڕانێکی کەمتر دەقیق و ئاڵۆزتر و ناڕاستەوخۆدا ناوی لێ دەنێین (فاکتۆر و توخمە بەشدارەکان)، بێڕلسۆن فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی پرۆسێسی کاریگەریی لە بناغەیەکی زۆر گشتیدا بەم جۆرە دەهۆنێتەوە:

لەژێر ئەم بیروباوەڕەدا دەتوانرێت نزیکەی سەرجەمی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەم ماوانەی دواییە کۆبکرێنەوە وەکو هەوڵدانێک بۆ دۆزینەوەی فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی کاریگەریی و ناسینەوەی پەیوەندیەکانی ناوەوەیان وە پەیوەستیەکانیان پێکەوە و بۆ یەکتری. بەم هۆیەوە لە چەندین لێکۆڵینەوەی جیاوازدا هەرجارەو فاکتۆر و توخمێک دەهێنرانە پێشەوە و دەکرانە خاڵی سەرەکی لێکۆڵینەوەکە، هەندێکیان بە چڕوپڕی و فراوانی لێکۆڵینەوەیان لەسەرکرا و هەندێکی تریان بە پێچەوانەوە خرانەلاوە وە یان هەستیان پێنەکرا. لێرەدا بۆ پەیداکردنی وێنەیەکی ڕێکوپێک، پێویستیی بە سیستەمێکی تیۆریانە هەیە کە سەرجەمی فاکتۆر و توخمەکان و پەیوەندیەکانیان بۆ یەکتری لە جێگاکانی خۆیاندا تەواو ڕوونبکاتەوە. وە ڕاستەوخۆ هەوڵدانێک بۆ دۆزینەوەی ئەم جۆرە سیستەمە لە سێ بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا جێبەجێکرا. هەرچەندە لە سەرەتادا مەسەلەکە بریتی نەبوو لە گیروگرفتی کاریگەریی، بەڵکو بریتی بوو تەنها لە پرۆسێسەکانی بواری ماس کۆمونیکەیشن. بەڵام بەبێ هیچ گیروگرفتێکیش ئەوە دەردەکەوێت - وە ئەمەش ئەرکی ئەم بەشەی نوسینەکەمانە - کە ئەو فاکتۆر و توخمانەی لە شیکاریی پرۆسێسە گشتیەکانی ماس کۆمونیکەیشندا دێنە بەرچاو، تێکەڵی پرۆسێسی کاریگەریی دەبن لای ڕێتسپییێنت، یاخود بە واتایەکی تر هەموو ئەو فاکتۆر و توخمانەی لە کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشندا بەشدارن، سنوردانەرن، هۆی گۆڕانن.

## ١ - کۆمونیکاتۆر لە پرۆسێسی کاریگەرییدا

کۆمونیکاتۆر نووسەرە، سەرچاوەیە، بەرهەمهێنەری قسەیە، کەواتە ئەو فاکتۆرەیە کە ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر ڕێتسپییێنت دروست دەکات. کۆمونیکاتۆر بڕیاردەدات چ ماددەیەک پێشکەشی ڕێتسپییێنت بکرێت وە چۆن ئامادەش بکرێت، هەڵبژاردن و ئامادەکردنی قسەکە - ئەمەش شیکاریەکەی ئێمە دەری خست - لە ڕێگای ژمارەیەکی زۆر لە سیفاتی کەسایەتی و

حاڵەتەکەوە کاری تێدەکرێت، لە ڕێگای کەسایەتی کۆمونیکاتۆرەکەوە، لە ڕێگای مەبەستەکانیەوە، لە ڕێگای پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە گشتیەکانیەوە، هەڵسەنگاندنی بۆ خودی خۆی. پاشتر ئەو نە لە هەڵبژاردن و نە لە بەرهەمهێناندا دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات: ئەو پێویستە لەسەری خۆی لەگەڵ تیمی کارمەندەکانی تردا بگونجێنێت، پێویستە لەسەری پەیڕەوی مەبەست و ئامانجەکانی دامەزراوە ڕۆژنامەگەریەکەی خۆی بکات و داواکاریەکانی جێبەجێ بکات، وە ئەم مەبەست و ئامانجانەش ڕوون و ئاشکرا جیاوازییان هەیە بەپێی دامەزراوەکە، ئایا دامەزراوێکی بە ڕادەی یەکەم ئاوتۆریتێرە، بازرگانیە، یاخود نیمچە ڕەسمی بەڕێوەدەچێت، کۆمەنیکاتۆر لەژێر فشاری قسەکە و جۆری میدیاکەیدایەتی، ئەو وێنەیەکی جمهورەکەی دەهێنێتە بەرچاوی خۆی و لە کارەکەیدا ئەگەری کاردانەوەی ڕێتسپیێنت بۆ قسەکە لەبەرچاو دەگرێت، ئەو لەڕێگای وەڵامی لائیرادی ڕێتسپیێنتەوە کاری تێدەکرێت، وە زۆرجاریش فشارێکی زۆری بیروڕای گشتی لەسەرە. هەموو ئەم بابەتانە لە ناوەرۆک و فۆرمی قسەکەدا ڕەنگ دەدەنـــەوە و بـەم هۆیەشەوە بەشداری کاریگەرن.

## ٢ – قسە لە پرۆسێسی کاریگەریدا

کە قسەکە لای ڕێتسپیێنت کاریگەریی دروست دەکات، ئەوە شتێکی ئاشکرا و ناسراوە، هەروەها ئەو بیروڕایەش کەمتر نەناسراونیە کە کاریگەریی بە نـاوەرۆک و فۆرمەوە پەیوەستە، کەواتە کە ممیزاتی قسەکە وەکو دەستنیشانکەری کاریگەریی و کاریگەرییش وەکو پەیوەستێکی نەچەسپاو و بـگـۆڕی ممیزاتی قسەکە سـەرنـج دەدرێــن. گیروگرفتێکی گەورە و ئاڵۆز لەو پرسیارەوە دروست دەبێت کە ئایا یەکەیەکەی ئەم پەیوەندیانە چۆن دروست دەبن، کام سیفاتی ناوەرۆکی و فۆرمیی قسەکە دەبنە هۆی کام جۆری کاریگەریانە و بە چ ڕادەیەک، ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوەی ئەزمونی شوێن پێی ئەم پرسیارە جەوهەری و پڕبایەخەیان هەڵگرتوە کە بۆ لایەنی عەمەلی ڕۆژنامەگەری و بۆ پەروەردەکردن و ڕیکلام و پروپاگەندە گرنگیەکی یەکجار زۆری هەیە.

ئەو میتۆدە ئەزمونیەی بەزۆریی بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بەکاردەهێنرێت بریتیە لەوەی کە بەشێوەیەکی سیستەمیانە جارێک نـاوەرۆک و جارێکی تر فۆرمی قسەکە دەگۆڕدرێت و پاشان لای دوو گروپی یەکسان و وەکویەکی ئەنجامدەری تاقیکردنەوەکە، کاریگەریی بەشە جیاوازەکان دەپێورێن و لەگەڵ یەک مقارەنە دەکرێن. ئەگەر جیاوازی گرنگ لە نێوانیاندا دەربکەوێت، ئەوا دەتوانرێت تا ڕادەیەکی زۆر هۆیەکەی بگێڕدرێتەوە بۆ (مییزە) گۆڕدراوەکە. لەم جۆرە تاقیکردنەوانەدا – ئەوەندەی توانا هەبێت – کاریگەریی فاکتۆر و سیفەتەکانی تر بە وەعیەوە بێلایەن دەکرێن وە یان دەچەسپێندرێن. سەرئەنجامی بەکارهێنانی ئەم میتۆدەیەش وادەگەیەنێت کە کارێکی گرانە ئەوە بزانرێت، زۆرجار لە تواناشدا نیە، بێئەوەی پشکنینی زیاتری لەسەر بکرێت، کە ئایا تا چ ڕادەیـەک ئەنجامەکان لە پەیوەندیەکانی ژیانی ڕۆژانەشدا ڕوودەدەنەوە، یاخود تا چ ڕادەیەک لە ڕێگای فاکتۆر و توخمەکانی ترەوە دێنە گۆڕان.

جا چونکە ناوەرۆک و فۆرم دەتوانرێت بە شێوەیەکی لە ژماردن نەهاتوو گۆڕانیان تێدا بکرێت، لێکۆڵینەوە، تەنانەت ئەگەر خۆشی تەنها بە گرنگترین بەشەکانی

ممەیزاتی قسەوە خەریک بکات، لەبەردەم ئەرکێکی گران و نادیاردا وەستاوە. تەنها بە ڕیزێک هەوڵدانی یەک لـەدوای یەک و دووروودرێـژ و تـەواو لەگەڵ گۆڕینی سیستەمیانەی قسەکە دەتوانرێت لە دەرەوەی سنوری تاقیکردنەوە، ئەنجام و بناغەی گشتیی بدۆزرێتەوە. ئەگەر ئەوە لەبەرچاوبگرن کە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی کۆمونیکەیشن چەند تازەیە، ئەوا دەتوانین لـەوەش تێبگەین بۆچی زانینمان لەسەر ئاستی ئەم بوارە چەند سنوردار و بچووکە هەرچەندە تاکە لێکۆڵینەوە بە ژمارە زۆریشن.

کەتەلۆگێکی بچووکی ناتەواو ئاماژە بەوەدەکات، چ ممەیزاتێکی قسە وەکـو دەستنیشانکەر لە پرۆسێسی کاریگەریدا پشکنراون و لێیان کۆڵراوەتەوە. لێرەدا پێویستە ئێمە خۆمان لەوە بپارێزین میتۆد و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان بە ووردی باس بکەینەوە و مشتومڕیان لەسەر بکەین، ئەم ئەرکە دەتوانرێت تەنها لە کارێکی سەربەخۆدا دەربـارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن جێبەجێ بکرێت.

لە لێکۆڵینەوە ئەزموونیەکاندا لەوە کۆڵراوەتەوە کە چۆن کاریگەریەکان دەگۆڕێن:

ئەگەر دەلیلەکانی قسەکە باش و پێشیان پێبکرێت. لێرەدا مەسەلەکە بریتیە لە کاریگەریە ڕێژەییەکەی ڕیزکردنی دەلیلە بەهێز و کەمتر بەهێزەکان، کەواتە دەربارەی ئەو پرسیارەی کە ئایا دەلیلەکان لە کۆتایی یاخود سەرەتای قسەکەدا گەورەترین کاریگەرییان هەیە، ئەو (Law of primacy) یەی لەلایەن لەندەوە دانراوە لەلایەن شێۆن بێرگەوە پشتگیری کراو لەلایەن هاڤلاند و هاوەڵەکانیەوە پشکنرا و ڕاستکرایەوە و جوانتر دەستنیشانکرا.

ئەگەر لە بابەتێکی مشتومڕ لەسەرکراودا تەنها دید و بۆچوونی لایەنێکیان یاخود هی هەردوو لایەنەکە پیشان بدرێن.

ئەگەر لە قسەکەدا ئەنجامەکان بە مەبەست زەقبکرێنەوە یاخود ئەم کـارە بۆ ڕێتسپیێنت بەجێبهێڵرێت.

ئەگەر قسەکە بە ئاشکرا وەکـو پرۆپاگەندە پێشکەش بکرێت یاخود مەبەستەکانی پرۆپاگەندەی کۆمونیکاتۆر داپۆشراوبن.

ئەگەر قسەکە سەرزارەکیی هەڵگری تۆنێکی دراماتیکی- دینامیکی بێت یاخود تۆنێکی ئاسایی پێببەخشرێت.

ئەگەر قسەکە دەلیلی شەڕانگێزانە یاخود دەلیلی ئاسایی لە خۆ بگرێت.

ئەگەر قسەکە داواکاریی عەقڵانی یاخود ئینفیعالیی تێدابێت.

ئەگەر ڕیکلام دەلیلی پۆزەتیڤ (وروژاندنی هیوا و ئاوات) یاخود دەلیلی نەگەتیڤ (خۆلادان لە شتی خراپ) بەکاربهێنرێت.

کۆمەڵێکی زۆری تری هەوڵدان کە یەکجار ئەوەندە سیستەمیانە نین و زیاتر پراگماتیکی خۆیان بە تاکە حاڵەتەوە خەریککردوە بەرچاوەدەکەون، کە کاردانەوەی ڕێتسپیێنت لەسەر قسەیەکی دیاریکراو دەپێون و لەسەر بناغەی زانیاریی ئەو پێوانە، قسەکە هەمیشە و تائەوڕادەیە دەگـۆڕن هەتا کاریگەرترین فۆرمی دەدۆزنەوە. لێرەدا پێویستە بەتایبەتی ئـامـاژە بـەو تاقیکردنەوانە بکەین کە بە ئامێری Programm – Analystor جێبەجێکراون.

پاشتر ژمارەیەکی زۆری تری لێکۆڵینەوە خۆیان بە کاریگەریە ڕێژەییەکەی فۆرمی تەکنیکیی ممەیزاتی

قسەوە خەریککردوە، بە جۆرەکانی ڕستە لە چاپکردندا، چۆنیەتی ڕیزکردن و دانانی وێنە لە گۆڤارەکاندا، بە فۆرمەکانی پیشاندانەوەی سادە یاخود مجسم، هەروەها بە فلیمە بەرهەمهێنراوە ڕەش و سپی یاخود ڕەنگاوڕەنگەکانەوە، بە فۆرمی پێشکەشکردنی هەواڵەکانی تەلەفزیۆنیەوە، بە ڕیکلامەکانەوە... هتد.

بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر ئاستی ئەم بوارە، ئەوە کەڵکێکی زۆری دەبێت ئەنجامی ئەم کارانە با کەموکوڕ و ناتەواویش بن، لە کارێکی شیکاریانەی ڕەخنەگرانە و مقارەنەکراودا کۆبکرێنەوە.

تائیرە ئەوەندە دەربارەی قسەیەکی دیاریکراو لە پرۆسێسی کاریگەریدا. بەڵام بە گشتی لە مناقەشە گشتیەکاندا مەسەلەکە هەمیشە و بە تەنها بریتی نیە لە کاریگەریی قسەیەکی دیاریکراو، بۆ نمونە ئەگەر قسە دەربارەی کاریگەریی زیانبەخشی تەلەفزیۆن لەسەر منداڵ و گەنج بکرێت، ئەوا بە دەگمەن مرۆڤ مەبەستی لە پرۆگرامێکی تایبەتە، بەڵکو لە بناغەدا مەبەست ئەو واقیعەیە کە کۆی هەموو پرۆگرامەکان پرۆگرامێک پێکدەهێنێت و لەناو ئەم پرۆگرامەدا بە تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر هەندێک ناوەڕۆکی دیاریکراو یاخود مەمەیزات کۆدەبنەوە و دەبنە هۆی دروست بوونی کاریگەریی، کە ئەگەری هەیە قووڵتر و چەسپاوتر بمێننەوە وەک لە کاریگەریی تاکە یەک پرۆگرامی بەهێز و ناوەڕۆک باش.

بەم شێوەیە مرۆڤ ئاماژە بەو مەترسیانە دەکات کە ئەگەری دروست بوونیان هەیە، ئەگەر لە فلیم و بەرنامە تەلەفزیۆنیەکاندا شەڕانگێزی و تاوانکاری زۆریان تێکا کۆبکرێتەوە، ئەگەر لە گۆڤار و چیرۆکە کۆمیدیەکاندا وێنەی ڕەگەزپەرستی شێوێندراو و دووبارەکراوە و سواویان تێدا بڵاوبکرێتەوە، وە یاخود لە تێکستی زەقکراوەدا بە درۆ باس لە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی بکرێت. ئەگەر لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بخوازێت لەم کاریگەریانە بکۆڵێتەوە ئـەوا پێویستە لـەسـەری لەپێشدا بابەتیانە ئەوە دەستنیشان بکات، کە مەمەیزاتی قسە دیاریکراوەکە لە پرۆگرامەکەدا کامانەن و چۆن دانراون، بە چ جۆرێک و چەندجار و لە چ پەیوەندیەکدا دێنە پێشەوە، بە تێپەڕبوونی کات چ مەیلێک دروسـت دەکـەن... هتد. ئەم ئەرکە دەتوانرێت ئەمڕۆ بەهۆی شێوازی لێکۆڵینەوەی قسەوە تا ڕادەیەکی باش جێبەجێبکرێت. بەم شێوەیە ئـەم میتۆدەیە ئـەوەی دەرخـست کە بەرنامەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئەمریکی هەروەها چیرۆکە کورتەکان لە گۆڤارە جەماوەریەکاندا، ئەمریکیە (ڕاستەقینەکان، ئەسڵەکان) لە ئاستێکی سەرو ئاساییدا پیشاندەدەن و تیشکێکی تایبەتیان دەخەنەسەر و جێگایەکی باشیان بۆ دادەنێن، کە ناکۆکیەکان لە بەرهەمە دراماتیکیەکاندا زیاتر لە کەموکوڕی خودی تاکە کەسەکانەوە سەر هەڵدەدەن وەک لە هێزە کۆمەڵایەتیەکانەوە، کە مرۆڤی پیر لە فلیمە ئەمریکیەکاندا کەمتر دەردەکەون وەک لە ژیانی ڕاستەقینەدا... هتد. ئەمانە و زانیاری تری لەم جۆرەی لێکدانەوەی قسە، پێویستە لەگەڵ ئەو پرۆسێسانەی لای جمهور دەردەکەون و چاودێری دەکرێن – لەگەڵ هەبوونی مەیلی شەڕانگێزی لای گەنجان، لەگەڵ گۆڕانەکانی هەڵوێست، لەگەڵ کاریگەریەکانی فێربوون... هتد – کۆبکرێنەوە و پەیوەندیەکانیان پێکەوە دیاری بکرێت، بۆئەوەی، بە لەبەرچاوگرتنی هەموو فاکتۆر و توخمەکان، ئەوە بپشکنرێت ئایا وە تا چ ڕادەیەک دەتوانین

ئەم پرۆسێسانە وەکو کاریگەریی ممەیزاتی ئەو قسانە لە پرۆگرامەکەدا تێبگەین. بەڵام ئەم جۆرە کارکردنە، لە بواری عەمەلیدا تووشی گیروگرفتێکی زۆری میتۆدەیی دەبێت کە تاکو ئێستا بەشێکی کەمی دەتوانرێت جێبەجێبکرێت. هەروەها پەیوەندیدار بەم بابەتەوە ئەو پرسیارەی کە بۆ پەروەردەکردن و ریکلام و پڕوپاگەندە زۆر گرنگە دێتە پێشەوە، کاریگەریەکان چۆن بەڕێوەدەچن ئەگەر ڕێتسپییێنت هەندێک قسەی دەستنیشانکراو وە یان ممەیزاتی هەندێک قسەی بە شێوەیەکی پلان بۆدانراو و سیستەمیانە چەندبارە پێشکەش بکرێت، هەرچەندە لەم بارەیەوە زۆر لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل لەبەردەستدان، بەڵام تاکو ئێستا ئەم گیروگرفتە بە هیچ جۆرێک هەموو لایەنەکانی دەرنەخراوە.

پوختەی باسەکە، پەیوەندیەکانی کاریگەریی لەنێوان فاکتۆرەکانی قسە و ڕێتسپییێنتدا ئەوپەڕی ئاڵۆز دەردەکەون، ئەوەندە ئاڵۆز کە ئەو ئامۆژگاری و بناغانەی زۆرجار لە ئەدەبیاتدا بەرچاودەکەون بۆ ئامادەکردن و پێشکەشکردنی قسە، زۆر ناسیستەمی و ناتەواو دەردەکەون و ناتوانن یارمەتیدەری کەسی ئامادەکاربن، بۆ نمونە ئەگەر بگوترێت:

١ – قسەکە پێویستە بەوجۆرە ئامادەبکرێت و پێشکەش بکرێت، کە سەرنجی ڕێتسپییێنتی خوازراو ڕابکێشێت.

٢ – قسەکە پێویستە لە زمانەکەیدا لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی ڕێتسپییێنتدا بگونجێنرێت.

٣ – قسەکە پێویستە لای ڕێتسپییێنت هەندێک پاڵنەر (دافع) بە ئاگا بهێنێت و لە هەمانکاتیشدا ڕێگای جێبەجێکردنی ئەو پاڵنەرانە پیشانبدات.

٤ – قسەکە پێویستە بەو جۆرە دروست بکرێت کە لەگەڵ داواکاریەکانی ئەو گروپەدا بگونجێت کە خودی ڕێتسپیێنتی تێدایە، ئەگەر بیانەوێت بەوجۆرە هەڵسوکەوت بکات کە مەبەستمانە.

## ٣ – میدیا لە پرۆسێسی کاریگەرییدا

ماس کۆمونیکەیشن لەو ڕێگایەوە لە کۆمونیکەیشنی ئاسایی و ڕووبەڕوو جیادەبێتەوە، کە قسە هەمیشە لە ڕێگای تەکنیکی میدیایەکەوە بە ڕێتسپییێنت دەگەیەنرێت. فاکتۆری میدیا پرۆسێسی کۆمونیکەیشن بە شێوەیەکی بڕیاردەر دەگۆڕێت. لێکدانەوەکەمان شەش جۆر ممەیزاتیان دەرخست کە بە هۆیانەوە پەیوەندیی نێوان ڕێتسپییێنت – میدیا دەستنیشان دەکرێن. لێرەشدا پێویستیمان بە سەلماندنی دوورودرێژ نیە کە هەموو ئەم ممەیزاتە لە پرۆسێسی کاریگەریدا دەوردەبینن، کە کاریگەریەکان بە شێوەیەکی جەوهەری بەوانەوە پەیوەستن، واتە ئایا قسەکە تەنها لە ڕێگای بینین یاخود تەنها گوێگرتن وە یاخود بینین– گوێگرتن وە دەگەیەنرێت، ئایا ڕێتسپییێنت لە سلوکیدا سەربەستە یاخود پەیوەستە، ئایا ریتسپینت لە کاتدا سەربەستە یاخود پەیوەستە، ئایا قسەکە بە چواردەورێکی دەستنیشانکراوەوە پەیوەستە یاخود چواردەورێکی ئاسایی ناوماڵ وە یان لە چواردەورێکی تایبەتی وەکو ئاهەنگێکدا ڕادەگەیەنێت، ئایا ڕێتسپییێنت قسەکە بە تەنها وە یاخود لەناو گروپێکی تایبەتی وە یان لەناو جمهورێکی ئامادەدا وەردەگرێت، ئایا قسەکە (ڕاستەوخۆ) وە یان هەڵگیراو (تسجیلکراو) پێشکەش دەکرێت.

لە کۆبەنەوە و تێکەڵبوونی ئەو شەش ممەیزاتەوە

مەرجەکانی کاریگەریی هەر میدیایەک دەردەکەوێت. لێکدانەوەی ئەو مەرجانە بە دوورودرێژی ئەرکی سەرشانی زانستی میدیایە. ئێمە لێرەدا ئەوەندەمان بەسە، لە کتێبەکەی کلاپەرەوە دەربارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن لە وەرگێڕانێکی سەربەستانەدا هەندێک بەشی باس بکەینەوە، کە تیایاندا بە کورتی کاریگەریی هەر میدیایەک (بێجگە لە قەوان) پیشان دەدرێت:

وشەی چاپکراو تاکە میدیایەکە ڕێگا بە ڕێتسپییێنت دەدات کات و چۆنیەتی و خێرایی وەرگرتنەکە خۆی دیاری دەکات و قسەکە بە ئارەزووی خۆی چەندجار بخوێنێتەوە. ڕێژێک لە تاقیکردنەوەی لابۆری سالی بیستەکان و سیەکان، هەرچەندە ڕوون و ئاشکرا نەیان سەلماندووە، بەڵام ئەو بیروڕایە دروست دەکەن کە وشەی چاپکراو بە نیسبەت هێشتنەوە و خەزنکردنی بابەتی چڕوئاڵۆزەوە لە وشەی وتراو باڵەدەستترە، بەڵام نەک بە نیسبەت بابەتی سادەوە. وشەی چاپکراو لای جمهورێکی بچووکی شارەزا ئەوپەڕی کاریگەرە، بە توندیی بە چەمکی کولتورەوە بەستراوەتەوە و جێگا و ناوبانگی جیاوازی لای گروپە جیاوازەکانی ڕێتسپییێنت هەیە. پاشتر پێویستیی بە بەشداریەکی گەورەتر و ئەکتیڤتر و خولْقێنەرتری ڕێتسپییێنت هەیە وەک لە میدیاکانی تر. نابێتە هۆی ڕووبەڕووکردنەوەی خوێنەر و کۆمونیکاتۆر بە بینین یاخود گوێگرتن وەکو فلیم و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن وە بەم هۆیەشەوە مەودایەکی گەورە بۆ فەنتازیا دروست دەکات. خوێنەر لە بناغەدا کەمتر هەست بەوەدەکات کە ڕاستەوخۆ خودی قسە لەگەڵکراوەکە وەک لە گوێگرانی ڕادیۆ و بینەرانی فلیم و تەلەفزیۆن، بەڵام ئەو لەکاتی خوێندنەوەدا ئەکتیڤبوونی زیاتری دەکەوێتەسەر، ئەو واقیعەی کە مرۆڤ بەتایبەتی زۆر بە گرنگی دەزانێت بۆ کاریگەریی، بێئەوەی بەتەواوی سەلمێنرابێت. ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەم بەشداریکردنە ئەکتیڤە، بەلایەنی کەمەوە هەندێکجار، ببێتە هۆی کاردانەوەی ڕەخنەگرانە کە پاشتر کاریگەریی لاواز بکات یاخود بێ لایەنی بکات.

ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەگەنە پەیوەندیەکی کەسایەتی زۆر گەورە لەنێوان کۆمونیکاتۆر و ڕێتسپییێنتدا وە وێناکردنی واقیع لە هەمووان بەهێزتر دەگەیەنن. بێجگە لەوەش ئەم دوو میدیایە دەگەنە نزیکەی سەرجەمی کۆمەڵگا، کەواتە ئەو بازنەی خەڵکانەش کە لەلایەن میدیاکانی ترەوە ڕوویان تێناکرێت، بۆ نمونە وەکو مرۆڤی زۆر پیر وە زۆر گەنج وە یاخود مرۆڤی کەم خوێندەوار وە یان نەخوێندەوار. ئەو ماددانەی لەلایەن ڕادیۆوە پێشکەش دەکرێن، ئەگەر سادە بن، بە ڕێژەیەکی باش وەردەگیرێن و لە بیروباوەڕیدا دەمێننەوە، لەپێش هەمووشتێکدا لای ئەو ڕێتسپێنتانەی خوێندەواریان کەمە و ڕادەی ڕۆشنبیریان نزمە. ڕادیۆ کە تەنها بەهۆی بیستنەوە کاردەکات، پێویستی بە بەشدارییەکی ئەکتیڤتری ڕێتسپییێنت هەیە وەک لە تەلەفزیۆن. ڕادیـۆ ئاسانترین میدیایە بۆ بەکارهێنان بەڵام ناردنەکەی زۆرجار وەکو دەنگە دەنگی باکگراوند بەکاردەهێنرێت و نزیکەی بە دەگمەن بە ئاگایی و تەرکیزەوە گوێی لێدەگیرێت.

میدیا وێنەییەکانی تەلەفزیۆن و فلیم بۆیە بەتایبەتیی گرنگن- مرۆڤ وا بیریان لێدەکاتەوە- چونکە ئەوان وێنە پێشکەش دەکەن. هەردووکیان پێویستیان بە ڕووتێکردنێکی ڕێتسپییێنت هەیە وەک لە میدیاکانی تر. ژمارەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەی

ساڵەکانی سیەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە زۆربەی مندالان و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی تەمەن گەورە، ئەو مادە زانیاری هەڵگرانەی لە ڕێگای فلیمەوە دەگەیەنرێن وەکو حەقیقەت سەرنج دەدەن و بەتایبەتیش باش لای خۆیان دەیان هێڵنەوە. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی پاشتر یەکگرتوو نین و هەندێک جاریش نێوان دژن لەگەڵ یەکتر دەربارەی ئەو پرسیارەی کە ئایا ئەو زانیاریانەی لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە بڵاودەکرێنەوە باشتر هەڵدەگیرێن و دەهێڵرێنەوە وەک لە بڵاوکردنەوەی هەمان مادە لە کۆڕدا، بە وشەی چاپکراو وە یاخود لە رادیۆدا.

تائێرە بیروڕاکانی کلاپەر بوو دەربارەی توخمەکانی کاریگەریی یەکەیەکی میدیاکان.

ژمارەیەکی یەکجار زۆری لێکۆڵینەوە خۆیان بە کاریگەریەکانی میدیا هەمە جۆرەکانەوە خەریک دەکەن، لێرەدا ئەو بوارەمان نیە و ئەرکی ئێمەش نیە ئەو لێکۆڵینەوانە دابەش بکەین بەسەر میدیاکاندا و لێکیان بدەینەوە و هەڵیان بسەنگێنین. تەنها هەندێک سەرنج و ئاماژەدان پێداویستیەکانمان جێبەجێ دەکەن.

ئەگەر لە لێکۆڵینەوە ئەزموونیەکاندا کاریگەریی میدیایەک پشکنینی لەسەر بکرێت، ئەوە بەو مانایە نایەت، کە ئەو کاریگەریانە ئیتر لە هەموو حاڵەتێکدا سیفاتی میدیان. ئەگەر بسەلمێنرێت کە قسەیەکی دیاریکراوی میدیایەکی دیاریکراو کاریگەرییەکی دیاریکراوی هەیە، ئەوا لە هەموو حاڵەتێکدا ئەو پرسیارە بەکراوەیی دەمێنێتەوە، کە ئایا هەمان قسەی گەیەندراو لە ڕێگای میدیایەکی ترەوە دەبێتە هۆی هەمان کاریگەریی وە یاخود جۆری کاریگەریی تر. تەنها ئەگەر هەمان قسە لە میدیا هەمەجۆرەکاندا کاریگەریی هەمەجۆریان هەبێت، دەتوانرێت ئەو جیاوازیانە – بەمەرجێک فاکتۆر و توخمەکانی تر بە چەسپاوی بمێننەوە – وەکو سیفاتی هەمەچەشنی میدیا لێک بدرێنەوە، ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوەی ئەزموونی لەم پرسیارە دەکۆڵنەوە: هەمان قسە پێشکەشی چەند گروپێکی یەکسان دەکرێت، جارێک لە ڕێگای میدیایەک و جارێکی تریش لە ڕێگای میدیایەکی ترەوە. جیاوازیی کاریگەریە پێوراوەکان پاشتر وەکو جۆری کارکردنی هەردوو میدیاکە سەرنجیان دەدرێتێ، هەر لەسەر ئەم شێوەیە — ئەگەرچی هەرجارێک بە پرسیاری جیاوازەوە — میدیاکان لە کۆکردنەوەی جیاوازدا لەگەڵ یەکتر دانران. لێرەدا هەندێک نمونە دەهێنینەوە، ئەم میدیایانە لەگەڵ یەکتر مقارەنەکران:

وشەی چاپکراو لەگەڵ ڕادیۆ
وشەی چاپکراو لەگەڵ کۆڕگرتن
ڕادیۆ لەگەڵ تەلەفزیۆن
ڕادیۆ لەگەڵ فلیم
کۆڕگرتن لەگەڵ فلیم
تەلەفزیۆن لەگەڵ شانۆ

نرخاندنێکی ڕەخنەگرانە و بە یەکگرتنی هەموو پشکنینەکانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە، خزمەتێکی یەکجار بەنرخی زانستی میدیا دەکات. بۆ نمونە ڕوون و ئاشکرا ئەوە دەردەکەوێت، کە کاریگەریی ڕێژەیی میدیایەک بە پێوانەیەکی گەورە پەیوەستە بە بابەتی قسەکە. بە شێوەی پێشکەش کردنەکە و فاکتۆرەکانی ترەوە، کەواتە بە پێی ئەم مەرجانە هەرجارەو میدیایەک باڵادەستە. ڕیزکردنێکی موتڵەقی میدیاکان بەپێی کاریگەریە سەرەکیەکانیان ناتوانرێت دابنرێت.

پێویستە لێرەدا ناوی ئەو لێکۆڵینەوانەش بهێنین دەربارەی کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری میدیا لەگەڵ یەکتر، شێوازێک کە کاریگەریی زۆر زیاتر دەکات.

## ٤ - ڕێتسپییێنت لە پرۆسێسی کاریگەریی دا

کە ڕێتسپییێنتی جیاواز بۆ هەمان قسە (لەژێر هەمان مەرجی وەکو یەکدا) کاردانەوەی جیاوازیان هەیە، زانیاریەکی تازە نیە. کەواتە کە هەر ڕێتسپییێنتێک لە خودی خۆیدا کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن دیاری دەکات، پێویستی بە سەلماندن نیە. بەڵام بەشێوەیەکی تەدریجی و تا ڕادەیەک درەنگیش لێکۆڵینەوە ڕووی کردە ئەو پرسیارەی چۆن وە بە چ قەبارەیەک و لەژێر چ مەرجێکدا یەکەیەکەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن پەیوەستن بە خودی ڕێتسپییێنتەوە.

شیکاریە تیۆریانەکەی پرۆسێسی ماس کۆمونیکەیشن لە سێ بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە فاکتۆری ڕێتسپییێنت بەهۆی دوو ڕێگاوە، یەکێکی ڕاستەوخۆ و یەکێکی ناڕاستەوخۆ، دەچێتە ناو پرۆسێسی کاریگەرییەوە:

جارێکیان ئەو گۆڕانانەی کە ئێمە وەکو کاریگەریی نیشانیان دەکەین، پەیوەستن ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بە ڕێتسپییێنتەوە وەکو کەسایەتیەک لە حاڵەتێکی دیاریکراودا. ئایا ڕێتسپییێنت لەکاتی بێ ئیشی خۆیدا ئامادەیە کاریگەریی لێبکرێت، چی وە چەند فێردەبێت، ئایا وە چۆن بیرورِا و هەڵوێستی دەگۆڕێن، ئەمانە و کاریگەریەکانی تریش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ڕێگای سترکتوری کەسایەتی ڕێتسپییێنتەوە هێزی پاڵپێوەنەری ئەو



زەنگلێدەرەکەی نۆتردام

کاتەیەوە (دافع) و لە ڕێگای ئەو حاڵەتە بابەتی و زاتیەی ئەو کاتەوە دیاری دەکرێن.
جارێکی تریان ڕێتسپییێنت ناڕاستەوخۆ کار لە پرۆسێسی کاریگەریی دەکـات، کە ئەو فاکتۆر و توخمانە دەهێنێتە گـۆڕان کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا وەکو خۆی گرنگی کاریگەریی دەستنیشان کـرابـوون. ئەگەر لـەوێ بـاس لـەوە کرابێت کە هەرسێ فاکتۆری کۆمونیکاتۆر، قسە و میدیا بە شێوە تایبەتیەکانیانەوە، بە ممیزاتەکانیانەوە و بە فۆرمەکانی دەرکەوتنیانەوە بەشدارن لە کاریگەرییدا، ئەوا پێویستیشە لەگەڵیدا هەمیشە ئەوە بگوترێت کە مەسەلەکە هەر بەتەنها ئەو فاکتۆرانە نیەو لەسەر ئەوان بەند نیە. بەڵکو جەوهەری تریش ئەوەیە کە ڕێتسپییێنت چۆن ئەو فاکتۆرانە دەبینێت و لێکیان دەداتـەوە. کەواتە پرۆسێسی کاریگەریی هەر بە تەنها لە ڕێگای ئەو سێ فاکتۆرەوە نایەتە دی، بەڵکو هەروەها لە ڕێگای پەیوەندی ڕێتسپییێنتەوە بەو سێ فاکتۆرەوە. وە ئێستا ئەم هەموو پەیوەندی توخمانە لەلای خۆیانەوە لەسەر یەک کۆدەبنەوە، فۆرمیان دەگۆڕێت، لەلایەن ڕێتسپییێنتەوە دەگۆڕێت وەکو کەسایەتیەک لە حاڵەتێکی دیاریکراودا. لێرەدا ئەم توخمانە کە پرۆسێسی کاریگەریی کارلێدەکەن، بە (چەند پلەیەک) بەڕێوە دەچن، ئەم توخمە پەیوەندی دارانەی بواری کۆمونیکەیشن خۆشیان لە ڕێگای فاکتۆری ڕێتسپییێنتەوە کاریان لێدەکرێت. بۆ نمونە: کاریگەریی قسەیەک لە پاڵ فاکتۆری تردا بە ناووناوبانگی کۆمونیکاتۆریشەوە بەندە، بەڵام کۆمونیکاتۆر چ ناوبانگێکی لای ڕێتسپییێنت هەیە، ئەوە لە ڕێگای توخمەکانی کەسایەتی و کۆمەڵایەتی و حاڵەتی وەرگرتنەکەی ڕێتسپییێنتەوە دیاری دەکرێت.

لەسەر بناغەی ئەم پەیوەندیە چڕ و ئاڵۆزانە و ئەو واقیعەی کە ئێستا ئەو فاکتۆر و توخمە هەمە چەشنانەی کارلێکەر و کارلێکراو لەگەڵ یەکتر و بە چەندین شێوە پەیوەندیان پێکەوە هەیە و وەزیفی پێکەوە بەستراونەتەوە. ڕوون و ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت چ ڕێگایەکەی دژوار و گران تووشی لێکۆڵینەوەی ئەزموونی دەبێت، ئەگەر هەوڵ بدات کاریگەرییەکی دیاری کراو بگێڕێتەوە وە یاخود بە پێچەوانەوە کاریگەریی فاکتۆر و توخمێکی دیاریکراو ڕوون و ئاشکرا بسەلمێنرێت.
لە ڕووی تیۆریەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێین کە فاکتۆری ڕێتسپییێنت – جا ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆبێت – بە هەموو توخمەکانیەوە بـەشـداری پـرۆسـێـسـی کـاریـگـەریـی دەبـێـت. لێکۆڵینەوەی ئەزموونی کاریگەریی تا ئێستا دەربـارەی ئەو پەیوەندیانە لە ڕووی چەندییەوە کارێکی باشی بە ئەنجام گەیاندوە. بەڵام بە گشتی سنوردار و کەموکوڕن. ژمارەیەکی زۆر وە لەوانەیە زۆر گرنگیش توخم تا ئێستا لێیان نەکۆڵراوەتەوە. بێ ئەوەی هەوڵی دانانی سیستەمێک بدەین یاخود کارێکی تـەواو بێ کەموکوڕ پێشکەش بکەین. سەرنجێکی بچوک دەدەینە گرنگترین توخمەکانی فاکتۆری ڕێتسپییێنت کە وەکـو زۆر گرنگ بۆ کاریگەریی دەستنیشانکراون، کەواتە کە کاریگەری وەزیفی پێیانەوە پەیوەستە.
ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوە کاریگەریی توخمەکانی وەکو ڕەگەز (نێرو مێ)، تەمەن، هۆشیاری، پلەی خوێندەواری، سەربون بە چینێکی کۆمەڵایەتی، ئەندامی گروپێکی تایبەتی، شارنشین و لادێ نشین... هتد یان سەلماندوە.
توخمێکی گرنگی تر – وەکو لە لێکۆڵینەوەکانی

هۆڤلاند و جانیس و کێللی و هی تردا دەردەکەوێت – بریتیە لە گەورەیی یاخود بچووکیی هەبونی توانای کارلێکردن لە ڕێتسپیێنت. ئەم توخمە لە لایەکەوە لای تاکە کەس وەکو (میزە) یەکی نزیکەی چەسپاوی کەسایەتی دەردەکەوێت، لەلایەکی ترەوە لە سنورێکی دیاریکراودا گۆڕانی بەسەردا دێت بە پێی حاڵەتە تایبەتیەکە، بەم شێوەیە مرۆڤ لە حاڵەتێکی بەرچاو تاریک و گراندا مەیلی زیاتر دەبێت و زیاتر ئامادەیە کاریگەریی لێبکرێت.

پاشتر کاریگەریەکان پەیوەستن بەوەوە. کە ئایا ڕێتسپیێنت بە ڕادەیەکی زۆر یاخود کەم نائومێدە، کە ئایا لە باری دەروونیدا گیروگرفتی هەیە، کە ئایا ترس یەکێکە لە توخمە سەرەکیەکانی کەسایەتی ئەو.

کاردانەوەکانی ڕێتسپیێنت پاشتر لە ڕێگای حاڵەتە تایبەتیەکەی پێداویستی و هێزی پاڵێوەنەر (دافـع)و ئاستی چاوەڕوانیەوە دیـاری دەکرێت. بـەم شێوەیە کاریگەریەکانی بـەرزکـردنـەوەی هەستی شەڕانگێزی یاخود نزم کردنەوەی هەستی شەڕانگێزی لە قسەکەدا پەیوەستن بە ئاستی هەبوونی زۆری و کەمی مەیلی شەڕانگێزی لای خودی ڕێتسپێنت. بێجگەلەوەش وادەردەکەوێت کە قسەیەک کاریگەریی زیاتربێت، ئەگەر ڕێتسپێنت ڕوون و ئاشکرا بۆی دەربکەوێت کە قسەکە بە پیر پێداویستیەکانی ئەوکاتەیەوە یاخود پێداویستیە هەمیشەییەکانیەوە دەچێت. لێرەدا لێکۆڵینەوەی کاریگەری ڕوودەکاتە زانستی لێکۆڵینەوە لە هێزی پاڵێوەنەر (دافع)ی سایکۆلۆژی، کە ئەویش لەلایەن خۆیەوە دەتوانێت زانـیـاری بەنرخ پێشکەشی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی بکات.

زۆر بە چڕی و فراوانی، لێکۆڵینەوە خۆی بەو پرسیارەی کە بۆ پـەروەردەکـردن، ڕیکلام و پڕوپاگەندە گرنگیەکی مەزنی هەیە، خەریک کردووە، ئایا هەڵوێست و بیروڕا سەرەتاییەکانی ڕێتسپیێنت چ ڕۆڵێکی لەسەر کاریگەریی وازی دەکەن. زۆر بە گشتی و بە چاوپۆشین لە هەندێک زانیاری بچوک، لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخست کە کاریگەریی زیاتر و گەورەتر دەبێت، ئەگەر قسەکە زیاتر جووت بێت لەگەڵ ئەو بیروڕا و هەڵوێستانەی پێشتر ڕێتسپیێنت هەیبون، کەواتە هەتا قسەکە زیاتر لەگەڵ ئامادەیی کاردانەوەدا هاوئاهەنگ و لە هارمۆنی دابێت، بە پێچەوانەوە لا حاڵەتی ڕێک نەکەوتن لەنێوان قسەکە و بیروڕا سەرەتاییەکاندا تەنها کاریگەریەکی زۆر بچووک وە یاخود هەر هیچ وە یان دیـاردەی Bumerang – effekt لە دژی مەبەستەکانی کۆمونیکاتۆر دەردەکەوێت. نزیکەی کاریگەرییەکی گـەورە ئـەگـەری هەیە ، ئەگەر ڕێتسپێنت دەربـارەی ئەو بابەتانەی لە قسەکەدا دێن تا ئەو کاتە هیچ بیروڕایەکی دروست نەکردبێت. پاشتر کاریگەریەکان لە زۆر حاڵەتدا پەیوەستن بەوەشەوە، تا چ ڕادەیەک ڕێتسپێنت بۆ وەرگرتنی هەواڵێک. ڕاپۆرتێک وەیان ڕوداوێک ئامادەیە.

توخمێکی تری گرنگی کاریگەریی بریتیە لە حاڵەتی کۆمەڵایەتی ڕێتسپیێنت. هەروەکو لە بەشی دوەمی کتێبەکەدا باسکرا، کاردانەوەی ڕێتسپیێنت وەکو کاردانەوەی کەسێکی تەنها و عەزلکراو نیە، بەڵکو لە چوارچێوەی پەیوەندی هەمەلایەنەی کۆمەڵایەتیدا دێتەدی. ئەم جۆرە توخمە کۆمەڵایەتیە، جارێک بریتیە لە کۆمونیکەیشنی ڕاستەوخۆی کەسێتی، توخمێکە لەلایەکەوە لە هەڵبژاردندا و لەلایەکی

تـرەوە لە بیروڕادەربڕیندا دەربـارەی قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن دەورێکی جەوهەری دەبینێت، جارێکی تر ئەندام بوونی ڕێتسپیێنت لە گرووپێکدا دەورێکی گرنگ لە پرۆسێسی کاریگەریدا وازی دەکات: هەتا زیاتر هەستی مرۆڤێک بەهێزتر بێت بۆ گرووپێک وە پێوانەکانی ئەو گروپە وەکو پیرۆز و لە شکان نەهاتوو سەرنج بدات، زیاتر کارێکی گران دەبێت، ئەو بیروڕا و هەڵوێستانەی لەسەر بناغەی ئەو پێوانانە هەڵچنراون، بگۆڕدرێن.

ئێستا پـاش ئـەم بـژاردنـە پوخت و کورتەی فاکتۆر و توخمە کەسایەتی و کۆمەڵایەتیانەی تێکەڵی پرۆسێسی کاریگەریی دەبن، هێشتا هەر نەگەیشتوینەتە کۆتایی. ئاماژەی سودبەخش و بە کەڵک دەربارەی هەندێک توخمی گرنگی تری کاریگەریی لەو کارانەدایە کە تیایاندا هاوشێوەی قسەکان بۆ ڕێتسپیێنت شی دەکرێتەوە. بەم شێوەیە بە پێی بۆچونەکانی وۆرنـەر و هاری، ئافرەتانیماڵەوە، کە بە ڕێکوپێکی و بێ دابڕان گوێ لە بەرنامە ڕادیۆییەکەی (The Big Sister) دەگرن، لە ڕێگای ئەم سیفەتانەوە دەناسرێنەوە: وا سەرنج لە خۆیان و منداڵەکانیان دەدەن کە پەیوەستن بە پـیـاوەکـەوە، دونـیـای دەرەوەی خێزانەکە وەکو هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی خێزانەکە دەبینن، مەیلیان زیاترە بۆ ترس، بیروڕایان بۆ مۆراڵ (خووڕەوشت) توندوتیژ و نەگۆڕە، شکیان لە نرخی ڕۆڵی خۆیانە وەکو دایک و ژنی ماڵەوە. بایلین دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو منداڵانەی زۆر سەیری (وێنەی میدیایی) دەکەن، زیرەکییەکی خـوار مـام ناوەندیان هەیە و لەلایەن دایـک و باوکیانەوە کەم چاودێری دەکرێن.

ژمارەیەکی زۆری لێکۆڵینەوە خۆیان بەو منداڵانەوە خەریک دەکەن کە قسەکانی ماس کۆمونیکەیشن وەکو (مادەی ڕاکردن لە واقیع) بەکار دەهێنن. ئەم منداڵانە لە زۆر سیفاتی کەسایەتیاندا جیاوازییان هەیە لەگەڵ منداڵانی (ئاسایی)دا: ئەمانە لەناو برادەرەکانیاندا خراپ تێکەڵ بوون، لەلایەن دایک و باوکیانەوە خۆشەویستیان کەمە، سزای توند دەدرێن و ناکۆکی نێوان منداڵ- دایک و باوک لای ئەمانە زۆر گەورەیە.

بـەم جـۆرە کـارانـە لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ڕێگایەکی گرتۆتەبەر کە توخمی تازەتری بەشدار لە پرۆسێسی کاریگەریی دا دەدۆزێتەوە.

لە سـەرو ئەم توخمانەی حاڵەت و کەسایەتی ڕێتسپیێنتیشەوە باشتر توخمە پەیوەندی دارەکان هەن کە لە پرۆسێسی کاریگەریی دا بە پێوانەیەکی گـەورە دەوردەبینن، کەواتە ئەو واقیعانەی کە لە شیکاریی پەیوەندیەکانی نێوان ڕێتسپیێنت و فاکتۆرە سروشتیەکانەوە دەرکەوتن.

کارلێکردنی جەوهەریی لە پرۆسێسی کاریگەریی ئەو شێوەیە دەریدەخات کە چۆن ڕێتسپیێنت، کۆمونیکاتۆر وەکو شەرکێکی ئاسایی و سروشتی لە ژێر مەرجە تایبەتیەکانی ماس کۆمونیکەیشن دا دەبینێت، تێدەگات، لێک دەداتەوە. بەم شێوەیە کاریگەریەکان دەگۆڕێن بە پێی ئەوەی ڕێتسپیێنت چ وێنەیەکی کۆمونیکاتۆر لای خـۆی دروسـت بکات، ڕێتسپیێنت کۆمونیکاتۆر لە چ ڕۆڵێک دا دەبینێت، ڕێتسپیێنت چ پەیوەندییەکی ئینفعالی بەرامبەر کۆمونیکاتۆر لا دروست دەبێت، ئایا وە تا چ ڕادەیەک کۆمونیکاتۆر لای ڕێتسپیێنت وەکو نمونەی باش وە یان پێشڕەو دەردەکەوێت، لە چ فۆڕمێکدا وە بە چ پێوانەیەک ڕێتسپیێنت خۆی لەناو کۆمونیکاتۆردا دەناسرێتەوە، تا چ ڕادەیەک

زۆر کۆمونیکاتۆر لە دیدی ڕێتسپییێنتەوە ناوبانگی باشی هەیە و ڕاستگۆیە.
ئەوەندەی ئەدەبیات دەربارەی ئەو توخمانە و ماناکانیان وەکو فاکتۆری نەخشێنەر و کاریگەر هەبێت، لە بەشی سێهەمی ئەم کتێبەدا باسکراون. پاشتر کاریگەرییەکانی ماس کۆمونیکەیشن پەیوەستن بەوەشەوە کە چۆن پێک گەیشتنی مرۆڤ لەگەڵ قسەکە بەڕێوە دەچێت، کەواتە کە چۆن ڕێتسپییێنت قسەکە دەبینیت و تیایدا دەژی. تەنانەت بە بێ سەلماندنێکی ئەزمونیی دووروردرێژیش دەتوانین بڵێین، هەموو ئەو توخمانەی کە لە لێکدانەوەی پەیوەندی ڕێتسپییێنت: قسەدا بۆمان دەرکەوتن وە ئێمە لەوێ لە چەند قۆناغی زەمەنی یەک لە دوای یەکدا ڕیزمان کردن، ئەوانە هەموو وەکو کاریگەر لە پرۆسێسی کاریگەرییدا بەشدارن. لێرەدا ئەوە ئەرکێکی گرنگ و هەروەها زۆر گرانی لێکۆڵینەوەی کاریگەرییە، مانای پەیوەندی ئەو توخمانە لە چوارچێوەی پرۆسێسی کاریگەریی دا شی بکاتەوە.
بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە پێویستە لە قۆناغی پری کۆمونیکەیشندا (کۆمونیکەیشنی سەرەتایی،پێش کۆمونیکەیشن) ئەوە بپشکنرێت کە چۆن کاریگەریەکان لە ڕێگای پرۆسێسەکانی هەڵبژاردنەوە لەو قۆناغەدا وە هەروەها لە ڕێگای چاوەڕوانیەکانی ڕێتسپییێنتەوە پێش وەرگرتنی قسەکە کاریان تێدەکرێت و نیشان دەکرین. وە لە قۆناغی کۆمونیکەیشنە ڕاستەقینەکەدا ئەو پرسیارە وەڵام بدرێتەوە کە چۆن کاریگەریەکان دەگۆڕێن ئەگەر پرۆسێسی هۆشمەندیی (وەعی) بگۆڕێت، کەواتە بۆ نمونە ئەگەر بەشە جیاوازەکانی قسەکە شێوەی فیگور و بناغەی سەرەکی وەربگرن، ئەگەر قسەکە دەنگ دانەوەی گەورەی پێ ببەخشرێت، ئەگەر مەبەستەکە بە قسەی کورت و پوخت بگەیەنرێت، ئەگەر سەرنجدان بە ئاگاییەوە گۆڕانی بەسەردابێت، ئەگەر پەیوەندیی نێوان ئاستی تێگەیشتن لە قسەکەدا وە ئاستی تێگەیشتنی ڕێتسپییێنت گۆڕانی بەسەردابێت، ئەگەر لە قسە گەیەندراوەکانی تەنها بە بیستن دا وێناکردنی ڕێتسپییێنت گۆڕانی بەسەردا بێت یاخود لە میدیا وێنەییەکاندا فەنتازیا جێگایەکی فراوان یان بچووکی پێ ببەخشرێت، ئەگەر ئەو پرۆسێسە ئەکتیڤ کراوە ئیفیعالیانەی ناو قسەکە لەکاتی پێک گەیشتندا گۆڕانیان تێدا بکرێت، ئەگەر دووری سایکۆلۆژی ڕێتسپییێنت بۆ قسەکە گەورە یاخود بچووک بێت، کەواتە ئەگەر ڕێتسپییێنت بە پێوانەی جیاواز ڕابکێشرێنە ناو ڕووداوەکانی قسەکەوە، ئەگەر لە ڕێگای قسەکەوە لای ڕێتسپییێنت هەندێک ڕووداوی زەمەنی ئەکتیڤ بکرێن، ئەگەر هەستەکانی چێژوەرگرتنی ڕێتسپییێنت گۆڕانیان بەسەردابێت.
زۆربەی ئەم توخمە پەیوەندی دارانەی تاکو ئێستا نە بەتەنها و نە ماناکانیشیان بۆ کاریگەریی ماس کۆمونیکەیشن لێیان نەکۆڵراوەتەوە.
لە کۆتاییشدا پرۆسێسی کاریگەریی لەو ڕێگایەوە کاری لێدەکرێت کە چۆن ڕێتسپییێنت میدیاکە دەبینێت، چۆن دەینرخێنێت و لێکی دەداتەوە. لێرەوە ئەو ئەرکە دەکەوێتە سەرشانی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی. ئەوە دیاری بکات، لە چ فۆرمێکدا و بە چ قەبارەیەک کاریگەرییەکان لە کارکردنە هەمە چەشنەکانی میدیاکاندا دەگۆڕێن هەروەها لەگەڵ ناوبانگ و ڕادەی ڕاستگۆیی میدیاکان بۆ ڕێتسپییێنت.

## D - دەربــــارەی ئاستی لێکۆڵینەوەی ئەمڕۆمان

سەرجەمی لێکۆڵینەوەی مۆدێرنی کاریگەریی و هــەروەهــا شیکاریە تیۆریانەکەی ئێمەش بۆ پرۆسێسی ماس کۆمونیکەیشن، پیشاندەری ئەو زانیاریە بناغەییانەن بۆ چارەسەرێکی زانستیانەی ماس کۆمونیکەیشن: ئەگەر لای ڕێتسپیێنت هەندێک کاریگەریی دیاریکراو ببینریت، ئەوا ئەمانە بە هیچ جۆرێک تەنها هەر لە ناوەڕۆکی قسەکەوە دروست نەبوون وەکو فاکتۆرێکی کاریگەریی ڕاستەوخۆ. لە هەموو پرۆسێسێکی کاریگەرییدا بێجگە لە قسەکە ژمارەیەکی زۆر لە فاکتۆر و توخمی تر بەشدارن. ئەم بیرکردنەوە گرنگ و بە هیلاکی و ماندووبون ئامادەکراوەی کە ئەمڕۆ نزیکەی وەکو شتێکی زۆر ئاسایی دەردەکەویت، بوە هۆی گۆڕانی چەقی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی: لەکاتێکدا سەرەتا مـرۆڤ پرسیاری لـەوە دەکـرد کە ئایا قسەیەک کاریگەریی هەیە وە چۆن ئەم کاریگەرییە دروست دەبیت، ئەمڕۆ مەسەلەکە بە تایبەتیی بریتیە لەو مەرجە کاریگەرانەی کە تیایاندا کاریگەریی دروست دەبێت، کەواتە بریتیە لەو فاکتۆر و توخمانەی کە لە بەشی پێشوودا هێڵە سەرەکیەکانمان باسکرد. کلاپەر لە دەربڕینێکی نەپێکراودا دەربـارەی (Phenomenistic approach) دەدوێت، کە دەبێتە هۆی ئاڕاستەکردنێکی تازەی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی. بۆسەر ئەم بیروباوەڕە ئەو واقیعەش دێت کە تا ئێستا هەقی خۆی تەواو نەدراوەتێ، کە فاکتۆر و توخمە بەشدارەکان بە عەزل کراوی و سەربەخۆ کار لەیەکتر ناکەن، بەڵکو هەموو بەشەکانی بواری کۆمونیکەیشن بەزۆر شێوە پێکەوە پەیوەستن و لەگەڵ یەک بەستراونەتەوە. لەسەر بناغەی ئەم زانیاریە، لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئێستا لەگەڵ ئەوە خەریکە ئەو جۆرە بیرکردنەوە گشتی و سادەیە دەربارەی پرۆسێسی کاریگەریی بخاتە بەر پرسیار و لێکۆڵینەوە، ڕاستی و دروستی دیاردەکانی و لایەنەکانی کارکردن بپشکنێت، وە هەوڵ دەدات مۆدێلی بیرکردنەوەی پەیوەندیە چڕ و ئاڵۆزەکانی فاکتۆر و توخمە کاریگەریەکان و لەیەک کاتیشدا پەیوەست پێکەوە، لە جێگاکەی دابنێت.

بەم شێوە بیرکردنەوە تازەیە سنوری زانستی ماس کۆمونیکەیشن یەکجار فراوان و گەورەبوو، لەهەمان کاتیشدا ئەوپەڕی ئاڵۆزبوو. لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەمڕۆ لە هەست کردن و پێزانین بە گیروگرفتەکانی، زۆر گەورەترە وەک لەو مێتۆدانەی کە لەبەر دەستی دان بۆ بەکارهێنان بۆ چارەسەرکردنیان. بەو سیستەمە مەیدانەی کە بۆ پەیوەندیە چڕ و پێکەوە پەیوەستەکانی فاکتۆر و توخمەکان بەکاردەهێنریت، دەتوانرێت ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر گیروگرفت تەواو و دەقیق دەستنیشان بکرێت بەڵام بۆ چارەسەرکردن و ڕوونکردنەوەیان ئەو میتۆدانەی ئەمڕۆ لەبەردەست دان بـەش نـاکـەن، گرنگترین ئەرکی سەرشانی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی پاشەڕۆ بریتیە لەوەی میتۆدی تازە پەرەپێبدات کە بۆ پرۆسێسەکانی بواری ماس کۆمونیکەیشن تەواو گونجاوبن.

هەر لە گۆشەنیگای ئەم بیرکردنەوەیەشەوە پێویستە لێکۆڵینەوەی کاریگاریی ووریابێت و ئاگاداریی ئاشکراکردن و بڵاوکردنەوەی ئەنجامەکانی بێت. زۆر گریمانە وەکو بۆ نمونە بڕوابوون بە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ و گشتی نێوان ماس کۆمونیکەیشن و شەڕانگێزی گەنجان وە یاخود ئەو بۆچوونەی کە ماس کۆمونیکەیشن ڕێتسپیێنت (پاسیڤ) دەکات، دەرکەوتن کە بۆچونی ناتەواو یان شێوێندراو وە

یاخود تەنانەت هەڵەن. هەروەها بەم شێوەیە پێویستە هەندێک بیروباوەڕی بیستراو و بێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە لێگرتن چەسپێندراو دەربارەی کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن هەروەها بەشێکی لێکۆڵینەوە کۆنەکان لە گۆشەنیگای تازەوە بە وورياییەوە ڕاستی و دروستیەکان تاقی بکرێنەوە.

ئەگەرچی لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەمڕۆمان بە ئاشکرا ئاماژە بە گیروگرفتەکانی و سنووری تواناکانی خۆی دەکات، ئەگەرچی دان بە سیفەتی چڕ و ئاڵۆزی بابەتەکەی خۆیدا دەنێت. وە ئەگەرچی لە پشکنینی پرۆسێسەکانی ماس کۆمونیکەیشندا هەوڵدەدات فاکتۆر و توخمە بەشدارەکان بکاتە چەقی کارکردنی خۆی، ئەوا پێویستیشە لەسەری لەم کـارەدا خۆی لە مەترسیەک بپارێزێت، لەو مەترسیەی کە تەنها فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی پرۆسێسی کاریگەریی بپشکنێت و بەو هۆیەوە خـودی کاریگەریی بیربچێتەوە. لـە کاتێکدا سەرنجدانە گشتی و سەرجەمیەکان زیادەڕەویان بە کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشنەوە دەکرد، چونکە مرۆڤ هێزی لاوازکـردن و بێلایەنکردنی فاکتۆر و توخمە بەشدارەکانی نەدەبینی، لەوانەشە زەق کردنەوەی یەک لایەنانەی ئەو فاکتۆر و توخمانە ببنە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ کاریگەریەکانی ماس کۆمونیکەیشن جا ئەوە کاریگەریە پۆزەتیڤەکان یاخود نێگەتیڤەکان بن، بە کەم بگرێت.

تەنها ئەگەر لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی کاریگەریی ئەو مەترسیە باش بناسرێتەوە، ئەوا دەتوانرێت لە بڕیاری یەک لایەنانە یاخود هەڵە خۆلابدرێت و مەدا و سنورەکانی ماس کۆمونیکەیشن و کاریگەریەکانی واقیعانە و بێ لایەنانە دەست نیشان بکرێن.

**ئەم گوتارە لەم بەرهەمەوە وەرگێڕدراوە .:**
Gerhard Maletzke, Psyhologie der Ma-ssenkommunikation, Verlag, Hans Bredow Institude. Hamburg, 1978. P.187–228.

# بەشی هەشتەم لە کتێبی گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

## ڕاسیست Resiste
## (٢)

سازدانی: نینار

لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** ئیسلامەکان لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لە قۆناغی پێش خۆیان گرتووە کە گوایە هەر دوای لەدایکبوونی کچەکانیان بە مەلۆتکەیی زیندەبەچاڵیان کردوون. لەدیدی منەوە ئێستاشی لەسەربێت ژنان هەر زیندەبەچاڵ ئەکرێن. تائێستاش وەکو وایە لە ژێر ئاودا قسەبکەن گەر بیانەوێت باس لە منداڵی و گەنجێتی خۆیان بکەن. لە خشتەیان ئەبەن و وایان لێ ئەکەن باوەڕ بەوە بهێنن کە نوقسانن و هەڵەیەکیان تێدایە و جەستەیان هی

**ئەگەر هات و سیستەمێکی سیاسی کراوە و پێشکەوتوخواز ڕێ بەبیرکردنەوە و بیروڕای جیاواز بدات، هەروەها تێکستە دینییەکان بەپێی ڕۆژگار و ئەو کێشانەی کە خەڵکی هەیانە خوێندنەوەیان بۆ بکرێت، ئەوکات ئەتوانرێت خوێندنەوەی تازەش بۆ قورئان بکرێت**



ئەدۆنیس

خۆیان نییە، هی باوکەکانیانە، هی دایکانیانە، هی خانەوادەکانیانە یان هی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە تیایدا ئەژین. بەهۆی پێداگیریان لەوەی عادەبوونیان وایـان لێ ئەکات پیسبن، ڕێیان پێنادرێت لەگەڵ جەماعەتدا نوێژبکەن، یان بەڕۆژوبن یان دەست بۆ قورئان بەرن، یاخود تەنانەت لەهەمان ئەو ژوورانــەدا دابنیشن کە شێخی تیایە. هەروەها ئەبێت ئەوان پارێزگاری لە کچبوونی خۆیان بکەن چونکە بەهای خۆی هەیە، نابێت شەرەفی خۆی و خێزان و تەنانەت هەموو ئەو دێیەش ببات کە تیایدا ئەژی! بۆ نموونە تۆ بیر لەکوشتنی شەرەف بکەرەوە. کاتێک دێتە سەر ئەم جۆرە کوشتنە تۆزقاڵێک چییە ناتوانم ئازایەتی ئەوەم هەبێت و بیر لەوەبکەمەوە کە ئەم جۆرە کارانە لە خوارووی ئیتالیا لە کۆرسیکا و دێکانی ئیسپانیا و پوترگالیش ڕوودەدات. ناتوانیت پێتوابێت کە ئەمە حاڵەتێکی ڕێژەییە تەنها لەبەرئەوەی سەردەمانێکیش پیاو لە ئەوروپا درندەبوون و ژنیان چەوساندۆتەوە. بەچاوێکی خوارتر لە پیاو سەیرکراون و دوانیان بە شاهیدێک لەبەرامبەر پیاودا حسابکراوە.
ئێستاشی لەسەربێت من پێموایە لەو کاتەوەی کاری ماڵ دراوە بەسەر ژناندا دوو لایەنی هەبووە، وەک ئەوترێت لەلایەک مێردەکەی ئەوی کڕیوە،

لەلایەکی تریشەوە سەرباری ئەوەی کاروباری ماڵەوەی کردووە هێندە گرنگ نەبووە چونکە لە رووی ئابوورییەوە چاوی لەدەستی مێردەکەی بووە.

**ئەدۆنیس:** پێداگیری ئەکرێت لەوەی ئیسلام ئازادی داوە بە ژنان ئەمەش بۆ خۆی شتێکە کە ئەبێت لەئاستێکی بەرزدا بخرێتە ژێر پرسیارەوە. من پێموایە ئەبێت زۆر بە وردی یەک بەیەکی ئەو یاسا ئیسلامی و پرینسیپانە بخوێنرێتەوە.

**نینار:** چۆن ئەکرێت ژن ڕزگاربکەیت کە لە کاتێکدا لە منداڵییەوە تۆ وات تێگەیاندووە کە لە پیاو نزمترە و وات لێکردووە لەگەڵ ئەو هەستەدا بژی؟ ئەگەر تۆ وات تێگەیاندبێت کە ئەو لەکاتی عادەبوونیدا پاک نییە، هەروەها دوانیشیان بە یەک شاهید وەرئەگیرێت، بۆ ئەوەی بەهەردووکیان بکەنە بەهای شاهیدی یەک پیاو، ئەمە چ شێتییەکە!

**ئەدۆنیس:** وایــە، شایەتێکی پیاو بەقەد شاهیدی دوو ژنە.

**نینار:** بەڵام ئەمە غەدرێکی گەورەیە!

**ئەدۆنیس:** هەروەها ژن تەنها نیوەی بەشە میراتی پیاوێکی بەرئەکەوێت.

**نینار:** مەرجی ئیسلام لەسەر ژنان کە ئەبێت ملکەچبن دەستپێشکەرییەک بووە بۆ هێنانەکایەی جۆرە دیاردەیەکی سەیروسەمەرە، بۆ نموونە وەک پیشاندانی جۆرێک لە هەڵوێست، گەر من وەک ژنێک بڵێم: "بەڕاستی من ئەمەوێت لەچک بکەم". ئەکریت ئەم جۆرە هەڵوێست وەرگرتنانە بە هەڵوێستی پونکەکان بەراوردبکرێت. ئەمە مانای هەڵوێست پیشاندانێکی توندوتیژانە نییە تاکو لەو ڕێیەوە خۆت بناسێنیت. بەجۆرێک توانای خۆت لەبەرامبەر دەوروبەردا تاقیبکەیتەوە و سنوری کەسانی تریش بزانیت، بۆئەوەی بەرگری بکەیت و هەوڵ بدەیت. ئەم جۆرە شێوازە لە خۆ پێناساندن ئەکرێت لە ڕێگای لەچکەوەبێت، یان کونکردنی دەمولێو، هێشتنەوەی قژێکی کەڵەشێریانە، یان لەرێگای لەبەرکردنی جلوبەرگی سەربازی یان هەرشتێکی ترەوە بێت. ئەو کچانەی کە نایانەوێت لەچکەکانیان فرێبدەن خۆیان بەو زنجیرەوە گرێداوە کە سیستەمی کۆمەڵگاکانیان بـۆی دروسـتـکـردوون. ئەمەش شتێکی تـەواو نابەجێیە! ئەوان پاوانێک بۆ خۆیان دروستئەکەن و لەگەڵیشیدا ڕایــەن. دواتریش ئاسان نییە لەدەستی ڕزگاریان بێت. کێشەکە ئەوەیە کۆدی ئەو جلوبەرگانە هەر لەسەرەتاوە پەیوەندی بە یاسای خودایانەوە هەیە. بۆیە ئێجگار خەتەرناکە. ئیسلام لەبەردەم کرانەوەدا بەخشندەنییە، ڕێ بەهیچ گفتوگۆیەک نادات، هیچ یاخیبونێکی قبوڵ نییە. بۆیە ئەبێت بێ ئەندازە خەتەرناکبێت بۆ کچێک لەناو ژینگەیەکی نەریتگەرادا گەر بیەوێت دوای ساڵانێکی زۆری لەچک بەستن لەچکەکەی سەری فرێ بدات.

تۆ پێت وانییە بە هیچ جۆرێک دەرفەتی ئەوە نەمابێت ئیسلام تازەبکرێتەوە؟

**ئەدۆنیس:** کاتێک کە دێتە سەر تازەکردنەوە کێشەکە ئەوەیە کە تۆ چۆن قورئان ئەخوێنیتەوە. ئەوەیە کە چۆن تۆ تێکستێک ئەخوێنیتەوە کەبڕیاری ئەوەی لەسەر دراوە مانای چییە. کاتێک لە نزیکترەوە پەیوەندی نێوان تێکستی قورئان و کۆمەڵگە لەماوەی هەزار و پێنج سەد ساڵدا ئەبینیت، تێبینی ئەکەیت کە زۆر گۆڕانکاری روویـانـداوە. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئیسلام

لەسەرەتاوە دینێکی بەخشندە بووە. لەسەردەمی عەباسییەکاندا هاوڕەگەزبازی ڕێگاپێدراوبووە و دانی پیادانراوە. توانراوە بوترێت: "فلانکەس غولامەکەی لەگەڵدایە".

هەر لەسەر ئەمە، من دوێنی خوێندمەوە کە لە هەرێمی ماساچوسێتی ئەمەریکا ڕێ بە دروستکردنی خێزان لە نێوان هاوڕەگەزبازەکاندا دراوە.

**نینار:** نایابە! زۆر باشە.

ئەدۆنیس: ئەم شتانە لە کۆمەڵگەی کۆنی عەرەبی و ژیانی ڕۆژانەدا ئاسایی بووە. لەبەرئەوەی تێکست پەیوەندی بەوەوە هەیە چۆن ئەخوێنرێتەوە، ئەکرێت لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیشدا لەو ڕوانگەیەوە تازەبکرێتەوە.

ئەگەر هات و سیستەمێکی سیاسی کراوە و پێشکەوتوخواز ڕێ بەبیرکردنەوە و بیروڕای جیاواز بدات، هەروەها تێکستە دینییەکان بەپێی ڕۆژگار و ئەو کێشانەی کە خەڵکی هەیانە خوێندنەوەیان بۆ بکرێت، ئەوکات ئەتوانرێت خوێندنەوەی تازەش بۆ قورئان بکرێت. ئەبێت لە تێکستە دینییەکانیشدا هەمان ئەو گۆڕانانەی کە لە ژیاندا ڕووئەدات لەوانیشدا ڕووبدات. لەڕاستیدا ئەبێت ئەمە ئاشکرابکرێت بۆ ئەوەی یارمەتی ئینسانەکان بدات و کۆمەڵگە سودی لێببینێت. دین لەبەر خاتری ئینسانەکان هەیە، بۆ ئەوەی ئازادی بکات و پێشی بخات، نەک بە پێچەوانەوە. گەر ئینسان لەم خاڵەوە ئەوەی قبوڵکرد مانای وایە کە ئەبێت تێکستە دینییەکان لە ڕووی پێداویستییەکانی ئێستای ئینسان و کێشەکانییەوە بخوێنرێتەوە کە بەدەستیانەوە ئەناڵێت.

**نینار:** کێ بڕیاری ئەمە ئەدات؟ ئایە شێخەکانن؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، هاوڵاتیانن! ئەگەر دەسەڵاتداران گرەنتی ئازادی و یەکسانی بە هەموو هاوڵاتیان بدەن، ئەوا ئەوانەی کە دیندار نین ئەتوانن هەموو ئەو شتانە بە دیندارەکان بڵێن کە ئەیانەوێت. ئەگەر هاتوو ئازادییەکی زیاتر هەبوایە ئەوا زۆرینە لەگەڵ ئەوەدا ئەبوون کە تێکستە دینییەکان ئەبێت بەجۆرێک بخوێنرێنەوە کە خوێندنەوەکە لەگەڵ پێداویستییەکانی ئینسانەکان و ژیانی ڕۆژانەیاندا بگونجێت. بۆیە من پێموایە گەورەترین کێشە دەسەڵاتدارە سیاسییەکان خۆیانن. کە هەمیشە ئەوان لەبەرەی دیندارەکان بوون.

**نینار:** بەڕاست وائەکەن؟

ئەدۆنیس: دەسەڵات لەو ئاستەدا ناوبژیکەر نییە بەڵکو بەرگریکەرە. گەر هات و ئازادی سیاسی هەبوایە ئەوا کۆمەڵگە عەرەبییەکان ئەیانتوانی پێشبکەون. هەندێک نمونەی لەم جۆرە هەن: سەرۆک بورقوبە ئازادییەکی گەورەی بەخشی بە ژنانی تونس. زۆر لە موسوڵمانە باوەڕدارەکان پێیان وابوو کە ئەمە شەڕە دژ بە دین. بەڵام ئەم حەقپێدانە خرایە دەنگدانەوە. ئێستا ئەو یاسا تازانەی کە موحەمەدی شەشەم پاشای مەغریب ئەیەوێت دەریان بکات ئەتوانێت حەقی ژنانی مەغریب بدات، سەرباری ئەوەی کە دیندارەکانی مەغریب خوێندنەوەیەکیان هەیە بۆ قورئان کە دان بەو حەقانەدا نانێت. زۆرینەی کات ئەوەی ئەم هێزانە ئەوەستێنێت دەسەڵاتدارە سیاسیەکانن. لەبری ئەوەی کە ئەبوو ئەوان گفتوگۆ بهێننە ئاراوە و ڕۆڵی ناوبژیکەر و دادگایکەریان ببینیایە. ئەبوو دەسەڵات لە ڕێی بینینی ئەو ئازادییەی کە

هەیە، دەرگای گفتوگۆ و یەکتربینین بە ڕێگای دیموکراسیانە بخرایەتە سەرپشت. هەروەها تێکستە دینییەکان بەپێی پێداویستییەکانی ژیان و کێشەکانی لێکبدرایەتەوە. کاتێک زەمەن ئەگۆڕێت خودا خۆشی هەندێک لە ئایەتەکان ئەگۆڕێت و ئایەتی تازە ئەنێرێتە خوارەوە کە باشتر لەگەڵ کاتدا ئەگونجێت. بۆیە پیویستە ئینسانیش "لاسایی" خودا بکاتەوە و ئەو تەنگ بینی و خوێندنەوە ئینکارانەی بۆ قورئان بگۆڕێت. بۆ نموونە هەندێک ئایەتی دابەزێنراو هەیە کاتێک خودا بینیویەتی کە ڕۆڵێکی باشیان نەبینیوە، گۆڕیونی بە هی تر. ئایەتی تری دابەزاندووە و ئەوانی پیشتری پێ چاککردۆتەوە: "ماننسخ من آیة آو نفسها فات بخیر منها آو مثلها".

هەروەها خودا یاساکانی لە ئایەتەکانی خۆیدا گۆڕیوە بەهۆی ئەوەی کە چیتر لەگەڵ واقیعدا پێکنایەتەوە. ئەبێت ئەمە وەک نموونەیەک ببینرێت و چاوی لێبکرێت. ئینسانەکان ئەبێت بە هاوشێوەی ئەمە خوێندنەوەی خۆیان لەناو ئەو تێکستە دینیانەدا بگۆڕن تا باشتر بشێن و لەگەڵ پێویستییەکانیدا بگونجێن.

**نینار:** بەڵام ئەوکاتە هەرچ کەسێک بێت ئەتوانێت بیگۆڕێت و یاساکانیش بەو شێوەیە لێکبداتەوە کە ئەیەوێت.

**ئەدۆنیس:** بێگومان. بۆیە ئەبێت سەرلەنوێ لێکدانەوەکان بەپێی یاسایەکی زۆر ورد بکرێت.

**نینار:** تۆ پێتوایە دین ئەتوانێت دژ بە داهێنانە زانستییەکان بوەستێتەوە؟ تابێت داهێنانی زیاتریش دێتە کایەوە کە لەگەڵ پیاوانی دیندا نایەتەوە؟ ئایە دینەکان ئارەزوویەکی ئەوتۆیان هەیە کە بکرێنەوە و خۆیان بگونجێنن؟ بەلام هەندێک جاریش هەست ئەکەیت کە دینەکان وایان لێدێت تابێت زیاتر خۆیان دائەخەن. بۆ نموونە دین لەم سەردەمەدا کەرەستەی مەنعکردنی ئافرەتانی قەدەغەکردووە. زانست لەبەرامبەر ئەمەدا ناتوانێت هیچ بکات بەڵکە ئەمە پەیوەندی بە حەقیقەتی کۆمەڵگە خۆیەوەیەتی.

**ئەدۆنیس:** ئەمە پەیوەندی بە ئیمانەوە هەیە. خەڵکی باوەڕداری وا هەیە پێیوایە هەموو ئەم داهێنانە زانستیانە پێشتر لە قورئاندا نووسراوە.

**نینار:** وایە، ئەمە ئەزانم.

**ئەدۆنیس:** لەبەرامبەر ئەمەدا ئەبێت چی بوترێت؟ من ئەتوانم تێکستێکت نیشانبدەم کە ئیماندارێک نووسیویەتی، ئەڵێت کە ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر کاری خودایە.

**نینار:** کێ ئەم نووسینەی نووسیوە؟

**ئەدۆنیس:** یەکێک لە پیاوە دەمارگیرەکان. کەسێک ئەو نووسینەی بۆ ناردم. تەنانەت ناوەڕۆکی ئەم نووسینە بەشێک لە ناماقوڵی و حساب بۆکردنی بێ مانای تری تیایە.

**نینار:** ...؟

**ئەدۆنیس:** هەمیشە خەڵکانێک هەن هەموو داهێنانە زانستییەکان ڕەدئەکەنەوە، یاخود پێیان وایە پێشتر هەموو ئەو داهێنانە لە قورئاندا باسکراون. بەڵام من پێموایە کە قورئان واقیع ڕەدناکاتەوە، چونکە ئەمە پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە لە ژیانی ڕۆژانەدا هەن. من جارێکی تریش ئەیڵێمەوە: ئەوەی وا ئەکات قورئان بکات بە دژ واقیعدا بیروباوەڕی دینییە نەک ئەقڵ.

**نینار:** من جارێکیان گوێم لێت بوو وتت کە ئیسلام ئینکاری ویستی ئازاد ئەکات یاخود ئیسلام دژ بە ئازادی تاکە کەسە، ئەم قسەیەی

خۆتت لەبیره؟ تۆ ئەمەت بۆ من سەلماند، بەڵام بیرم نەماوە تۆ لەوکاتەدا چ بەڵگەیەکت هێنایەوە. ئایە ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە کە ئینسان لە ناو ئیسلامدا ناتوانیت دینی خۆی بگۆڕێت بە دینیکی تر؟

**ئەدۆنیس:** ئەوەی وتوومە وتوومە لەبەرئەوەی ئیسلام سەربەخۆیی نابەخشێت بە تاک و شوێنێکی بۆ بونەوەری ئازاد نییە. دین تاک گرێ ئەدات و ئەیبەستێتەوە بە کۆوە، بە گەلەوە، بە نەتەوەوە. لەم ئاستی کۆمەڵایەتی و ئاستی بیرکردنەوەیەدا گەل گرنگترە نەک تاک. بەم شێوەیە هیچ ئازادییەک لەو جێیەدا نییە. تاک تەنها لەو چوارچێوەیەدا ئازادە کە پەیوەستە بەو هەڵسەنگاندن و یاسایانەوەی کە پەیوەندیان بە گەل و دین و کلتورەوە هەیە. قسەیەکی پێشینان هەیە من لەم ڕستەیەدا کورتی ئەکەمەوە کە ئەڵێت: "من قال فی الدین، فهو مخطیء ولو اصابه" (ئەوەی لەدەرەوەی ماناکانی دین و عەقڵی خۆیەوە باسی دین ئەکات، ئەوە سەرلێشێوا و گوناهبارە ئەگەر هاتو ئەوەی کە ئەشیڵێت ڕاستبێت).

ئەمەش مانەی ئەوەیە کە دین پەیوەندی بە گروپ و گەلەوە هەیە نەک بە تاکەوە.

**نینار:** دنیای عەرەبی تەواو شیزۆفرینیایەکە بۆخۆی، لە نێوان سەرمەستبوونی بە خۆرئاوا و ئەو رقەی لەبەرامبەر خۆرئاوادا هەیەتی لەتوپەت بووە.

**ئەدۆنیس:** وەک ئەوەی پێشتر بۆم باسکردیت کە ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە لە چی پێکدێن و چۆن نەبوونی ئازادیش یەکێکە لە مۆرکەکانی، ئەم کۆمەڵگایانە خاوەنی دوو ئاستن: یەکێکیان بینراو کە زۆرینەی کەسە دیندارەکانی تیادا ئەژین هەروەها ئاستی سیستەمی سیاسیشە. ئاستەکەی تریشیان کە نەبینراوە، لەم ئاستەدا ئەوەی کە بیەوێت پێی باشترە لێرەدا ژیانێکی ئازادانەی تیادا بەرێتەسەر. بێگومان پرسیارەکەش لێرەدا ئەوەیە کە ئەمە جۆرێکە لە دوو ڕووی و جوت موراڵی.

**نینار:** ئاشکرایە کە وایە.

**ئەدۆنیس:** شیزۆفرینیا شتێکی ترە؛ نەخۆشییە. بەڵام ئەمەیان پەیوندی بەو ئینسانانەوە هەیە کە دوو ڕوویان هەیە: یەکێکیان، نوێژ ئەکات و ڕۆژو ئەگرێت و زەکات ئەبەخشێت؛ ئەوی تریان سنووری هەموو شتە قەدەغەکراوەکان ئەبڕێت، بۆ نموونە ئەگەر پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت تەواو ئازادی خۆی وەرئەگرێت. لە ئاستە دیارەکەی کۆمەڵگادا هەموو شتە حەڵاڵەکان پەیڕەوئەکات ـ ئەو شتانەی کە ڕێ پێدراون ـ بەڵام لە ئاستە نادیارەکەی کۆمەڵگادا خۆی بە هەموو ئەو شتانەی ترەوە خەریک ئەکات کە حەرام و قەدەغەکراون.

**نینار:** چۆن ئەمەی بۆ ئەچێتە سەر؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە هەمووی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ڕێ بە ئازادی نادرێت. ئینسانەکان پێویستە خۆیان بشارنەوە بۆ ئەوەی ئازادانە ڕەفتاربکەن.

**نینار:** ئینسان چۆن ئەتوانێت بەم شێوەیە بژی. ئەمە وەکو ئەوە وایە لە درۆیەکی بەردەوامدا بژی.

**ئەدۆنیس:** ئەمە زۆر ترسناکە، بەڵام ئینسان هەمیشە توانیویەتی شتێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

**نینار:** ئەمە چۆن ئەبێت؟

**ئەدۆنیس:** هەموو ئینسانێک ئەبێت شێوەیەکی نهێنی بدۆزیتەوە بۆ بەکارهێنانی ئازادی خۆی، تەنانەت لە ناو ماڵەکەی خۆشیدا. ئەبێت ئاگایان لەوەبێت کە لە یاساکانی دین لایان نەداوە و لەلایەن کەسانی ترەوە هەستیان پی نەکراوە.

**نینار:** دیارە هەموومان لە ژیانماندا بۆخۆمان پێویستمان بە "بەشێک لە نهێنی" هەیە. ئەمەش لەوکاتەدایە کە گەورەئەبیت و ئەتەوێت کەسایەتی خۆت دروست بکەیت و لە دایک و باوک جیابیتەوە. ئینسان پێویستی بەوەیە بۆ ئەوەی ئەزمونیان بکات. گەنجێک سنوورەکانی دایک و باوکی و ئەوەی خۆشی تاقی ئەکاتەوە. بەڵام ناتوانێت هەر ئاوا خەریکی چاوشارکێ بێت، چونکە ئەتوانم بڵێم ئەو نهێنی و لەزەت بینینە زۆرانە دواتر ناشیرین ئەبن، وایان لێ دێت کە ئینسان ناچاربێت بیانشارێتەوە و هەرگیز قسەیان لەبارەوە نەکات.

ئەمەش ئەکرێت گرژییەک دروستبکات و ببێتە هۆی غەم و مەینەتی.

دواتر...

**نینار:** ئەگەر خەڵکە دینییە توندڕەوەکان قبوڵی داواکانی خودی خۆیان بکردایە، بەم چەشنە هێندە شەڕانی ئەبوون؟ پێموایە کێشەکە ئەوەیە ئەوان ناتوانن ئەمانە قبوڵبکەن.

**ئەدۆنیس:** وایە، گەر ئینسان نەیتوانی ئازابێت، تەنانەت درۆی لەگەڵ خودی خۆشی کرد، ئیتر ئەمە نابیتە هەڵگرتنی هیچ نیشانەیەکی دینی. کەسی وا ئەبینیت بەردەوام درۆئەکات تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە تەواو ئازادە. بۆ نموونە خانمێک درۆ لەگەڵ مێردەکەی خۆیدا ئەکات لەکاتێکدا زۆر بە ئاسانی ئەتوانێت بە مێردەکەی بڵێت کە چیتر ئەوی خۆشناوێت. بۆچی کوڕێک ناتوانێت بچیتە بەردەمی باوکی و بڵێت: من کچێکم بەم جۆرە و بەم شێوەیە خۆشئەوێت. یاخود کچێک بڵێت: کوڕێکی ئاواو و ئاوام خۆشئەوێت. پێشتر وەک تۆ هێمات بۆ کرد ئینسان دیوێکی هەیە حەزی بەکردنی شتی قەدەغەکراوە. ئەو کەسە حەزئەکات هەندێک شت بە نهێنی بکات. ئەبێت ئینسان لەبەرامبەر ئەمەدا چی بکات؟ ئەمە حەقیقەتێکی کۆمەڵایەتییە نەک بە تەنها مەسەلەیەکی دینی.

**نینار:** وایە، بەڵام ئەمەش لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر ئەگۆڕێت. هەندێک شت کە جوانە ئەکرێت بە شێوەیەکی ناتەندروست و دزێو لێکبدرێتەوە ئەگەر بەردەوام بشارێتەوە. بەڵام مەبەستم ئەوەیە لەبەرخاتری تۆ ناکرێت ئینسان هەموو شتێک بە کراوەی و لەبەرچاوی هەموو دنیادا بکات. من حەزم لە شتە قەدەغەکراوەکانە، ئەو شتانەی کە بە نهێنی ئەیانکەیت. من بیر لە شتە سادەکان ئەکەمەوە: بۆ نموونە لەگەڵ کەسێک بخەویت کە شووت پێ نەکردبێت. لە هەندێک کۆمەڵگادا، بەتایبەتی کۆمەڵگەی عەرەبی ـ ئیسلامی، ئەم جۆرە شتانە مەحکوم ئەکرێت. پێیان وایە ئەم جۆرە عەشقانە شەیتانی لە پشتەوەیە.

لێرە لە ئەورووپا تەنها ترسێک لە ئازادی ئەوەیە کە یاساکان فەرامۆش بکەیت، دەنا ئینسان ئەتوانێت گوێ بە هیچ یاسایەکی دینی یاخود ئەوەی خەڵک ئەیەوێت نەدات. لێرە سەرباری هەموو شتێک ئەتوانیت، کێت بوێ خۆشتبوێت و چۆنیشت بوێ وابکەیت. ئەکرێت خەڵک هەبێت حەزی پێت نەبێت، حەزی لە زەوق و سەلیقەت نەبێت، بەڵام هەمیشە کەسانێک هەن داکۆکیت

لێ ئەکەن، تەنانەت ڕەنگە لەگەڵ زەوق و سەلیقەشتا یەکبگرنەوە. لێرە ئەتوانیت ژیانێکی نهێنی دروستبکەیت هاوتەریب لەگەڵ ژیانی ئاسایی خۆتدا، لەبەرئەوەی ئارەزووی ئەو جۆرە ژیانە ئەکەیت یان ئەتەوێت یاری بکەیت یاخود بۆ ئەوەی بتوانیت زۆر ترین چێژ وەربگریت. لە ئەوروپا ئەم جۆرە ژیانە لەسەر ژیان و مەرگت نەوەستاوە، وەک ئەوەی ئەمڕۆ لە وڵاتانی عەرەبیدا هەیە.

**ئەدۆنیس:** حەزی بە نهێنی ژیان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و تەنها پەیوەندی زۆری بە ئیمانەوە نییە، یاخود بەگشتی پەیوەندی بە ئیسلامی ناو کۆمەڵگاوە نییە. ئەمە پەیوەندی بە سروشتی ئینسانەوە هەیە نەک تەنها بە دینەوە. بەڵام بێگومان دین ئەتوانیت زیاتر گوڕی پێبدات.

**نینار:** بەڵام ئەکرێت بوترێت ئەمە توڕەبوونی خەڵکی زیاترئەکات. لە دنیای عەرەبیدا سێکسی پیاو توڕەکەرە، ئەتوانیت ئەوە لە نیگایاندا بەدیبکەیت. هەر یەکە و لەلای خۆیەوە ئیتر ژن بێت یان پیاو ئەتوانێت ئەوەی بیەوێت بیکات، بەڵام بێگومان بە نهێنی.

**ئەدۆنیس:** بێگومان. ئەم دنیایە دنیای کۆمەڵگەیەکی درۆزن و فشەبازە.

**نینار:** ئەمە ئەو قسەیە بوو کە منیش ئەمویست بیڵێم. ئەم کۆمەڵگایانە بێ ئەندازە دڵڕەقی تیادایە، بەتایبەتیش بەرامبەر کچان. لە دەرەوە لەسەر شەقامەکان کچێک بەتایبەتی گەر جلێکی سێکسی لەبەردابێت ڕووبەڕووی جۆرێک لە توانج تێگرتن و قسەی ڕەق ئەبێتەوە. من ناتوانم ئەمە قبوڵبکەم، ئەزانیت! من حەزئەکەم لەویادا .... ببرم. "پێ ئەکەنێت"

**ئەدۆنیس:** بەڵام تۆ بیر لە بەیروت و دیمەشق بکەرەوە.

**نینار:** وایە، ڕاستە!

**ئەدۆنیس:** تەواو لە دەرەوەی دینیش هیشتا "کۆمەڵگەیەکی شاراوە" هەیە، لەناو جەرگەی ئەو کۆمەڵگە بینراوەدا ژیانێکی نهێنی ئەژی.

**نینار:** من ئەمەوێت زۆر لەوە زیاتر بڵێم سەبارەت بەو دەهری بوونە. ئەوەی زۆر توڕەترت ئەکات ئەوەیە کە ئەو هەموو بەرگرییە زۆرەی ئینسانەکانە لە هەموو ئەو دابونەریتە توندوتیژە بەتایبەت ئەو نەریتە قەدەغەکراوانە ئەیکەن - ئەمەوێت بڵێم ئەوانەی کە بوونەتە مایەی ئەو توڕەبوونە. گەر ئافرەتێک جورئەتی ئەوە بکات ژیانی سێکسی خۆی بە شێوەیەکی نۆرماڵ پەیڕەوبکات وەک قەحبەیەک سەیر ئەکرێت. من هاوڕێیەکم هەبوو لە بەیروت پێیوتم: حەزی لە کچێکە. منیش وتم: ئۆی کە شتێکی خۆشە! چەندە خۆشە سێکس لەگەڵ کچێکدا بکەیت کە خۆشتەوێت. بەڵام هاوڕێکەم وەڵامی دامەوە و وتی: نا شتی وا چۆن ئەبێت! من سێکس لەگەڵ ئەودا ناکەم - چونکە خۆشمەوێت!

**ئەدۆنیس:** تۆ بینینی شتەکان و وردبوونەوە لێیان لە گۆشەنیگایەکی دەروناسیەوە سەیرئەکەیت، وایە.

**نینار:** بەهەرحاڵێک من پێموایە ئیسلامەکانی پاکستان و ئەفغانستان -"تالەبانییەکان"- و ئەوانەی لە ناوچە دینییەکانی دیمەشق و ڕیازی سعودیەدا ئەژین...

**ئەدۆنیس:** ئەمە جێی نائومێدییە!

**نینار:** ئەی، بەڕاستی وایە! من پێموایە ئەگەر هەموو ئەو پیاوە توڕانە پەیوەندییەکی نۆرماڵیان

لەگەڵ ژندا هەبوایە، گەر بیانتوانیایە سێکس لەگەڵ ژنێکدا بکەن، گەر بیانتوانیایە عاشق بن، گەر قبوڵی ئەوەیان بکردایە جەستەیان ئاوێزانی جەستەی ژن ببێت، ئـەوا ئەوسا کەمتر بێ عەقڵتر و دڕندەتر ئەبوون، کەمتریش خەتەرناکتر ئەبوون. لە ڕاستیدا من لەو کاسانە نیم جەستەم ببەخشم بەهەرکەسێک کە هەیە، بەڵام پێموایە گەر هەموو ئەو کەسە توندڕەوانە دەرفەتی ئەوەیان بۆ بڕەخسایە، بەمانای وشە لایەنی سێکسیان تێربوایە ئەوا هەرگیز دژ بە جەستە و ڕۆح نەئەبوون وەک تاڵەبانیەکان.

**ئەدۆنیس:** ئەمە تەنها مەسەلەیەکی توڕەبوون نییە کاتێک کە پەیوەندی بە ژنەوە هەبێت بەڵکە پەیوەندی بە ژیانی ناو کۆمەڵگەشەوە هەیە. ئەوان شتێکیان نییە بیکەن، شتێکیشیان نییە بەدیبهێنن. ڕەنگە ئەوان توشی جۆرێک لە شێتی بووبن، شێتییەک کە وایان لێ ئەکات شەڕبکەن لە پێناو بەهایەکی دینیدا.

**نینار:** زۆر شت هەن پەیوەندیان بە دینەوە هەیە و من لەڕووی دەرونشیکارییەوە ڕوونم کردۆتەوە.

**ئەدۆنیس:** منیش هەمان شت ئەکەم. ئەوەی ژیانێکی کۆمەڵایەتی و سێکسی هەژاری هەبێت، ئەوەی شتێکی نەبێت بیڵێت، شکستی هێناوە. کەسی وا قەرەبووی نارەحەتییەکانی خۆی بەوە ئەداتەوە خۆی فڕێبداتە ناو هەرچ شتێک کە هەیە تەنها بۆ ئەوەی هەستبکات ئەژی، بەتایبەتی شتێک بتوانێت ڕۆڵێکی پێ ببەخشێت تا نمایشتی بکات. دین بۆ ئەم جۆرە کەسانە بەتایبەتیش ئەوانەی لە ناو کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا ئەژین زۆر کاریگەرە و کەرەستەیەکی بەهێزیشە.

**نینار:** وایە، چونکە ئەمە هەستێکی ئەوتۆیان پێ ئەبەخشێت کە ئەوان نوماینەدەی خودان.

**ئەدۆنیس:** ئاشکرایە ئـەو جـۆرە کەسانە بیرناکەنەوە و هیچ مەعریفەیەکیشیان نییە. ئەوان تەنها حورمەتی ئەو شتانە ئەگرن کە وەکو توتی فێری بوون. ئەوان دوژمن بۆ خۆیان دروستئەکەن بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە تاقیبکەنەوە کە هەیانە، بۆئەوەی هەست بەو هەستە نوێیە بکەن و بزانن کە بەڕاستی ئەوان ئەژین. ئەوان بەبێ بوونی دوژمن هیچیان بۆ ناکرێت. ئەوەندە بەس نییە کە خاوەن ئیمانن؛ بەڵکە ئەبێت ئەوان شتێکیان هەبێت باوەڕی خۆیانی لەسەر تاقیبکەنەوە.

**نینار:** من لەو جۆرە کەسانە لە پاریس ئەبینم، کوڕی وا کە هەست ئەکات ئیمامە، یان قوتابی دینە و بەخۆی جزداشە و کالەی پێ و کڵاوی سپی سەریانەوە دەرئەکەون! ئەوەی کە باسی ئـەکـەم ڕەنـگـە کەمێک گاڵتە و موبالەغەی تیادابێت، بەڵام ڕاستییەکەی کاتێک کە دیقەتیان ئەدەم یەک کەسی قۆزیان تیانابینم.

لە ڕوویەکی ئاساییەوە گەنجێکی لەو تەمەنەدا سەرقاڵی وەرزش و خوێندنە ئیتر کوڕبێت یان کچ. من پێموایە ئەمە تراژیدیایە کە زۆر کاریکاتێریانە خۆیان ئەخەنە باوەشی دینەوە و خۆیان ناشیرین ئەکەن، تەسلیمی توڕەبوون ئەبن و خۆیان تەرخان ئەکەن بۆ مردن، لەبەری ئەوەی خۆیان لەبەردەم دنیا و ئینسانەکاندا بکەنەوە.

***سەرچاوە:***

al med min far, Adonis
Ninar Esber

# گفتوگۆ لەگەڵ فەریبا وەفی ڕۆماننووس

فەهیمە جەعفەری

لە فارسییەوە: جەبار سابیر

فەریبا وەفی لە ساڵی (١٣٤١) لە دایکبووە. یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی (لە قووڵایی دیمەن) دا لە ساڵی (١٣٧٥) لە لایەن خانەی بڵاوکردنەوەی چەشمەوە چاپ و بڵاوبۆتەوە، کۆمەڵەی دووەم (تەنانەت کاتێک پێدەکەنین) لە ساڵی (١٣٧٨) لە لایەن خانەی بڵاوکردنەوەی مەرکەزەوە چاپ و بڵاوبووە و لە ساڵی (١٣٨١)یش ڕۆمانی (باڵندەکەی من) لە لایەن خانەی بڵاوکردنەوەی مەرکەزەوە چاپ و بڵاوبۆوە.




-پێمخۆشە گفتوگۆکە بە رستەیەک لە رۆمانی (باڵندەکەی من) دەست پێبکەم. (سەد جۆر یارییم کرد تا نەبینرێم. هێواش هێواش لە چاوی خۆشم ونبووم. رۆژێک ناچار بووم لە خۆم بپرسم کێم. ونبوونێکی قووڵ کە دۆزینەوەی لە ئارادا نەبوو.) خۆشبەختانە ئێستا کە تۆم دۆزیوەتەوە ئومێدەوارم گۆشەیەک لە بوونی فەریبا وەفی ببینم.

* سەردەمانێک پێمابوو نووسین کارێکی ئیرادییە. واتا پێویستە قەڵەم و کاغەز بە دەستەوە بگریت و جێگەیەکی کشومات بدۆزییەوە و بنووسی. ساڵانێکی پێچوو تا گەیشتمە ئەم ئەنجامە کە بۆ نووسین تەنها ویست بەس نییە. زۆر شت پێویستە و لە ریزی ئەوانەیش خۆڕاگری لە کارەکەدا. گەر چاو لە توانا و پابەندییەکانی تری نووسین بپۆشین، پێموایە نووسین جۆرێک بەردەوامییە. نووسین کاری یەک شەو و دوو شەو نییە. نووسین، گەڕانە، تاقیکردنەوەیە، گومانە، نائومێدییە، نیگەرانییە و.. ئەمەش بازنەیەکە کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە.












لانیکەم بۆ من بەمجۆرە بووە. هەربۆیە قەت بە ئەنجامێکی یەکلاییکەرەوە و دیاریکراو نەگەیشتووم کە تازە بمەوێ ئەوە پیشان بدەم. هەرچییش دەمزانی لە چیرۆکەکانمەوە هێناومە.

– کەواتە لە چیرۆکەکانتدا بە شوێنتدا بگەڕێین؟

* هەندێکجار دڵنیاترین ڕێگەیە.

– بۆچی بەشداری کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکان ناکەیت؟

* گەر دەرفەتێکم هەبێت بەشداری دەکەم و هەڵبەتە شتێکیتریش هەیە. هەڵسوکەوت و گفتوگۆ لە کاری نووسەراندا، ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. نکۆڵی لەوە ناکەم، بەڵام هێشتا نەمتوانیوە پەیوەندییەک لە نێو ئەوەی پێیدەڵێن کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی و نووسین، دروستبکەم. بە خۆدا دەشکێمەوە کاتێک ناتوانم یارمەتی لەوانە وەربگرم بۆ نووسین، یا بۆ وروژاندنی زەینم، یا بۆ بە هێزکردنی ئەنگێزەکانم. جارجار وادێت بە خەیاڵمدا ئەم دووە لە کۆمەڵگەی ئێستاماندا هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە. نووسین کارێکە و بەشداری لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی یا باسوخواسی بێکۆتایی و هەندێکجار جەنجاڵی، کارێکی ترە.

– بەڵام ئەم ماتۆڕە پێویستی بە شارژ کردنەوەیش هەیە.

* شارژ بوونەوەی من سنووردارە بە ژیانەوە، خوێندنەوە و نووسین. هەڵبەتە ئەوەشمان بیرنەچێت بیستنی دەنگی خوێنەرانێک کە ڕۆمان و چیرۆکەکانمیان خوێندۆتەوە و حەزدەکەن قسەی لە بارەوە بکەن، ئومێدەوارکەرە.

– زۆرێک لە نووسەران، ڕووداوی چیرۆکەکانیان لە رابردووی دوور و نزیک دەگوزەرێ. بەڵام تایبەتمەندییەک کە من لە کارەکانی تۆدا پێمخۆشە وەرگرتن و نووسینە لە ئێستادا.

* مرۆڤی هاوچەرخ بە دنیا ئاڵۆزەکەی ئەمڕۆیەوە بۆ من هەستپێکراوتر و ئاشناترە.

– تۆ بە واقعییەتی پەتی کار دەکەیت.

* هێشتایش باسی واقعییەت و خەیاڵ و پەیوەندی ئەم دووەم تەواو بۆ ڕوون نەبۆتەوە. ئیتر وەک ساڵانی پێشوو بیرناکەمەوە کە دەبێت بەو جۆرە لە واقعییەت بنووسی کە هەیە. تێگەیشتنێکی تریشم بۆ خەیاڵ پەیدا کردووە. خەیاڵ، جوانکارییەک بوو بە کەڵکی ژیانی توندوتیژی ئێمە و هونەرەکەمان نەهات. ئێستا پێموایە هونەر بێ خەیاڵ مانای نییە و تەنانەت ژیانیش. شەوێک چیرۆکێکم بۆ منداڵەکانم دەخوێندەوە. بازرگانێک، هەر ژنێکی دەهێنا دوای یەک دوو هەفتە ژیان لە ماڵەکەی ئەودا دەمرد. ئیتر هیچ ژنێک ئامادە نەدەبوو شووی پێبکات. دواجار دوای ماوەیەکی زۆر ژنێکی ئازا پەیدا دەبێت

و بازرگان مارەی دەبڕێت. بازرگان، ژنەکەی دەخاتەماڵێکی گـەورە و رازاوە و دەچێتە سەفەرێکی دوورودرێژ. ژنە هەفتەی یەکەم و دووەم و سێیەم سەری گەرمە، بەڵام دواتر هێواش، هێواش هەست بە تەنیاییەکەی دەکات. تازە درکی دەکات ژنەکانی پێشوویش لە بێ هاوزمانی و تەنیاییدا مردوون. بووکێک لەسەر شکڵی ژنێک لە هەویر دروست دەکات و دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵیدا. سەرنجی راکێشام. ژنە بە یارمەتی خەیاڵەکەی لە مردن قوتاری دەبێت. ئێستا پێموایە بۆ ناسینی واقعییەت تەنها تاقە رێگەیەک هەیە. دەکرێ رێگەی تریش تاقیبکەیتەوە. بەهەرحاڵ وادێت بە خەیاڵمدا ئەوەی گرنگە گەیشتنە بەو شتەی بە دژواری دەبینرێ و هەڵبەتە گەیشتن بەویش ئەسڵەن کارێکی ئاسان نییە. هەندێک کات دەبێت خەروارێک شتی زیـادە بخەیتە لاوە تا ئەو چکۆلە کەمەی وەک ئەڵماسە بدۆزییەوە و پیشانی بدەیت. هەندێک کات وەک چاڵ هەڵکەندنە.

دۆزینەوەیەکە لە رەوتی کاردا لێی نزیکدەبییەوە.

– لە بارەی (باڵندەکەی من)یشەوە ئەم هەستەت هەیە؟

* لە رەوتی کار لەسەر (باڵندەکەی من) بوو زۆرێک شت فێربووم و دوای چەند مانگێک لە چاپی ئەو رۆمانە، بیرمکردەوە دەبێت لە کاری دواترمدا هەوڵی تر بدەم.

– فۆرم لە کۆمەڵە چیرۆکەکانتدا جێگەی تیرامانە. لە رۆمانی (باڵندەکەی من)دا چۆن گەیشتییە ئەم فۆرمە؟

* سەرەتا بەشگەلێکم نووسی کە هەر یەکەیان سەرەتایەکیان هەبوو و کۆتاییەک و دەکـرا بە سەربەخۆییش بیانخوێنییەوە. مەبەستم بوو چەند چیرۆکێکی جیاجیا بنووسم کە هاوکات پەیوەندیشیان پێکەوە هەبێت. پاشان ناچار بووم بیگۆڕم و چیرۆکەکە بەوجۆرەی لێهات کە دەیبینی.

– پتر لە چیرۆکەکانتاندا لە روانگەی گێڕەرەوەی کەسی یەکەمەوە دەنووسی. گەر بـەردەوام لەم روانگەیەوە کار بکەیت ناکەویتە دووبارە بوونەوەوە؟









* هۆکاری کەوتنە دووبارە کردنەوە کەڵک وەرگرتن نییە لە کەسی یەکەم. زۆرێک لە نووسەرانی سەرکەوتوو، ڕۆمانەکانیان بە گێڕانەوەی کەسی یەکەم نووسیوە و ئەمەی گورزی لە تازەیی هیچ یەک لەوانە نەوەشاندووە.
- ئەوانە ئەزموونێکی ژیانی و فەرهەنگێکی بەرزیان هەیە...
* ئەوە هەمووی ڕاستە. بەڵام کێشەکە لە جێیەکیترە.
-کێشەکە لە کوێدایە؟
* دیسان دەگەڕێمەوە بۆ تەممەڵی خەیاڵ و نەبوونی نیگای تازە. دەبێت زەینی نووسەر توانای ئەوەی هەبێت بچێتە قاڵبی ژنێک، منداڵێک، دیکتاتۆرێک و هتد.
- بۆچوونت لە بارەی ژن/سەنتەریزم لە چیرۆک و ڕۆمانەکانت و کاڵبوونەوەی ئامادەیی پیاوان چییە؟
* پێموایە ئێمە نەک تەنها پیاوان ناناسین، خۆیشمان ناناسین. هەربۆیە ئەدەبیاتمان پڕ دەبێت لە مرۆڤی دەستکرد کە وێکچوونی نییە بە خەڵکانی زیندووی دەوروبەرمان. پێموایە زۆر گرنگە ژنان خۆیان بەیان بکەن.
- دەڵێن نیگاتان لە ڕۆمانی (باڵندەکەی من)دا یەکلایەنە بووە.
* خۆم هەڵهێنجانێکی وام نییە. حەزناکەم نیگایەکی نائینسافانەم بۆ بابەتێک هەبێت. لەم ڕۆمانەدا تەنیایی پیاویش گرنگە. ئەویش ئازار دەچێژێ.
- پێتوانییە گەر لە ڕۆمانی (باڵندەکەی من) دا باسی لایەنی دەروونی پیاویشت بکردایە و دەنگی تریش لە ڕۆمانەکەدا ئامادەیی هەبوایە، بەرەو ڕۆمانێکی ئایدیاڵی دەچوویت؟
* ئەدەبیاتی ئێمە بە دەست نەبوونی ڕەخنەی جدییەوە دەناڵێنێ. ڕەخنەیەک لە دۆزینەوەی توانای بەهێزی ڕۆمانێکدا ڕۆڵی هەیە. بە پەنا ڕەخنەوە دەبێت ڕەخنە قبوڵکردنیش هەبێت.

ڕەخنە گەر ئسوڵی بێت و ڕۆشنگەر بێت کاری خۆی دەکات، نووسەران بۆ باشترکردنی کارەکانیان پێویستیان پێیەتی.
-باسی شێوازی پەخشانی کارەکانت بکە.
* هەڵبەتە زمانی چیرۆک و ڕۆمان شتێکە و پەخشانی بێگەرد و ڕەوانیش شتێکیتر. بێگومان هەوڵدەدەم بێ هەڵە بنووسم.
- لە ڕوانگەی چیرۆکنووسییەوە، پەخشان سادەو قووڵە و لە ڕوانگەی پیشەییەوە هەڵەی تێدایە.
* ئەشێ وابێت.
- لە کاتی نووسینی چیرۆک یا ڕۆماندا هەوڵ دەدەیت ئاگات لە چ خاڵێک بێت؟
* ئاسایی وریام تا دووچاری درێژدادڕی نەبم. دیسانیش دەگەڕێمەوە بۆ هەمان شتی سەخت کە داهێنەری گرنگترین ئامرازی گەیشتنە بەو.
- زۆر دەخوێنییەوە؟
* گرنگترین ڕەگەزەکانی نووسەری خوێندنەوەی زۆر و باش خوێندنەوەیە. هەموو نووسەرە سەرکەوتووەکانی دنیا کرمی کتێب بوون. بۆرخس دەڵێ من لە نێو کتێبەکاندا دەلەوەڕێم و ناباکۆف دەڵێ خوێنەری باش کتێب بە بڕبڕەی پشتی دەخوێنێتەوە. تازە نرخی دووبارە خوێندنەوە تێگەیشتووم.
- کام کتێب دووبارە دەخوێنییەوە؟
* قەت چیرۆکەکانی چیخۆفم بەلاوە کۆن نابێت. پرۆست بەردەوام سەراسیمەم دەکات و لە خوێندنەوەی چیرۆکی ئەمریکییش تێر نابم.

***سەرچاوە:***

http://www.forum.98ia.com/t275837.html

# سیاسەت و ئەخلاق

## گفتوگۆ لەگەڵ میشێل فۆکۆ*

و. بۆ فارسی: عزت الله فولادوند

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی



میشێل فۆکۆ

**-ئەمڕۆژانە لە ئەمەریکا قسەیەکی زۆر لەسەر ئـەوە ئەکرێت کە کـاری ئێوە بەراورد ئەکەن بە یۆرگن هابرماس. ئەڵێن کاری ئێوە سەروکاری لەگەڵ ئەخلاقدایە و بەرهەمەکانی ئەویش سـەروکـاری لەگەڵ سیاسەتدایە. بۆ نمونە هابرماس لە قۆناغێکی گەشەی فکریدا نووسینەکانی هایدگەری وەك یەکێك لە میراتگەرە شوم و کارەساتبارەکانی نیتچە خۆێندەوە. ئەو ئەمڕۆش هایدگەر لە پەیوەندیدا بە پارێزگارە نوێکانی ئەڵمانیاوە ئەبینێت و بڕوای وایە ئەو داروەدەستەیە میراتگری پاریزگاری نیتچەن و ئێوەش میراتگری ئەنارشیستی ئەو. بەڵام خوێندنەوەی ئێوە بۆ میراتی فەلسەفی هەرگیز لەگەڵ ئەم بۆچونەدا نایەتەوە، وا نیە؟**

* بەڵێ راستە. کاتێک هابرماس لە پاریس بوو. بە درێژی پێکەوە قسەمان کرد، بۆ من زۆر سەرنجڕاکیش بوو کە مەسەلەی هایدگەر و دەرئەنجامە سیاسیەکانی بیرکردنەوەی هایدگەر زۆر بۆی گرنگ و زیندوو بوو. یەکێک لەو شتانەی وتی منی خستە بیرکردنەوەوە و حەزئەکەم زیاتر لەبارەیەوە بیربکەمەوە. ئەو پاش رونکردنەوەی ئەوەی بیرکردنەوەی هایدگەر بەڕاستی لە رووی سیاسیەوە کارەساتبار بووە، گوتی یەکیک لە مامۆستاکانی لە زانکۆ کانت ناسێکی گەورە بوو کە لە دەیەکانی ١٩٣٠دا بەناوبانگ بوو، پاشان رونیکردەوە کە چەند سەرسام و نائومێد بووە کاتێک رۆژێک لە کتێبخانە چاوی بە کتێبگەلێکی چاپی ١٩٣٤ ی ئەو مامۆستا بەناوبانگە کانتناسە کردبوو کە سەرتاسەر لەگەڵ نازیسمدا بوو.

من دواجار هەمان ئەزمونم لەگەڵ ماکس پۆلنتسدا بـوو کە هەموو تەمەنی مـژدەی گەیشتنی بەها گەردونیەکانی رەواقیەکانی ئەدا. بەڵام پاشان بەر

یەکێک لە نوسینەکانی کەوتم کە تەرخانکراوە بۆ "رابەری" لە فەلسەفەی رەواقیدا. ئەبێت پێشەکی و قسەکانی کۆتایی نوسەر لەبارەی "دروشمی رابەری" و مرۆڤگەری "نەتەوە" لەژێر بەرێوبەرایەتی و رێنمایی رابەردا بخوێننەوە بۆ ئەوەی بزانن چی ئەڵێم. هایدگەر هەرگیز شتێکی لەوە نیگەرانترکەری نەنوسیووە. دیارە پێویست بەوە ناکات بڵێن هیچ شتێک لەو نوسینانەدا نیە قوتابخانەی رەواقی یان قوتابخانەی کانت مەحکوم بکات.

بەڵام من بڕوام وایە ئەبێت چەند راستیەک لەبەرچاو بگرین. لەنیوان وێنایەکی فەلسەفی و هەڵوێست و دیدی سیاسی هەستپێکراوی کەسێکدا کە بۆی ئەگەڕێنەوە، پەیوەندیەکی "شیکاری" زۆر کەم و لاواز هەیە. تەنانەت "باشترین" تیورەکانیش کەس لە هەڵبژاردنی رێگەی سیاسی کارەساتبار ناپارێزێت. لەهەندێک بابەتی بە نرخی وەک "مرۆڤگەری" ئەشێت بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێک سوود وەربگیرێت. بۆ نمونە بۆ پیشاندانی ئەوەی پۆلتس بە چ قەدر ناسی و سوپاسێکەوە مومکین بوو پێشوازی لە هیتلەر بکات. ئەنجامگیری من ئەوە نیە کە کەس لە چوارچێوەی تیورەدا رێگە پیدراوە هەرچیەک بڵێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەمەوێ ئەنجامگیری بکەم کە بونی دیدی سەختگیرانە و "تاقیکەرەوە" تا رادەیەک پیویستە. لەهەر ساتەوەختیکدا و هەنگاو بە هەنگاوئەبێت ئەوەی بیری لێئەکینەوە و ئەیلێین لەبەرامبەر ئەوەدا دابنێین کە ئەیکەین و ئەوەی کە هەین. من هەرگیز لەو کەسانە نیگەران نەبووم کە ئەڵێن "تۆ بیرکردنەوەکانی نیتچە وەرئەگری، و لەبەر ئەوەی کە نازیەکانیش سودیان لە نیتچە وەرئەگرت، کەوابوو..."بەڵام لە لایەکی دیوە هەمیشە ویستومە شیکردنەوەیەکی مێژوویی و تیوریی پەیوەندیەکانی لەسەر بناغەی دەسەڵات و دەزگاکان و زانین راوەستاون بەو بزوتنەوە و رەخنە و


میشێل فۆکۆ

ئەزمونانەوە ببەستمەوە کە ئەو پەیوەندیانە لە دیدی واقعەوە ئەخەنە ژێر گومان و پرسیار. ئەگەر جەختم لە "پراکتیک" کردووە، نەک لەبەر "بەکارهێنانی" بیرکردنەوەکان، بەڵکوو بە مەبەستی تاقیکردنەوە و بریندارکردن و گۆڕانیان بووە. ئەبێ بۆ رەمزی دیدی شاعیرانە و شەخسی فەیلەسوف، لە فەلسەفەی ژیانیدا، لە ژیانی فەلسەفیدا، لە هەستەکان و بڕوا ئەخلاقیەکانی شەخسی خۆیدا بگەڕێین، نەک لە بیرکردنەوەکانیدا بەجۆرێک کە وەک ئەوەی بکرێت رەمزی ئەو دیدە لە بیرەکانیەوە ئەنجامگیری بکەین. لەنێوان فەیلەسوفانی فەڕەنسی (کە لەجەنگی جیهانی دوهەمدا) بەشداریان لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی (لە ئەڵمانیا) کرد، تەنها کاڤایسی مێژونوسی مێژووی ماتماتیک بوو کە تێبینی پەیدابون و پەرەسەندنی بونیادە ناوخۆیەکانی ئەدا، هیچ یەک لە فەیلەسوفانی "مۆلتەزیم" - وەک سارتەر و سیمۆن دی بۆڤار و میرلۆ پۆنتی- هیچ کامیان بچوکترین کاریان نەکرد.

**- ئایا ئەم حوکمە بۆ کارە مێژوویەکانیشت ڕاستە؟ بە بڕوای من بەرهەمەکانی ئێوە زۆر زیاتر لەوەی ئەتانەوێت، وەك بەرهەمی بیریارێکی سیاسی ئەخوێننەوە. ئایا ئەمە زیادەڕەویە؟ ئێوە بە میراتگری نیتچە دانێن، ڕاستەوخۆ ناڕاست دێتە بەرچاو و کاری ئێوە لە ئاراستەیەکی هەڵەدا دائەنێت؟**

* من کەم تا زۆر لەگەڵ ئەو بۆچونەدا تەبام کە ئەوەی زۆرتر سەرنجی منی راکێشاوە ئەخلاقیات یان بەهەرحاڵ سیاسەت وەک بنەمای ئەخلاقی بووە.

**- ئایا ئەم قسەیە پێنج یان دە ساڵ پێشتر بۆ کاری ئێوە هەر ڕاست بوو. ئەو کاتەی ئێوەیان زۆرتر بە فەیلەسوف یان بە مێژونووسی دەسەڵات ئەزانی تا مێژونوسی "خود" یان لایەنی "بکەر"؟ بێگومان لەبەرئەوەی کە ئێوەیان لە بنەڕەتدا وەك لایەنگری تیورەیەکی ئەڵتەرناتیڤ لەبارەی سیاسەتەوە ئەبینی، نەك خاوەنی دیدگایەك بۆ سیاسەت. لەبەر ئەمەیە کە مارکسیەکان و لایەنگرانی هابرماس و کەسانی دی ئێوە بە سیمایەك ئەبینن کە ئەبێت نەیارێتی بکەن**

* ئەوەی سەرنجم رائەکێشێت ئەوەیە مارکسیەکان و باڵی چەپ و باڵی ناوەڕاست هەمویان لە سەرەتادا منیان بە دوژمنی خۆیان ئەژمارد. هەستئەکەم ئەگەر بەرهەمەکانی من سیاسی بوایە، دواجار لە مەدای دوردا جێگەیەکی بۆ خۆی پەیدا ئەکرد.

**- لە کوێ؟**

* نازانم... ئەگەر سیاسی بوایە، بە ناچاری لە بواری سیاسیدا رائەوەستا. لە راستیدا من بەتایبەت ویستومە پرسیار لە سیاسەت بکەم و وەک پرسیارکەرێک لەبواری مێژوو و فەلسەفەدا، لە بواری سیاسەتیشدا هەندێک مەسەلە رونبکەمەوە کە پێشتر نەناسراو بوو. مەبەست ئەوەیە ئەو پرسیارانەی ئەمەوێ بیکەم پێشتر لەسەر بناغەی هیچ دیدێکی پێشوەخت دیاری نەکراون و بۆ بەدیهێنانی هیچ بەرنامەیەکی سیاسی دیاریکراو بەرێوە ناچن.

گومانی تیا نیە کاتێک خەڵک سەرزەنشتم ئەکەن کە بۆچی تیورەیەکی گشتی و بەکومەڵ پێشکەش ناکەم، مەبەستیان هەر ئەمەیە. بەڵام من بڕوام وایە کە ئەو وێنە جیاوازە گشتیانەی سیاسەت پیشکەشی ئەکات، هەمیشە زۆر سنورداره. من هەمیشە بەدەر لە هەرجۆرە گشتاندنێک کە هەم ئەبستراکت و هەم سنورداره، مەسەلەگەلێک بکەمەوە کە تا ئەوپەڕی مومکین هەستپیکراو و گشتی بن، مەسەلە گەلێک کە لە پشتەوە لە سیاسەت نزیک ئەبنەوە و بە گشتی

کۆمەڵگاکان بخەنە ژێر روانینەوە، مەسەلەگەلێک کە هەم فورمەلەکەر و دروستکەری مێژووی ئێمە بن و هەم دروستبوو و دەرهاویشتەی مێژووی ئێمە: بۆ نمونە پەیوەندی نێوان تەندروستی عەقڵ و شێتی، مەسەلەی نەخۆشی یان تاوان یان مەسەلەی جنسی. پیویست بوو هەوڵ بدرێت ئەم مەسەلانە وەک مەسەلەی رۆژ بهێنرینە پێشێ و هەم وەک مەسەلەگەلێک لە ئەخلاق و ئەبستمۆلۆجیا و سیاسەت.

**- لە چوارچێوەی خەباتێك کە پێشتر دەستی پێکردووە و بەردەوامە، دیاریکردنی جێگەی کارێکی وا ئەستەمە، چونکە ئەوانی تر پێشتر سنورەکانیان دیاریکردووە...**

* ئەم مەسەلەیە رەهەند و لایەنی جیاوازی هەیە و بردنەوەیان بۆ فـەزای سیاسی شەخسی ئەستەمە. مارکسی وا هەبووە کە وتوێتی بۆ دیموکراسی رۆژئاوا ترسناکم و ئەمە نوسراوە، سۆشیالیستێک هەبوو کە نوسی بیریارێک کە زۆر لە من ئەچو ئەدۆلف هیتلەر بوو لە کتێبی "خەباتی من"دا. لیبراڵەکان منیان بە تەکنۆکرات و فەرمانبەری حکومەتی گولیستەکان (کۆمەڵەی کۆماریخوازەکان) ئەزانی. راستڕەوەکان چ لە گولیستەکان و ئەوانی تر، منیان بە ئەنارشیزمێکی چەپڕەوی ترسناک ناساندووە، مامۆستایەکی ئەمەریکی هەبوو کە ئەیپرسی بۆچی مارکسیەکی شـاراوە و فەرمانبەری "کا گ ب" ی وەک منیان بۆ زانکۆی ئەمەریکا بانگهێشت کردووە و تا دوایی... بەڵام ئەمانە هیچی گرنگ نین. هەموو ئێمە -لەوانە هەستئەکەم خودی ئێوەش- توشی ئەم تۆمەتانە بووین. مەسەلەکە ئەوە نیە کە بابەتێک لە دۆخی خۆم دروست بکەم، بـەڵام هەست ئەکەم وا نیە کە کەسێک بە هێنانە پێشی ئەم پرسیارانە کە خاوەن ناوەڕۆکێکی ئەخلاقی - ئەبستمۆلۆجی - سیاسین. پێگەیەکیان لە سفرەی شەترەنجدا هەبێت.

**- لەزگەی ئەخلاقی بە بڕوای من باشە و زۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام ئەبێ بگوترێت کە ئێوە تەنها لە جیهانی ئەندێشەدا نین. نکوڵی لەوە ناکرێت کە چەندان ساڵە ئێوە لە بەشی زۆر بەرجەستەی کۆمەڵگای فەڕەنسیدا کار ئەکەن، ئەوە سەرنجڕاکێشە شێوەی کارکردنی ئێوە رەنگە جۆرێك تاقیکردنەوەی توانا بوو بێت بۆ جیزبە سیاسیەکان. واتە بەستنەوەی شیکردنەوە بە جۆرێك کردارەوە کە لە خۆیدا ئایدۆلۆژی نیە و لەبەرئەوە ئەستەمە ناوێکی بۆ دابنێین... و ئێوە یارمەتی کەسانی تریش ئەیەن کە خەباتەکانیان لە بواری دیاریکراودا بخەنەگەڕ. ئەم کارە جۆرێك ئەخلاقی باڵادەستە بەسەر مامەڵەی نێوان تیورە و پراکتیك و پەیوەندی نێوان ئەم دوانە بە یەکەوە. بیرکردنەوە و کارکردن پەیوەندی ئەخلاقیان بە یەکەوە هەیە، بەڵام پەیوەندیەك کە چەند ئەنجامێکی هەیە کە ئەبێ پێیان بگوترێت ئەنجامی سیاسی.**

* بەڵێ، بەڵام هەستئەکەم ئەخلاق جۆرێک کردارە، عـادات و بـڕوا سەرەکیەکانی شەخس شێوازێکی بوونە. لێگەڕێن نمونەیەک بهێنمەوە کە پەیوەندی بە هەمومانەوە هەیە، نمونەی پۆڵەندا . ئەگەر مەسەلەی پۆڵەندا تەنها لە رووی سیاسیەوە تەماشا بکەین، ئاشکرایە بە خاڵێک ئەگەین کە بڵێین هیچ شتێکمان لەدەست نایەت. ناتوانین تیپێکی پەڕەشوت یان هێزێکی دەبابە بۆ ئازادکردنی وارشۆ بنێرین. هەستئەکەم لە رووی سیاسیەوە ئەبێت ئەم بابەتە قەبوڵبکەین، بەڵام هەستئەکەم هەموو هاوڕا بین کە بەهۆی ئەخلاقی ئەبێت مەسەلەی پۆڵەندا بەشێوەی قەبوڵنەکردنی ئەوەی لەوێ رووئەدات و قەبوڵنەکردنی هەڵوێستی ئینفیعالی حکومەتەکانی خۆشمان بهێنینە ئاراوە. من هەستئەکەم

ئەم دیدە لە هەمانکاتدا کە دیدێکی ئەخلاقیە، دیدێکی سیاسیشە، و تەنها کورت نابێتەوە بۆ ئەوەی بڵێین "من ناڕازیم"، بەڵکو بریتیە لەوەی ئەو دیدە بگۆڕین بە دیاردەیەکی سیاسی بە ناوەڕۆکێکی هەرچی زیاتر، بۆ ئەوەی کەسانێک کە هەم لێرە و هەم لەوێ حکومەت ئەکەن، زوو یا درەنگ ناچار بن حسابی بۆ بکەن.

**- دیدێك لەبارەی سیاسەتەوە لە ئەمەریکادا هەیە کە ئەیگێڕنەوە بۆ هانا ئارنێت و یۆرگن هابرماس کە دەسەڵات لەبری دەسەڵاتی یەکێك بەسەر یەکێکی تردا، وەك ڕێکەوتنێك لەسەر کار یان کارکردنی دەست لەناو دەستدا ئەبینن. پیدەچێت کاری ئێوە ئەو وێنایەی کە دەسەڵات ئەتوانێت بەشێوەی کۆدەنگی یان بوارێکی نێوان زیهنەکان یا کاری هاوبەش دەرکەوێت، لە بناغەوە سست ئەکات. لە دیدی ئێوەدا دیدێك لەبارەی سیاسەتەوە وەك ئەڵتەرناتیڤ پەیدا ناکرێت. ڕەنگە بەم مانایە بکرێت کارێك ئێوە بە ڕاکردن لە سیاسەت تەفسیر بکرێت؟**

* ڕێگەم بەن چەند نمونەیەکی سادە بهێنمەوە کە لە دەرەوەی ئەو بابەتە نابێت کە باستان کردووە. سیستەمی سـزادان و ئەو پرسیارانە بگرن کە لە ئێستادا دەهێنرێنە پێشێ. ئەزانین لە زۆرێک لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا هەوڵدانێک هەیە بۆ ئەوەی دادپەروەری سزادان بەشیوەیەکی تر وەک "دادپەروەری نافەرمی" لە ئەمەریکا و "شکڵی کۆمەڵایەتی" لە فەڕەنسادا بخەنەگەڕ. ئەمە لە ڕاستیدا بەو مانایەیە کە جۆرێک لە دەسەڵات بە گروپەکان یا ڕابەرانی گروپەکان ئەدرێت. ئەم دەسەڵاتە ملکەچی ڕێسای ترە و پێویستی بە بەڵگەی تر هەیە، بەڵام پەیوەندیگەلێک لە چوارچێوەی دەسەڵاتدا دروست ئەکەن کە بەناچار بایەخیان نیە. چونکە لە لایەن دەوڵەتەوە ڕێگە پێدراو نین و لە هەمان تۆڕی دەسەڵاتەوە تێناپەڕن.

بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەکەی ئێوە. فکری سیاسەتی کۆدەنگی ئەشێت لـەهـەر ساتەوەختێکدا وەک بنەمایەکی ڕێکخستن بەکەڵک بێت یـان لـەوە گرنگتر وەک بنەمایەکی ڕەخنەگرانە لەبارەی شێوە سیاسیەکانی ترەوە، بەڵام من بڕوام نیە کە کێشەی پەیوەندیەکانی دەسەڵات چارەسەر بکات.

**- ڕێگەم بدەن لێرەدا پرسیارێك بکەم و هانا ئارنێت بکەمە بنەما. ئارنێت وشەی دەسەڵات تەنها بۆ یەکێك لە دوو لایەنەکە بەکار دێنێت، بەڵام با ئەم زارەوەیە بە مانایەکی فراوانتر بەکاربهێنین و بڵێین کە ئارنێت دوو لایەنی بۆ دەسەلات لەبەرچاو بوو. پەیوەندیگەلێك لەنێوان خەڵکدا هەیە کە ئەگەر ئەوە بۆ خەڵك ئەڕەخسێنێت دەستیان بە شتگەلێك بگات کە وانەبوایە دەستیان پێی نەدەگەیشت. خەڵك لە ئەنجامی پەیوەندیەکانی دەسەڵات پەیوەندی پێکەوە پەیدا ئەکەن، بە مانای ئەوەی پێکەوە ئەبنە خاوەنی توانایەك کە وا نەبوایە نەئەبون. گریمانەکە لێرە لەسەر بوونی جۆرێك دەرکی هاوبەشە تا دوایی، کە ڕەنگە پەیوەندیەکانی ملکەچیش بگرێتەوە، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی پێویست بۆ کاری هاوبەش ئەشێت بونی سەرۆك و ڕابەرەکان بێت. بەڵام بە بڕوای ئارنێت ئەمە بەهیچ جۆرێك بە مانای دەسەڵاتگەری نابێت، بەڵام ڕەهەندێکی تری دەسەڵات هەیە کە ئەشێت هەمان ئەو پەیوەندیانە دەرئەنجامی بن. ئەم لایەنەش وا ئەخوازێت کە هەندێك کەس بەسەر هەندێکی تردا دەسەڵات بکەن. ئایا ئێوە ئەم دوو لایەنەی دەسەڵات قەبوڵئەکەن یان دەسەڵات لە چوارچێوەی لایەنی دوهەمدا پێناس ئەکەن؟**

* ئێوە زۆر ڕاست ئەکەن کە کێشەی پەیوەندیەکانی دەسەڵات ئەهێنیتە پێشێ. چونکە بە بڕوای من لە زۆرێک لە شیکردنەوەکانی ئارنێتدا – یان بەهەرحاڵ لە دیدگای ئەوەوە – پەیوەندیەکانی دەسەڵاتگەری بەردەوام لە پەیوەندیەکانی دەسەڵات جیاکراونەتەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا من دڵنیا نیم کە ئەم جیاکاریە تەنها جیاکاریەکی لەفزی نەبێت. ئێمە ئەبینین هەندێک لە پەیوەندیەکانی دەسەڵات بەجۆرێک کار ئەکەن کە بە گشتی کاریگەری دەسەڵاتگەریان هەیە، بەڵام ئەو تۆڕەی لە پەیوەندیەکانی دەسەڵاتەوە لەدایک ئەبێت، ڕێگە بە جیاکاریەکی بڕاوە نادات.

بە بڕوای من کاتێک لەم بابەتەوە دەست پێئەکەین، هەم بێ ئەندازە ورد و دور ئەندێش بین و هەم بێ ئەندازە ئەزمونگەر. بۆ نمونە لەبارەی پەیوەندی خوێندن و پەروەردەوە – واتە پەیوەندی کەسێک کە خاوەنی زۆرترین زانینە (مامۆستا) لەگەڵ کەسێکدا کە کەمترین زانینی هەیە (خوێندکار) – ئەوە بڕاوە نیە کە خۆبەڕێوەبردن باشترین ئەنجام بەدەستەوە بدات، بەڵام هیچ شتێکیش نیە بیسەلمێنێت کە بە پێچەوانەوە شێوەیەکی لەم چەشنە ڕێگرێک دروست ناکات . لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەڵێم بە گشتی بەڵێ، بەم کۆتوبەندەوە ئەبێت هەموو شتێک تاوتوێ بکەین.

**- ئەگەر هەندێکجار ئەوەش بە بەڵگەنەویست دابنێین کە نمونەی کۆدەنگی، ئەگەرێکی گریمانەییە، دیسان خەڵك ئەشێت بە پێی ئەو نمونە گریمانەیە بەشێوەیەك کاربکەن کە دەرئەنجامەکانی باشتر بێت لە کارێك کە دەرئەنجامی سیاسەت بێت بە مانای دەسەڵات و سەرکوتکردن. کەوابوو ئەگەرچی ئەشێت لە ڕووی ئەزمونیەوە ئێوە ڕاست بکەن، و ئەگەرچی ئەشێت ئەو ئەگەرە یۆتۆپیە هەرگیز بەدەست نەیەت، بەڵام ڕەنگە لە ڕووی بەرژەوەندی عەمەلیەوە تەندروستر و ئازادانەتر و زۆتر گونجاو بێت لەگەڵ هەر بەهایەکی تر کە بە بەڵگەنەویستی دابنێین کە کۆدەنگی ئامانجێکە ئەبێت بەدوایدا بگەڕێین، لەبری ئەوەی دوری بخەینەوە و بڵێین مەحاڵە؟**

* بەڵێ، هەستئەکەم بۆ نمونە وەک بنەمایەک بۆ ڕەخنەگرتن..

**- وەك بنەمایەکی ڕێکخستن چی؟**

* نە، من ڕەنگە نەڵێم بنەمای ڕێکخستن، چونکە تاڕادەیەک زیادەڕەویە، چونکە ئەگەر لە جێگەیەکەوە دەست پێ بکەیت کە ئەڵێن بنەمای ڕێکخستن، بە بەڵگەنەویستی دائەنێن کە دیاردەی جێی باس لە سنورێکدا کە ئەزمون یان دەق سنورەکەی دیاری ئەکات، ڕێکبخرێت. بەڵام من زۆرتر حەزئەکەم بڵێم ئەوەی قسەی لەبارەوە ئەکەین، چەمکێکە بۆ هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتن کە ئەبێت هەمیشە بپارێزرێت. ئەبێ لە خۆمان بپرسین کە ئەمجۆرە پەیوەندیەی دەسەڵات هەڵگری چ بەشێک یان ڕێژەیەکی نا کۆدەنگیە، و ئایا ئەم پلە ناکۆدەنگیە پێویستە یان نا، و پاش ئەوە هەموو پەیوەندیەکی دەسەڵات تا ئەو پلەیە بخەینە ژێر پرسیارەوە. دوا قسەی من ئەوەیە کە هەندێک جار نابێت لایەنگری لە کۆدەنگی بکرێت، بەڵام ئەبێ دژی ناکۆدەنگیش نەبین.

**- مەسەلەی دەستبەسەراگرتن و کۆنترۆڵکردن، جیایە لە مەسەلەی ڕێکخستن. هەنوکە بەر شێوازی تەواو جیاوازی کارکردنی بوارەکانی دەسەڵات ئەکەوین بەناوی کۆدەنگی یان ڕزگاری یان ئامێری کەسایەتی و لەم بابەتە شتانە کە بەمانای کامڵی دەسەڵاتگەری نیە،**

**بەڵام جوانیش نیە. بە بڕوای من یەکێك لە پێشکەوتنەکانی دەرئەنجامی شیکردنەوەی دەسەڵات ئەوە بووە کە دەریخستووە کە هەندێك چەمکی باڵادەستی کە بە مانای ڕێکخستن نەبووە، ئەتوانێت زۆر ترسناك بێت.**

* لانیکەم لە هەندێک دەزگادا وەک ئەو دەزگایانەی ئروینگ گافمەن ناوی ئەو دەزگایانەی ناوە تۆتالیتار، دەسەڵات بە شیوەی دیسپلینی پراکتیک ئەکرێت و پراکتیک کراوە. ئەم بەشەی دەسەڵات لەیەک جێدا چەقی گرتووە، فۆرمۆلێکە کە لەساتەوەختێکی دیاریکراودا داهێنرا، هەندێک دەرەئەنجامی هەبووە، هەمووی یان هەندێک قابیلی تەحەمولکردن نەبووە لە ئەزموندا و تا دوایی... بەڵام ئاشکرایە کە پیشاندەری هەموو پەیوەندیەکانی دەسەڵات یان هەموو شێوە مومکینەکانی نیە. دەسەڵات جیایە لە دیسپلین، دیسپلین یەکێک لە شێوە مومکینەکانی دەسەڵاتە.

**- بەڵام ئایا پەیوەندی دیسپلین بونی نیە کە بە ناچار پەیوەندیەك نەبێت لەسەر بناغەی دەسەڵاتگەری؟**

* دیارە کە بوونی هەیە: دیسپلینی کۆمەڵەیی. من هەوڵمداوە کە سنوری ئەوەی ئەمەوێ پێیبگەم پیشان بدەم واتە شیکردنەوەی سیمایەکی دیاریکراوی مێژووی یان هونەری وردی حوکمکردن بەسەر تاکەکانا. لەبەرئەوە بە بڕوای من ئەم شیکردنەوانە بە یەکسان بزانین لەگەڵ شیکردنەوەی پەیوەندیەکانی دەسەڵات.

*) لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگیراوە:
فلسفه و جامعه و سیاست. گزیده و نوشته و ترجمه: عزت الله فولادوند. تهران. نشر ماهی.۱۳۸٦.


میشێل فۆکۆ

# هەڵاتن و ئاوابوونی کێکە شارپییەکان

نووسینی: هارۆکی مۆراکامی
بۆ فارسی: مەحمود موڕادی
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

خەواڵوو بووم ڕۆژنامەی بەیانیانم دەخوێندەوە، کە لە گۆشەیەکیدا پڕوپاگەندەیەک سەرنجی ڕاکێشام، (ئاگاداری بۆ سیمینارێکی گەورە. بەرهەمهێنەری کێکە ناودارەکانی شارپی، لە بەرهەمە تازەکانیدا.) تا ئەو وەختە شتێکم لە بارەی کێکە شارپییەکانەوە نەبیستبوو. بێگومان جۆرە کێکێک بوون. هەر چ کاتێک بابەتی شیرینی لە ئارادابێت، ئەوا من تالیم، کاتی زۆریشم هەبوو. بڕیارمدا بڕۆم و ببینم ئەم ئاگاداری سیمینارە گەورەیەی لەبارەی چیەوەیە.

سیمینارەکە لە هۆڵی سەمای میوانخانەیەکی گەورە ڕێکدەخرا و بە چایی و کێک پێشوازییان لە میوانەکان دەکرد. هەڵبەتە کێکەکانیش شارپی بوون. یەکێکم تاقیکردەوە، بەڵام ناتوانم بڵێم خۆشیم لێیهات. پێکهاتەیەکی شیرین و لینجی هەبوو و ڕووەکەی زۆر وشکبوو. باوەڕم نەبوو گەنجانی ئەمڕۆکە کەیفیان بەوەها شیرینیگەلێک بێت.

بەهەرحاڵ، هەموو ئەو کەسانەی لەم کۆبوونەوەیدا بەشدارییان کردبوو، هاوتەمەنی من یا گەنجتر بوون. بلیتێکی ژمارە نۆسەد و پەنجا و دوویان دایە من، لانیکەم سەد کەسیش دوای من هاتن کە پیشانی دەدا پتر لە هەزار کەس لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدارییان کردووە، زۆر کاریگەر بوو.

لە تەنیشت منەوە کچێکی ئاوا بیست ساڵە دانیشتبوو و چاویلکەیەکی ئەستووری لە چاودا بوو. جوان نەبوو، بەڵام کەسێکی خاوەن کەسایەتی دەهاتە بەرچاو.

لێم پرسی: (تا ئێستا لەم شتە شارپییانەت خواردووە؟)

وەڵامی دایەوە: (هەڵبەتە، ئەوانە زۆر ناسراون).

خەریکبوو دەموت: (بەڵێ بەڵام ئەوان زۆریش...) کە لەقەیەکی لە قاچمدا.

ئەو کەسانەی لە چوار دەورمان دانیشتبوون بە تووڕەییەوە سەیریان کردم. کەشێکی ناخۆش دروست بووبوو. بەڵام بە بێگەردانەترین نیگایەک کە



هارۆکی مۆراکامی

وینی خرسە دەیتوانی بیکات، سەروبەری بابەتەکە تێگەیشتم.

دوای تۆزێک، کچە بە گوێمدا چرپاندی: (بزانم تۆ شێتی؟ هاتوویتە جێگەیەکی وەک ئێرە و بە خراپە باسی شارپییەکان دەکەی؟ قەلەڕەشە شارپییەکان کارت دەبینن. بە زیندوویی ناچییەوە ماڵێ).

بە دەنگێکی بەرز وتم: (قەلەڕەشە شارپییەکان کێن ئیتر...)

کچە بەری لێگرتم: (وسسسسسسس)

خەریکبوو کۆبوونەوەکە دەستی پێدەکرد.

سەرۆکی کۆمپانیای کێکە شارپییەکان دانیشتنەکەی بە بەیانکردنی کورتە مێژوویەکی شارپییەکان دەست پێکرد. لەو باس و شیکردنەوە ڕاستەقینانە، بەڵام گومانی دەورووژاند. ئەمەی کە لە سەدەی حەوتەم چۆن کەسێک یا کەسێکیتر چەند مادەیەکی خۆراکی تێکەڵکردبوو تا یەکەمین شارپییەکان دروست بکات. سەرۆکی کۆمپانیا ڕایگەیاند کە لە هەڵبژاردنی شیعرەکانی کۆکین شۆ دا کە لە ساڵی نۆسەد و پێنج نووسراوە، شیعرێکیش کە لە بارەی شارپییەکانەوە هاتووە. خەریکبوو پێکەنینم دەهات، بەڵام هەموو خەریکبوون زۆر جدی گوێیان دەگرت. خۆم ڕاگرت. تازە نیگەرانی قەلەڕەشە شارپییەکانیش بووم.

قسەکانی سەرۆکی کۆمپانیا کاتژمێرێکی خایاند و زۆریش ماندووکەر بوو. هەموو ئەو شتەی دەیویست بیڵێ ئەمەبوو شارپیی شیرینییەکە و پێشینەیەکی سوونەتی دوورودرێژی هەیە، بەڵام ئەو درێژەی دا بە قسەکانی.

کەسی دواتر بەڕێوەبەریی کرێکارانی کۆمپانیا بوو کە بانگهێشتی بەرهەمە نوێکانی کێکە شارپییەکانی لێکدایەوە. ئەو وتی شارپییەکان شیرینی خۆماڵی زۆرباشن کە شانازی بە پێشینەی دوورودرێژی خۆیەوە دەکات. بەڵام بەرهەمێکی بەرجەستەی وەک ئەوانیش پێویستی بە خوێنێکی تازەیە کە درێژە بە پێگەیینی خۆی بدات و بە شێوەیەکی لۆژیکی

لەگەڵ ئەو ڕەوشانەدا فراوان بێت کە شیاوی هەر سەدەمێکی تازەن. ئەشیا ئەم قسانە سەرنجڕاکێش ببینرێن، بەڵام لە بنەڕەتدا خەریکبوو دەیوت تامی شارپییەکان ئێستا ئیتر زۆر کۆن بوون و فرۆشی دابەزیوە، هەربۆیە پێویستیان بە بیرۆکەی نوێیە لە لایەن گەنجانەوە.

کە دەچوومە دەرەوە کۆپییەکم لە بڕیارەکانی کۆمپانیاکە بۆ پێشبڕکێکە وەرگرت. دەبوو شیرینییەکە بە پێی شێوازی شارپییەکان دروست بکرێت و تا یەک مانگیتر ڕادەست بکرێتەوە. بڕی خەڵاتەکە دوو ملیۆن یەن بوو. گەر دوو ملیۆن یەنم دەبوو دەمتوانی لەگەڵ دەزگیرانەکەم هاوسەرگیری بکەم و شووقەیەکی نوێ بە کرێ بگرم. هەربۆیە بڕیارمدا کێکێکی شارپی تازە دروست بکەم.

هەر وەک پێشوو وتم بابەتی شیرینی لە گۆڕێ بێت، زۆر تامەزرۆم و خۆم دەتوانم تاڕادەیەک هەر شتێک بە هەر شێوازێک دروست بکەم. هەویری لۆبیا، نانی خامەیی یا کولیچە. دروستکردنی کۆپییەکی نوێ لە شارپییەکان، ئەویش لە ماوەی مانگێکدا بۆ من زۆر ئاسان بوو. لە مێژووی بڕیار لێدراودا یەک دەرزەن کێکی شارپیم دروست کرد و بردم بۆ شوێنی پێشوازی کۆمپانیای کێکە شارپییەکان.

ئەو کچەی بەرپرسی ئەوێ بوو، وتی: (باش دێنە بەرچاو.)

وتم: (باشن.)

دوای مانگێک لە لایەن کۆمپانیای شارپییەوە تەلەفۆنیان کرد و ویستیان ڕۆژی دواتر بچم بۆ نووسینگەکەیان. بۆینباخم بەستوو چوومە ئەوێ و لە هۆڵی پێشوازی چاوم بە بەڕێوەبەریی پەیوەندییەکان کەوت.

وتی: (کێکە شارپییەکە بۆتە جێگەی پێشوازی کرێکاران. بەتایبەت کرێکارە گەنجەکان.)

وتم: (خۆشحاڵم ئەمە دەبیستم.)

(لە لایەکی ترەوە کرێکارە دێرنیەکانیش کەسانێکن کە - چۆن بڵێم - ئەوان دەڵێن، ئەو شتەی تۆ دروستت کردووە، کێکی شارپی نییە. ئەم بابەتە باسوخواسی جدی بەرپاکردووە.)

وتم: (تێدەگەم.) دەمویست بزانم دەیەوێ چ ئەنجامێک لە قسەکانی بگرێت.

(باشە، دەستەی بەڕێوەبەرێتیی بڕیاریاندا بڕیاردان لە بارەی تۆوە بخەنە ئەستۆی قەلەڕەشە شارپییەکان.)

بە دەنگی بەرز وتم: (قەلەڕەشە شارپییەکان؟ قەلەڕەشە شارپییەکان ئیتر چین؟)

بەڕێوەبەریی کرێکارەکان ئەبڵەق سەیری کردم: (مەبەستتان ئەمەیە بێئەوەی شتێک لە بارەی قەلەڕەشە شارپییەکانەوە بزانن بەشداری پێشبڕکێکەتان کردووە؟)

(بە داخەوە، بەڵام من ژیانی بێ هەراوهۆریام هەیە.)

وتی: (زۆر خراپە. ئەگەر تۆ شتێک لە بارەی قەلەڕەش شارپییەکانەوە نازانی ئەوسا...) بێدەنگ بوو: (ئۆە، گرنگ نییە لەگەڵمدا وەرە.)

بە دوای ئەودا تا دەرەوەی ژوورەکە، کۆتایی ڕاڕەو و ناو ئاسانسۆر تا نهۆمی شەش و دواتر ڕاڕەوێکی تر کە لە کۆتاییەکەیدا دەرگایەکی گەورەی ئاسن هەبوو، ڕۆیشتم. بەڕێوەبەر، پەنجەی بە دوگمەی زەنگەکەدا ناو کتوپڕ پاسەوانێکی کەتە دەرکەوت. کاتێک پاسەوانەکە جەختیکردەوە ئەو

بەڕێوەبەریی کرێکارانە، دەرگا گەورەکە کرایەوە. ڕەوشی ئاساییشی ئەوێ زۆر توندوتۆڵ بوو.

بەڕێوەبەریی کرێکاران وتی: (پایە بڵند، قەلەڕەشە شارپییەکان، لێرە دەژین. ئەوانە لە ماڵباتێکی تایبەتی باڵندەکانن کە سەدەگەلێکە جگە لە کێکی شارپی هیچی تریان نەخواردووەو هەر بە زیندویی ماونەتەوە.)

پێویست بە ڕوونکردنەوەی تر نەبوو. پتر لە سەد قەلەڕەش لە ژوورێکی ئەشکەوت ئاسادا بوون وەک کۆگایەک یا بنمیچێک بە بەرزی چوار مەتر و نیو و نیرگەی درێژ کە لە دیوارێکەوە تا دیوارێکی تر بەردوامی هەبوو. قەلەڕەشە شارپییەکان لە ڕیزی شەتەکدراودا لەسەر هەر یەک لە نیرگەکان هەڵنیشتبوون. زۆر لە قەلەڕەشی ئاسایی گەورەتر بوون و بە ئاسانی درێژییەکەیان مەترێک دەبوو. تەنانەت چکۆلەترینیشیان لانیکەم شەست سانتیمەترێک درێژ بوو. تێگەیشتم چاویان نییە و لەو جێیەی کە دەبوو چاویانی لێبێت پەڵە دووگی سپیی هەبوو و جەستەیان تا سنووری تەقینەوە ئاوسابوو.

قەلەڕەشەکان کە دەنگی چوونە ژوورەوەی ئێمەیان بیست، کەوتنە قیرەقیڕ و لێکدانی باڵەکانیان. لە هەوەڵەوە دەنگیان لە هەراوزەنایەکی بێ مانا دەچوو، بەڵام کە گوێم پێی ڕاهات، تێگەیشتم وەکبڵێی خەریکن هاوار دەکەن: (شارپی! شارپی!) سەیرکردنی ئەو بوونەوەرانە زۆر ترسناک بوو.

بەڕێوەبەر لە ناو سندوقێکدا کە بە دەستییەوە بوو، کێکە شارپییەکانی ڕشتە سەر زەوییەکە، لە وەڵامیدا ئەو هەموو سەد و چەند باڵندەیە ڕژانە سەر کێکەکان. قەلەڕەشەکان لە خۆشی گەیشتن بە کێکە شارپییەکان دەنووکیان لە چاو و قاچی یەکتری دەدا. سەرسووڕمانی نەدەویست کە چاوەکانیان لە دەست دابوو.

دواتر بەڕێوەبەر شتێکی وەک کێکە شارپییەکان لە سندوقێک دەرهێناو ڕشتییە سەر زەوییەکە و بە منی وت: (سەیرکە. شێوازی دروستکردنی ئەمەیان لە پێشبڕکێکە لابراوە.)

باڵندەکان وەک پێشوو هێرشیان برد، بەڵام هەر کە تێگەیشتن ئەمانە کێکی شارپی ڕاستەقینە نین، ڕشتیانە دەرەوە و کەوتنە قیژە و هاواری تووڕە.

شارپی!

شارپی!

شارپی!

قیژەقیژیان ئەوەندە لەسەر بنمیچەکە پەرچی دایەوە کە وردەوردە گوێکانم تووشی ئازار بوون. بەڕێوەبەر بە تەوسەوە پێکەنی و وتی: (دەبینی؟ ئەوانە تەنها شارپیی پەتی دەخۆن، دەنووک بۆ شتێک نابەن ساختە کرابێت.)

شارپی!

شارپی!

شارپی!

(ئێستا، وەرە با کێکە شارپییە تازەکانی تۆ تاقیبکەینەوە. گەر بیخۆن تۆ براوەی. گەر نەیخۆت دۆڕاوی.)

ئەی وای، شتێک بە منی دەوت بارودۆخەکە باش ناچێتە پێش. ئەوان نەدەبوو لێگەڕێن ڕەوەیەک باڵندەی گەمژە بڕیار لە بارەی ئەنجامی پێشبڕکێکەوە بدەن. بەڕێوەبەر بێئاگا لە دوودڵی من، بە توندی کێکە شارپییە تازەکانی منی ڕشتە سەر زەوییەکە. دووبارە قەلەڕەشەکان هێرشیان

برد و دواتر ژاوەژاوێک دروست بوو. هەندێک لە باڵندەکان بە تامەزرۆییەوە شارپییەکانی منیان خوارد، بەڵام هەندێکی تر لە دەنووکیانەوە فڕێیان دانەوە و قیژاندیان: (شارپی! شارپی! شارپی!) بەڵام قەلەڕەشەکانی تر کە نەیاندەتوانی خۆیان بگەیەننە کێکەکان، شێت بوون و کەوتنە دەنووک دان لەم باڵندانەی کە خەریکبوون کێکەکانیان دەخوارد.

خوێن هەموو جێیەکی گرتبۆوە. یەکێک لە قەلەڕەشەکان خۆی هەڵدایە سەر کێکێک کە قەلەڕەشێک فڕێیدابوو، بەڵام قەلەڕەشێکی لاشە زل پێوەی نووسا و بە دەنگی قیژەی شارپی سکی قەلەڕەشی یەکەمی دڕاند. دواتر شەڕی یەک بە یەک دروستبوو. خوێن، خوێنی هێنا و توندوتیژی، توندوتیژی. هەموویشی لەسەر چەند پارچە شیرینییەکی گاڵتەجاڕ بوو. بەڵام بۆ باڵندەکان ئەم کێکانە هەموو شتێک بوو. بۆ ئەوان شارپی بوون یا نەبوونی کێکەکان پرسی ژیان و مردن بوو.

بە بەڕێوەبەرم وت: (سەیرکە چیت کرد؟ کتوپڕ کێکەکانت بەمجۆرە لەبەردەمیاندا رشت. بزواندنت.)

بە تەنیا لە ژوورەکە چوومە دەرێ. سواری ئاسانسۆرەکە بووم و لە تەلاری کێکە شارپییەکان هاتمە دەرێ. پێمخۆش نەبوو دوو ملیۆن یەن خەڵات لە دەست بدەم، بەڵام نەمدەویست پاشماوەی تەمەنم بۆ ئەم قەلەڕەشە نەعلەتییانە بەند بکەم.

لەوە بە دوا هەر خواردنێکم پێخۆش بێت بیخۆم، دروستی دەکەم. بۆیشم جیاواز نییە. لێگەڕێ شارپییە نەعلەتییەکان تا کەوشەنی مەرگ دەنووک لە یەکتری بدەن.

***سەرچاوە:***

نفر هفتم
هاروکی موراکامی
ترجمە: محمود مرادی
نشر سالس، چاپ، اول ١٣٩٠

# چەند شیعرێکی کۆستەنتین کافافی

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

## میریس
## ئەسکەندەریە ساڵی ٣٤٠ز



کە کارەساتی مەرگی میریسم بیست
چووم بۆ ماڵەکەی
هەرچەندە من خۆم لە ماڵە کریستیان دەبوێرم
بەتایبەتی کە لە خەم و جەژندابن

لە دالانەکەدا وەستام و نەم ویست بچمە ژوورەوە
چونکە کەس و کاری گەنجە مردووەکەم بینی
بە شپرزەیی و بێزاریەوە تەماشایان دەکردم.
تەرمەکەیان لە ژوورێکی گەورە دانابوو
دەمتوانی لە کۆتایی دالانەکەوە بیبینم
ژوورەکە پڕ بوو لە فەرشی گرانبەها و دەفری زێڕ و زیو
لە کۆتایی دالانەکەدا وەستابووم و دەگریام
بیرم لەو دیدار و سەفەرانە دەکردەوە
کە ئیدی بەبێ میریس چ بەهایەکیان نیە
بیرم لەوە دەکردەوە کە ئیتر
لە گەڕانی شەوە خۆش و ئاپوورەکاندا
نایبینمەوە
ئەو شەوانەی...
بە کوڵ و دڵ پێدەکەنی و شیعری دەخوێندەوە
شیعر، بەو هەستە ناوازەیەوە کە بۆ کێشی گریکی هەیبوو
بیری ئەوەی کە ئیدی هەرگیز جوانیەکەی نابینمەوە
من بۆ هەتاهەتایە لاوێکم لە دەست چوو
کە خۆشم دەویست

هەندێک پیرێژن، لە نزیکمەوە،
لەسەرخۆ دەدوان
باسی دوارۆژانی ژیانی میریسیان دەکرد
کە چۆن ناوی مەسیحی لەسەر لێو و
خاچیشی بەدەستەوە بووە



پاشان چوار قەشە چوونە ژوورەکە
بە گەرمیی کەوتنە خوێندن
سرود و درودیان بۆ مەسیح نارد
یان بۆ مریەم بوو (من باش شارەزای ئاینەکەیان نیم)
بێگومان، ئێمە پێشتر دەمانزانی میریس کریستیانە
پێش دوو ساڵ، هەر لە یەکەم ساتی ناسینمانەوە
کاتێک هاتە ناو گروپەکەمانەوە ئەوەمان زانی
بەڵام ڕێک وەک ئێمە ژیا
لە هەریەکێک لە ئێمە زیاتر ڕای دەبوارد
لە مەلهاکانماندا پارەی تەخشان و پەخشان دەکرد
بێ ئەوەی گوێ بە ناوزڕاندن بدات
شەوانە، لە شەقامەکاندا، بە شەوقەوە
شەڕی لەگەڵ گروپە نەیارەکانماندا دەکرد
میریس هیچ ڕۆژێک باسی ئاینەکەی خۆی بۆ نەکردین
ڕۆژێک، بە ڕاستیی، ئاگادارمان کرد
کە لەگەڵ خۆماندا دەیبەین بۆ (سیرابیۆن)
ئێستایش لە بیرمە
گاڵتەکەی ئێمەی پێ ناخۆشبوو
دوو ڕووداوی تریشم لە یادە
کاتێک پێکی شەرابمان بۆ قوربانیی پۆسایدۆن گرتەوە
ڕووی وەرگێڕا و دانیشتنەکەی بەجێهێشت
کاتێکیش یەکێکمان، بە حەماسەتەوە وتی:
ئەپۆڵۆی مەزن و جوان گروپەکەمان بپارێزیت.
میریس بۆڵەیەکی کرد (بێجگە لە من کەس گوێی لێ نەبوو)
قەشە مەسیحیەکان لەسەر لاوەکە
بە دەنگی بەرز نوێژیان دابەست

به وردی و دڵكاریەوە
سەرنجم دا، چەند بە وردیی، هەموو شتێكی مەراسیمی
ئاینەكەیان بۆ تەرمەكە ئامادەكرد.
تەرمی مەسیحیەك .
من لە پڕێكدا، هەستێكی نامۆم تێ گەڕا
هەستم كرد میریس لێم دوور دەكەوێتەوە
هەستم كرد بووە بە یەكێك، بە مەسیحیەك لەناو نەتەوەكەیدا
منییش بووم بە غەریبێك، غەریبێكی تەواو.
پڕیش بووم لە گومان
دەشێت سۆزە تایبەتیەكەم منی خەڵەتاندبێت
لەوانەیە بەردەوام نامۆ بووبێتم بەو
بەپەلە لە ماڵە سامناكەكەیان هەڵاتم
پێش ئەوەی مەسیحیەتەكەیان
بەسەر یادی میریسدا زاڵ بێت و
یادەوەریەكان بگۆڕێت



## لە قوتابخانەی فەیلەسوفێکی ناوداردا

دوو ساڵ.. قوتابی ئەمونیس ساکاس بوو
بەڵام لە فەلسەفە بێزراو و
ساکاسییش بێزارتری کردبوو.
چوە سیاسەتەوە و زوو دەستی لێ بەردا
چونکە حاکمەکەی گێل و
دەستەودایرەکەی بووکەڵەیەکی فەرمی و
خاوەن ڕوخسارێکی ناجۆر بوون.
زمانی گریکی ئەو داماوانە
تەواو بەربەری بوو

پاشان حەزی سووسەکردن
بەرەو کڵێسای برد
تەعمید بکرێ و ببێت بە کریستیانی
بەڵام زوو ڕاکەی گۆڕی
چونکە ئەوە دەبوە دوژمنکاریی
لەگەڵ خێزانە دەمارگیرە بت پەرستەکەیدا
بەوەیش - ئەمە ترسناکە - هاوکاریە
زۆر هەراوەکەی لێ دەبڕن.

هەرچۆنێکە... دەبێت هەرشتێک بکات
بوو بە مشتەریی هەموو ماڵە سۆزانیەکانی ئەسکەندەریە و
گشت پەنا و پەسێوی گەڕەکی لەش فرۆشان
لێرەدا ڕێکەوت فریای کەوت
سیمایەکی جوانی پێ بەخشی
چێژی لەم خەڵاتە یەزدانیە وەرگرت
کە لانی کەم، دە ساڵ بەو جوانیەوە دەمێنێتەوە
پاشان...
لەوانەیە جارێکی تر بگەڕێتەوە لای ساکاس
ئەگەر لەو کاتەدا، پیر مردبێت
دەڕواتەوە لای فەیلەسوف یان دانایەکی دی
چونکە دەشێت...
تۆ هەمیشە کەسێکی شیاو بدۆزیتەوە.
لە کۆتاییدا
لەوانەیە بگەڕێتەوە ئامێزی سیاسەت.
جارێکی تر بە شانازیەوە
باس لە داب و نەریتی خێزانەکەی..
ئەرکە نیشتیمانیەکانی و
باق و بریقەکانی لەم بابەتانە.. بکات.



## ئاوێنەی ناو هۆڵ

لە هۆڵی ماڵە دەوڵەمەندەکەدا
ئاوێنەیەکی گەورەی کۆن دانراوە
هەشتا ساڵێک دەبێت کڕیویانە
گەنجێکی جوان، شاگرد بەرگدروو
(ئارەزوومەندی وەرزشی ڕۆژانی یەک شەممە)
بە ڕوزمەیەکەوە وەستابوو
ڕوزمەکەی دایەدەست کەسێکی ماڵەکە
ئەو لێی وەرگرتوو چوو وەسڵی وەرگرتنەکەی بۆ بێنێت
گەنجەکە، بە تەنیا، چاوەڕێی کرد
دوای پێنج دەقیقە وەسڵەکەیان دایە دەستی
وەری گرت و ڕۆشت
وەلێ ئەو ئاوێنەیەی بە درێژایی تەمەنی
هەزاران شت و هەزاران ڕوخساری دیبوو
ئەو ئاوینە کۆنەی لاوەکەی دیبوو
هەنووکە دڵی خۆشە و شانازیی دەکات
کە بۆ چەند دەقیقەیەکی کەم
بە دیداریی ئەو جوانیە شادبوە.



## ئەو پرسیاری لە جۆرایەتی دەکرد

لەو نووسینگەیەی کارێکی نابووتی..
بە مووچەیەکی کەم تیا دەکرد
( لە هەفتەیەکدا نزیکەی هەشت نۆ جونەیهـ لەگەڵ
مزەیەکی سەربااردا)
دوای تەواو بوونی کارەکەی
کە بە درێژایی ئەو دوا نیوەڕۆیە
پشتی کۆمابووەوە
سەعات حەوت چوە دەرەوە
لەسەرخۆ، وێڵ وێڵ بە شەقامەکاندا گەڕا
سیمای جوان و سەرنج ڕاکێش بوو
وەک لە هەرەتی لاویدا بێت وابوو
چونکە مانگێک دەبوو
تەمەنی گەیشتبوە بیست و نۆ ساڵ
سەرەڕۆ بەو شەقام و کۆڵانانەدا تێ دەپەڕی
کە دەیان بردەوە سەر ماڵەکەی.
بە پێشی کۆگایەکی چکۆڵەدا تێ پەڕی
هەموو جۆرە کەل و پەلێکی کۆن و
شتی هەرزان بەهای کرێکارانی تیا دەفرۆشرا
کاتێک لەناو کۆگاکەدا
ڕوخسارێک سەرنجی ڕاکێشا، چوە ژورێ
خۆی وادەرخست
ئارەزووی لە بینینی دەستەسڕە ڕەنگاوڕەنگەکانە
بە دەنگی گیراوەوە پرسیاری لە دەستەسڕەکان کرد،
دەنگی پڕبوو لە ئارەزوو
دەربارەی نرخ و جۆری دەستەسڕەکان
وەڵامێکی سەرسوورڕهێنەر لە دەنگێکی نزمەوە هات
دەنگی قایل بوونێکی ژێر بە ژێر
ئیتر لەبارەی کەل و پەلەکانەوە
بە جووتە شتیان وت و وتیانەوە
تاقە شتێکیان فەرامۆش کردبوو:



دەبوو دەستیان، بەسەر دەستەسڕەکانەوە
بەریەک بکەوێت
دەبوو دەم و چاویان لە یەکدی نزیک ببوایەتەوە
لێویشیان هەروەها
وەک ڕێکەوت وای هێنابێت
لە شکۆمەندیەکی لەناکاوی بەیەک گەیشتنی جەستەدا
خێرا، بەدزیەوە
بە شێوەیەک بێت کە خاوەن پێشانگاکە
ئەوەی لە دوور دانیشتوە
هەست بە هیچ شتێک نەکات.

***سەرچاوە:***

وداعا للأسكندرية التی تفقدها.



# ئێکسیری وشـــــــه

ئارتور رامبۆ

له فارسییه‌وه: هادی محه‌مه‌دی

ئێستا کاتی ئه‌وه هاتووه که به‌سه‌رهاتی یه‌کێ له شێتییه‌کانم بگێڕمه‌وه.

ده‌مێک ساڵان پێم وابوو که هه‌موو ئاسۆکان له منه‌وه ده‌ست پێده‌که‌ن و هه‌موو سیماکانی بواری شیعری مۆدێرن و نیگارکێشیم به گاڵته ده‌زانی.

حه‌زم له‌م جۆره شتانه بوو:

نه‌خش و نیگاری ده‌رگاکان، تابلۆی سه‌ر دوکانه‌کان، ئه‌ده‌بیاتی کۆن، خه‌تی لاتینی کلێسا، کتێبی ئاشقانه‌ی پڕ له هه‌ڵه‌ی نڤیساری، به‌سه‌رهات و چیرۆکی دایه گه‌وره‌کان، کتێبی مناڵان، ئۆپێرای کۆن، گۆرانی ساکار، کێش و سه‌روای ناشیانه.

خه‌ونم به جه‌نگی خاچه‌وه ده‌بینی، به‌و سه‌فه‌رانه‌وه که له‌ودا به‌شێک له جیهانیان دۆزیوه‌ته‌وه، کۆماری بێ مێژوو، جه‌نگی ئایینی سه‌رکوتکراو، ڕوخانی ده‌سه‌ڵات به‌هۆی گه‌نده‌ڵی، کۆچی خه‌ڵکی وڵاتان :بڕوام به هه‌موو شتێکی ئه‌فسوونی هه‌بوو.

ڕه‌نگی پیته بزوێنه‌کانم ناسی A = ڕه‌ش، E = سپی، I = سوور، O = شین، U = سه‌وز.

خۆم فۆرم و بزاڤی پیته بێ ده‌نگه‌کانم دیاری ده‌کرد و به شانازییه‌وه له‌نێوان کێش و ریتمی ئاسایی دا وشه‌یه‌کی شاعیرانه‌م ده‌بینییه‌وه که ده‌کرا ڕۆژێک له هه‌ر ڕسته‌یه‌ک دا به‌کاری بێنم.

ده‌ستم له وه‌رگێڕان هه‌ڵگرت.

به‌مجۆره خوێندنه‌وه ده‌ستی پێکرد. بێده‌نگیم ده‌نووسییه‌وه، شه‌وه‌کانم به نووسین تۆمار



ئارتور رامبۆ

دەکرد، ئەو شتانەم یاداشت دەکرد کە بەیان نەدەکران. سەرئێشەکانم تۆمار دەکرد.

دوور لە باڵندەکان، مێگەلە مەڕ، ژنانی دێ،
لە مێرگوزار چۆکم دادا و چیم خواردەوە
چۆن بوو کە خەڵفی تازەڕسکاوی فستق
لەنێو مژی سەوزباوی نیوەڕۆدا وەستابوو؟
لەم هەسێڵە شەنگە ئەمتوانی چی بنۆشم
نارەوەنی سووری بێدەنگ، گیای بێ گوڵ،
ئاسمانی خۆڵەمێشی!

حەزم ئەکرد دوور لە ماڵ لەو جامە زەردە بنۆشم؟
بە خواردنەوەی ئاوی زێڕ، هەموو جەستە ئارەقی لێدەنیشێ.

لە تابلۆیەکی خێچی مەیخانە دەچووم
تۆفان هەڵیکرد و تەم و هەوری تاراند.
شەودرەنگان، شێی دارستان لە لمی پەتی دا بزر بوو،
بای خودا لەتە شەختەکانی بەسەر خاک-
گەلاکان دا ڕژاند؛
مڕ بووبوم، زێڕم بینی و نەمتوانی بینۆشم.
سەعات چواری بەیانی هاوینان
خەون و خولیای عاشقانە بەڕێوەن.
لەنێوان بژوێنەکان
عەتری هەرسی شەوانە هەڵدەکات.
لە حەوشەی ماڵەکان، لە بەر هەتاوی هیسپرید
دارتاشەکان بە ئارامی کار ئەکەن و
پەنجەرە و هەیوانی جوان چێ دەکەن
تا شار دیدگای خۆی لە ئاسمان دا بنەخشێنێ.

ئەی ڤینۆس! ڕێزی عاشقان بگرە
لەپێناو دەسەڵاتی گیان
خزمەتکارانی شۆخی پادشای بابل
بەم کرێکارانە ببەخشە،
ئەی شاژنی شوانان
ئێکسیر بێنە بۆ کرێکاران
تا وزەیان پێ ببەخشی


ئارتور رامبۆ

[ئاخر] ئێواران دەچن بۆ دەریا.

هونەری کۆنی شیعر، ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە ئێکسیری وشەکانی من دا.

تووشی وەهم دەبووم: مزگەوتم بە کارخانە دەبینی، پۆلی پەریانی تەنبورژەن، بە چەندین
کەژاوە بەرەو ئاسمان دەچوون، باڵکۆنێک بەسەر دەریاوە، دێوەکان، ڕاز و ڕەمزەکان: ناوی شانۆنامەیەکی ئاسایی، کابوسی لە من دا دەبزواند.
هەموو ئەم پەیڤە ئەفسوونییانەم بە وشەکانی وەهم بەیان ئەکرد!

بە تێپەڕینی کات دەتوت ئاڵۆزی ڕۆحی بەسەرم دا زاڵ بووە. تەسلیمی یاوێکی قورس بووم و هیچ کارێکم نەکرد:
ئاژەڵانم بە بەختەوەر دەزانی و ستایشم دەکردن، کرمەکان وەک هێمای بێ تاوانی بەرزەخ، مشکە کوێرەکان، خەوی قورسی کچێنی!

تاڵ بووم. ماڵاواییم لە جیهانی ڕۆمانتیک کرد:

سروودی بەرزترین قەڵا

لێگەڕی با بگات، لێگەڕی با بگات

سەردەمی خەون و خولیا.
دەمێک ساڵان چاوەڕێی بووم
تا هیچ نەزانین.
هەموو ژان و وەهمێک
بۆ هەمیشە بەسەر چوون و
تینوێتیم بە دەریا
خوێنم تۆخ و تاریک دەکا.
لێگەڕی با بگات، لێگەڕی با بگات
سەردەمی خەون و خولیا.
وەک بەرینایی دەشت
لە فەرامۆشی دا.
ئەوەی کە بتوانێ
لە بێشکەی گیزە گیزی مێشە پیسەکان دا
لەگەڵ دڕک و بژار بپشکوێ.
لێگەڕی با بگات، لێگەڕی با بگات
سەردەمی خەون و خولیا.

قاقڕ و شۆرەکاتم خۆش دەویست، باغە سوتاوەکان، ژوور و دوکانی تاریک، شەرابی ترشاو. بەخێرایی بە کۆڵانە شێدارەکان دا ڕەت دەبووم و بە چاوی بەستراو خۆم بە هەتاو، بە یەزدانی ئاگر دەسپارد.

«ژەنراڵ، ئەگەر تۆپێکی کۆنیش لەنێو دیوارە خاپوورەکان دا مایەوە، بەردبارانمان کە. لەنێوان پەنجەرەی فرۆشگە پڕفرۆشەکانەوە! لە داڵانەکان دا! لێگەڕی با شار لەنێو گۆڕی تەم و مژی خۆی دا ڕۆبچێ. لێگەڕێ با پلورەکان برزێن. بە تۆزی سوتێنەری عەقیق خەڵوەتخانەکان بئاخنە...»

ئاخ، مێشولە لە میزگەی مەیخانەدا خۆی غەرق ئەکا، بە هۆرم و بۆنی توونی مەست ئەبێ و لە هەڵقوڵانی میزدا دەتوێتەوە.

برسیەتی

ئەگەر بمەوێ
قاوەتیم
تەنیا خاک بەرد بێت
بەڵام ئەی هەوا، گاشە، خەڵوز، پۆڵا.
برسیەتی، بگەڕێوە.
گیا، برسیەتی، بچۆ بۆ مەزرای گەنم و
ژەهری شادی «با» فریو بدە.
گاز لە گاشەکان بگرە و بەردی کۆنی پەرسگاکان ورد بکە؛
زیخ و چەوی پاشماوەی لافاوی کۆن
تۆوەکانی خوانی دۆڵ و دەرەی خۆڵەمێشی.
گورگ لەنێوان شێخەڵ دا دەیمڕان و
پەڕ و پۆی نێچیرەکەی هەڵدەوەران:
هەم ئەو، هەم من لە وزەمان دایە؛ هەرس.
پرپین، میوەکان بە ڕێگەدا ڕژاون
چاوەڕێی چنینەوەن؛
بەڵام تەنیا وەنەوشە
جاڵجاڵۆکەی نیو بژوێن دەخوازێ.
لێگەڕێ با بخەوم، لێگەڕی با لاڵ بم
لەسەر مێحرابی سلێمان.

بەرەو چۆمی سێدرۆن، لافاوی ئەسکەنە
لە بان کێم و زۆخی گۆشتی گەنیوم.

لە ئاکام دا، ئاخ خۆشبەختی، ئاخ هەقیقەت،
ئاوی ڕەشم لە ئاسمان سڕییەوە و وەک ئاوی
زێڕین لە نووری سروشتی دا ژیام. بە کۆمێدیترین
و ئاڵۆزترین شێوە شادیم بەیان کرد:

دیسان دۆزرایەوە!
چی؟ ژیانی تاهەتایی.
وەک پێوەندی دەریا و هەتاو.
ئەی گیان کە نەمریت
سوێندی خۆت بەجێ بێنە،
شەوان بە تەنیایی و
ڕۆژان لە ئاگردا.
نامانەوێ تەسلیمی قسە و ئارەزووی خەڵک بین
تۆ ڕێگەی خۆت بگرە
قەت چاوەڕێی هیچ مەکە
هیچ دەنگێک نییە
زانین و چاوەڕوانی
چ پاداشتێک لەمە باشتر نییە.
لە دوا ساتی کازیوەدا
ئەی ئاگری حەریرئاسا،
نووری تۆ ئەرکی منە.
دیسان دۆزرایەوە!
چی؟ ژیانی جاویدان.
وەک پێوەندی دەریا و هەتاو.

بووم بە ئۆپێرایەکی ئەفسانەیی: دیتم هەموو بوونەوەران ناچارن بە ژیانی بەختەوەر: کردار، خودی ژیان نییە، وزە و توانا لەکیس ئەدات؛ دواکەوتن. ئەخلاق، مێشکی مرۆڤ دەڕزێنێ.

پێم وابوو هەر بوونەوەرێک مافی ژیانێکی تری هەیە. یەزدان نازانی چی ئەکات: ئەو فریشتەیە. بنەماڵە، لانەی تووتکە سەگەکانە. لەگەڵ زۆر مرۆڤی جیاواز ئەدوام، بە دەنگی بەرز باسی ژیانی ترم بۆ ئەکردن؛ بەمجۆرە: سەردەمێک بەرازێکم خۆش ویستووە.

لە هیچ سەفسەتەیەکی شێتانە کە زیندانی دەکرێت چاوپۆشیم نەکرد: ئەتوانم هەموویان ناو ببەم. بە ڕیز دەیانناسم.

تەندروستیم تووشی مەترسی بوو. ترس لە مەرگ پەرەی سەند. هەندێ جار بە ڕۆژانە دەخەوتم، بە ڕۆژ خەوگەڕ بووم. خۆم بۆ دواین سات ئامادە کردبوو، ئەم دەردەم بە زۆر ڕێگەی پڕمەترسی دا بەرەو هەموو قوژبنێکی جیهان و سیمر [دەڤەری کەنعان]، پێوەری تاریکی و گەردەلولەکانی بردم.

دەبوو سەفەرم کردبا، ئەو ڕێگەیە کە مێشکم هەمواری کردبوو، تێکڕوخا. حەزم لە سەفەری دەریایی بوو، ئاخر ژەنگ و ژاری گیانمی لەنێو ئەبرد، دیتم خاچی دڵارامی هەڵهات. پەلکەزێڕینە مەحکومی کردبووم. بەختەوەری، نەفرینی

کردبووم، وەکوو کرم پێچ ئەخۆم و ئەکشێم:
ژیانم هەردەم لەوە مەزنترە تا باسی هێز و
جوانی بکات.
بەختەوەری! دیانی شیرینی بکوژ بە قوولەی
کەڵەشێران-ad matutinum-١ لە
غەمگینترین شارەکان – Christus venit-
٢دا هەڕەشەی لێدەکردم.

ئەی وەرزەکان، ئەی کۆشکەکان!
کام گیان بێ هەتوانە؟
لە بەختەوەری ئەفسونێک فێر بووگم
کە هەردەم لە برەو دایە.
لە کازیوەی بەربەیان دا
کاتێ کەڵەشێر ئەخوێنێ
دروودێک ئەنێرم.
داخی داخان! تێکۆشان کۆتایی هات.
ئێستا کاتی ژیانە.
ڕێگا، گیان و جەستەی بردم و
بە مەبەستی نەگەیاندم
ئەی وەرزەکان، ئەی کۆشکەکان!
لە دوا ڕۆژی ژینی من دا
هێشتا هەتاو تیشک ئەهاوێ،
داخی داخان!
ئەی وەرزەکان، ئەی کۆشکەکان!

تەواو بوو.
ئێستا ئەتوانم جوانی ستایش بکەم.

پەراوێز:

١) سرودی دەعوەت
٢) موژدەی ئاشتی مەسیح

***سەرچاوە:***
http://ketabeshear.com/Tazeh/moai.htm

زنجیرەی: - نـــۆبێـلیـســـــــــتەکان
{نوسەرانێك خەڵاتی نۆبێڵیان پێ بەخشرابێت}
یەکێتی سۆڤیەت {کۆن}، ئەلێکسەندەر سۆڵجێنیتسین Aleksandr Solzjenitsyn(١)
وەرگێڕانی: - دەزگای مەریوانی، بەهاری ٢٠١٢
بە سەرپەرشتی گۆران مەریوانی

# هـــەنـــاســــــــەدان

شەو سووکە نەرمە بارانێک باریبوو. سەرانسەری ئاسمان بەهەور داپۆشرابوو، ناو بەناویش پرپیشکی چەند دەنکە بارانێک دەهات.

ئەمن لەژێر درەختی سێوێکدا کە سەرتاپای خەریکە لە گوڵە سێو هەڵدەکێشرێت وێستاوم و هەناسە دەدەم.

نەک تەنیا درەختی سێوەکە بەڵکو گژوگیای ئەو دەور و پشتەش بۆن و بەرامی هەڵمی پاش بارانی لێ بەرزدەبۆوە، بەجۆرێک ئیتر ناوێک نییە بۆ ئەم بۆنە خۆشە لەبەردڵانەی هەوا پڕ دەکات لە خۆی. ئەمن سیەکانم پڕ دەکەم لێیان، هەست بە بۆنی عەترداری ئەو دەکەم لە سینەمدا، هەناسە دەدەم، هەناسەدەدەم، گاهێک بە چاوی کراوەوە و گاهێک بە قوچاوە و، نازانم چ گاهێکیان باشترە.

ئەمە تەنیا ئازادیەکە، تەنیا ئازادیەک و گرانترین جۆریشیان، کە زیندان ئێمەی لێ بێ بەشکردوە، تا



ئەلێکسەندەر سۆلژینیتسین

بەم شێوەیە هەناسە بدەیت، ئالێرەدا هەناسە بدەیت، هیچ خۆراکێکی زەمین نییە، هیچ شەرابێک نییە، تەنانەت ماچی کچانیش هێند دڵپەسەند نییە وەک ئەم هەوایە، کە لێوان لێوە لە بۆی گوڵان، تەڕوپەڕی و فرێشی.

ئیتر کارێکم بەوەوە نییە، ئەمە تەنیا بەزمی باخچەیەکی گچکەی قوربەسەرە، کە ترنجاوەتە نێوان پێنج کولانە بینای بەرز.

ئیتر من گوێم لە دەنگی وڕ-وڕەی ماتۆڕەکان، خشە خشی رادیۆ-گرامەفۆنەکان و خرچە خرچی مایکرۆفۆنەکان نییە. جا تا مرۆڤ بتوانێت هەناسە دوای بارانێک لەژێر ئەم درەختی سێوەدا بدات، ژیان بە بەردەوامی هێندە دێنێت بێوچان بۆی بژیت.

پەراوێز: -

(١). لە کیلسۆڤۆدسک لە هەرێمی ستارڤرۆپۆل لە باشووری ڕووسیای تساردا هاتۆتە دونیاوە، ١٩١٩، بابی لە بەڵایەکدا ٦ مانگ پێش لە دایکبوونی، لە کاتی ڕاودا لە نێو دەچێت، دایکی بە نەداری بەخێوی دەکات، دەبێتە سەرباز لە لەشکری سوردا، بەشدارە لە هێرشکردنە سەر پۆڵەندا لە ٢ جەنگی جیهاندا، ١٩٤٥ -١٩٥٣ دەگیرێت کاتێک چەند دێرێکی نەشیاو لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی لەسەر رژێمی ستالین دەنووسێت. لە زیندانە تایبەتیەکانی ئەو سەردەمەدابەند دەکرێت. ١٩٧٠ خەڵاتی نۆبێلی پێدەبەخشرێت. ١٩٧٤ لە ژێر فشاری ڕۆژئاوادا رێدەدرێت کۆچبکات بۆ ئامریکا و تا ١٩٩٤ لە ڤێرمۆنت لە ئامریکا دەمێنێتەوە. ٢٠٠٨ لە تەمەنی ٨٩ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. لە ٧٠ -کاندا خوالێخۆشبوو د مارف خەزنەدار لە ڕۆژی کوردستاندا ئارتیکلێک دەربارەی س دەنوسێت

بەوەی کە بەکرێگیراوی ئامریکایە، نووسەر نییە و تەنیا لە بەر پڕوپاگاندە دژی بەرەی سۆسیالیزم خەڵاتیان کردوە (١٩٧٤- ١٩٧٥ ڕۆژی کوردستان). س نووسەرێکی دینداری کۆنپارێزە، فرەگەلێک لە کتێبەکانی لە بلۆکێک بچکۆلەتر نین. خوێندنەوەیان گەلێک سەختە. س هەمیشە هەوڵدەدات نەرێت و ڕەسمی نووسەرە کلاسیکیەکانی ڕووسیا بپارزێت. بە گەڕانەوەی بۆ ڕووسیا خەریکی پڕوپاگاندەی ئاین و خەوبینینە بە سیستەمێک کە لە سیستەمی تسارەوە نزیکە. بەڵام بەدەگمەن نووسەرانێک هەن کە بتوانن وەک س شاکارێکی نەمر لەسەر زیندان بنوسن وەک ڕۆمانی (ڕۆژێک لە ژیانی دنیسۆڤیتسیچ). ستیگ فرێدریکسۆن Fredriksson Stig، کە یەکێکە لە ڕۆژنامەوانە بەناوبانگەکانی ڕادیۆ وتەلەفزیۆنی سویدە هاوکات زمانزانێکی باشی ڕووسیە، لە هەفتاکاندا کاتێک لە ڕووسیا پەیامنێر بووە، تەتەری س بووە و نامە نهێنیەکانی س گوازتۆتەوە. فرێدریکسۆن و س لە پڕۆگرامێکی تایبەتدا، کە دیدارێکی نێوان هەردوکیانە لە تەلەفزیونی سویدی ساڵی ٢٠٠٨ پێش مردنی س بە ماوەیەکی کورت، باس، لەوانە، لە چالاکیەکانی ئەو سەردەمە دەکەن، بریا ئەم پڕۆگرامە دەکراو نەتەوە جێنشینەکانی کوردستانیش دەیانبینی، فرێدریکسۆن کتێبێکیشی دەربارەی دۆستایەتی خۆیی س نووسیوە. فرێدریکسۆن ئێستا پەیامبێرە لە ئەمەریکا. گ. مەریوانی

زنجیرەی: - نـۆبێـلیـســـــــتەکان
{نوسەرانێك كە خەڵاتی نۆبێڵیان پێ بەخشراوە}
ئەمەریکا: ئێرنێست هەمێنگوای Ernest Hemingway (١)
وەرگێڕانی لە : دەزگای مەریوانی، بەهاری ٢٠١٢
بە سەرپەرشتی گۆران مەریوانی

## پەپولەیەك و تانكێك

لە بیرۆی سانسورەوە بەرەو ماڵ دەچوومەوە، بۆ هۆتێل فلۆریدا و باران دەباری. کە گەیشتمە نیوەی رێگا لەباران بێزاربوم و خۆمکرد بە چیکۆتێ-دا تا پێکێکی سەرپێی هەڵدەم. زستانی دووەمی گەمارۆدانی مەدرید بوو، هەموو شتێک ڕوو لە کەمبوون بوو، تەنانەت توتن و زەوقی خەڵکیش، مەردمگەل هەمیشە کەمێک برسی بوون-و مرۆڤ لە ناکاوداو بەبێ هۆ بەلەسە دەبوو لە هەندێک شت کە نەیدەتوانی هیچیان بەرامبەر بکات. لە رۆیشتنمدا بەرەو ماڵ کە پێنج کۆڵانێکی مابوو دەبوو بـەردەوام بومایە، بەڵام کە دەروازەی چیکۆتێم بینی هەستمکرد حەزم لە پێکێکی خێرایە پێش ئەوەی بەهەنگاو ئەو پێنج کۆڵانە بە درێژایی گران ڤیێ، بە نێو قورو لیتاو-و پارچە بەردو زیخی دوای هاوەنبارانە تەی بکەم.

بەرنەدەکەوت، پڕبوو لە خەڵک. لە بارەکە نەدەکرا نزیک بکەویتەوە و گشت مێزەکان گیرابوون. پڕ بوو لە دوکەڵ و گۆرانی و کوڕگەلی یونیفۆڕم لەبەر و بۆنی پاڵتۆی چـەرم، و پێکەکان بەسەر دەستە و تاقمدا دەنێران بە قولایی سێ پیاو لەبەردەم دیسکی بارەکەوە.

گارسۆنێک کە دەمناسی کورسیەکی لە مێزێکی ترەوە بۆ هێنام لە تەنیشت کابرایەکی لاغری ڕەنگ پەڕیوی ئەڵمانی سێو ئادەم دەرپەڕیوەوە دانیشتم. من دەمزانی ئەو لە سانسور کاردەکات. لە قەد هەمان مێز دوو



ئێرنێست هەمینگوای

کەسی تر کە من نەمدەناسین دانیشتبوون. مێزەکە، کاتێک دێیتە ژوورەوە، لە ناوەڕاستی ژوورەکـەدا کەمێک بەلای ڕاستدا دانرابوو. پیاو لەبەر گۆرانی مەردم گوێی لەدەنگی خۆشی نەبوو منیش جینێک و ئانگوسترایەکم (٢) داواکرد و یەکجارە بە خۆشی بارانەوە هەڵمدا. بەڕاستی سیخناخ بوو لە خەڵک و هەمووش نەشئەداربوون، دەشێت زەڕرەیەک زیاد لە پێویست، خەتا لەو عارەقە کەتەلانکیەی تازە داهاتووە بوو کە زۆربـەی زۆریـان دەیانخواردەوە. چەند کەسێکی بەمن نەناسراو بە پشتی منیاندا کێشا و هەر لەو کاتەشدا کچی دانیشتووی سەر مێزەکەمان شتێکی بە من وت و منیش گوێم لێ نەبوو کچە چی وت و وەڵامم دایەوە "بەڵێ فەرموو".

ئەو ڕەنگی پێوە نەمابو-و ئیتر من وازم هێنا لەوەی ئێستا چاو بە دەورووپشتمی خۆمدا بگێڕم و لەجیاتی ئەوە چاوم بڕیە مێزەکەمان. وەحشەتناک بوو. بەڵام کە گارسۆنکە هات دەرکەوت ئەوەی ئەو داوای لێکردبووم پێکێک بوو. کوڕەکەی لەگەڵیدا بوو زۆر کەتەو بەهێز نەبوو بەڵام ئەم لە کەتەییدا بەشی هەردووکیانی دەکرد. ئەو، سەروسەکوتێکی نیمچە کلاسیکی زبری هەبوو؛ بە لەشیش لە یەکێک دەچوو شێرماڵی بکات و کوڕەکەی ئاوەڵیشی کە لە گەڵیدا بوو لەوە دەچوو هەق بوایە کەرەواتی قوتابخانەی ببەستایە. بەڵام نەیبەستبوو. ئەویش وەک تێکڕای هەمومان پاڵتۆی چەرمی لەبەردابوو. بەڵام پاڵتۆ چەرمەکەی ئەو تەڕ نەبوو چونکە ئـەوان هەر لە زووەوە پێش ئەوەی باران دەست بەبارین بکات هەر لەوێ دانیشبوون. کچەش پاڵتۆی چەرمی لەبەردابوو بەڵام تا بڵێی لە شێوە و فەساڵی دەموچاوی دەهات.

ئیتر ئەو کاتە هیوای ئـەوەم دەخواست کە دەبـوایـە سـەرم بە چیکۆتێدا نەکردایە و بەڵکو ڕاستەوخۆ ڕێگەی ماڵم بگرتایە و لەوێ دەمتوانی جلکەکانم بگۆڕم و وشکببمەوە و هەردوو لاقم بخەمە سەر چەرپاکەم و ئارام و لەسەرخۆ پێکێک سازبکەم، بێزاریش بووم لەوەی ئەم جووتە گەنجانە ببینم. ژیان زۆر کورتە و ژنانی ناشرینیش تا بڵێی زۆر درێژن و ساتەوەختێک لەسەر مێزەکە دانیشتبووم گەیشتمە قەناعەتێک کە تەنانەت گەر من بێت و نووسەر بم و بێسنور فەزوڵی بم بەرامبەر گشت جۆرە مرۆڤێک کەچی بەهیچجۆرێک لە ڕاستیدا لام گرینگ نەبوو بزانم داخۆ ئەم جووتە ژن و مێردن یان ئاخر چیان لای یەک بەدیکردوە یان چیتریان لە خۆیاندا دۆزیوەتەوە. گەیشتمە ئەنجامگیریەک ئەویش ئەوەیە کە ئەم جووتە هەبێت و نەبێت دەبێت پێکەوە لە

ڕادیۆ کاربکەن. هەموو جارێک کە کەسێکی سیڤیلی سەیروسەمەرەت لە مەدرید ببینایە ئیتر ئەوە حەتمەن لە ڕادیۆ بوون. تەنیا بۆ ئەوەی شتێک بڵێم دەنگم بەسەر لارمەکەدا بەرزکردەوە و پرسیم: "ئێوە لە ڕادیۆن؟"

"باشت پێکا، خۆیەتی"، کچەکە وتی. ئەوە بەزمەشمان زانی. لە ڕادیۆن.

"کاروبارت چۆنە، هاوڕێ؟" بە ئەڵمانیەکەم وت.

"باشە. ئەی تۆ خۆت چۆنی."

"تەڕم؟" پێموت و ئەویش پێکەنی بەسەرێکی لارەوە.

"جگەرەیەکت پییە؟" پرسیاریکرد.

ئـەوەی پێم مابوو دوو پاکەت بـوو، پاکەتی پێش دوا پاکەتم بۆ درێژکرد و ئەویش دوو جگەرەی لێدەرهێنا. کچە کەتەکەش دووانی دەرهێنا و ئەو کوڕە لاوەش بە ڕوخسارئاسای کەرەواتی قوتابخانەوە دانەیەکی دەرهێنا.

"دانەیەکی تریش هەڵگرە"، هاوارمکرد.

"نا، سوپاس"، وەڵامیدایەوە ئەڵمانیەکە لە جیاتی دانەیەکی ڕاکێشا.

"خۆ پێت ناخۆش نییە؟" بەزەردەخەنەیەکەوە وتی.

"بە هیچجۆرێک"، وتم. بەڵام لەڕاستیدا زۆر لام ئەغز بوو، ئەویش تێگەیشت.

بەڵام ئەو ئەوەندە سوێی بۆ جگەرە ببووەوە بەلایەوە هیچ گرینگ نەبوو. قەیرێک دەنگ و بەزمی گۆرانیوتن هێور بووەوە یان با چۆن لە گەرمەی باوبۆراندا بۆ تاوێک ئارامدەگرێت ئیتر هەمومان گوێمان لە دەنگی یەکترە چی دەڵێین.

"لە مێژە ئێوە لێرەن؟" کچە کەتەکە لێی پرسیم.

"ئاوها دێم و دەڕۆم"، من وتم.

"دەبێت گفتوگۆیەکی جیدی بکەین"، ئەڵمانیەکە وتی. "دەبێت گفتوگۆیەکت لەگەڵدا بکەم. دەکرێت کاتێک دابنێین؟"

"من تەلەفونت بۆدەکەم"، پێموت.

ئەم ئەڵمانیە لەڕاستیدا ئەڵمانیەکی گەلێک سەیرە و هیچکام لە ئەڵمانیە باشەکانیش حەزیان لە چارەی نەبوو. ئەو لە بۆچوونێکی درۆزنانەدا دەژیا بەوەی دەیتوانی پیانۆ لێبدات، بەڵام ئەگەر لە پیانۆ دوورت بخستایەتەوە کاروباری خۆی زۆر باش دەبرد بەڕێوە تا بە عارەق یان بە دەرفەتێکی زەموزەمکاری ڕەخساندن فریوت نەدایە، بەڵام هیچکەسێک تا ئێستا نەیتوانی بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان بەیەکەوە لەم جووتە فریودانە بەدووری بگرێت.

خۆشترین شت لای زەمکردن بوو، ئەو هەمیشە شتێکی تازەی پێبوو بەتایبەتی لەبواری داشۆرینی ناسیاوێکتدا، جا ئیتر لە مـەدریـد، ڤالێنسیا، بەرشەلۆنە، یان لە سەنتەرە سیاسیەکانی تردا بێت تا لەبەرچاوتی بخات.

هەر ئالەو کاتەدا بوو دیسانەوە گۆرانی و بەزم دەستیپیکردەوە مرۆڤیش بۆی ناکرێت زەمبکات و بقیژێنێت جا هەر بۆیە لـەوە دەچـوو چیکۆتێ دوانێوەڕۆیەکی ناخۆشی لێدەرچێت منیش بڕیارمدا هەر کە ڕیزێکی تر مەیان گێڕاو پێکێکی ترم هەڵدا ئیتر ئەوێ بەجێبێڵم.

ئـا، ئیتر ئا لـەو ساتەوەختەدا بـوو قەوما. کابرایەکی سیڤیل لە قاتێکی قاوەیی، کراسێکی سپی، کەرەواتێکی ڕەشدا، تەوێڵێکی بەرز و قژێکی خاوی بۆ دواوە هەڵدراو، لەم مێز دەچوو بۆ ئەو مێز و بە دەمانچەیەکی ئاو ئاوڕشێنی یەکێک لە گارسۆنەکانی دەکرد. چی تیا بوو پێدەکەنین بێجگە لە گارسۆنەکە خۆی کە لەو ساتەدا سینیەکی پڕ لە پێکی هەڵگرتبوو. ئەو توڕەبوو.

"Nio hay derecho" ، وتی. یانی : "مافی

ئەوەت نییە ئاوا بکەیت(٣)"، ئەمە ساکارترین و قورسترین پرۆتێستە لە ئیسپانیدا بووترێت.

کابرای دەمانچە-ئاو-بەدەست لە خۆشیدا شاگەشکە بوو بەوەی چۆن کارێکی ئەنجامداوە و بە هیچجۆرێک لەوە نەدەچوو ئەوە لێکبداتەوە ئاخر ئەم وڵاتە ئەوە لەساڵی دووەمینی جەنگیدایە، ئەو لە شارێکی گەمارۆدراودایە، کە سەرلەبەری دانیشتوانی لە ژێر فشاردا دەژین و ئینجا تەنیا سێ کەسی سیڤیلیش لە لۆکاڵەکەدان. هەر لەبەر ئەوە جارێکی تریش ئاوڕشێنی گارسۆنێکی تری کرد.

ئەمن گەڕام بە شوێن جێیەکدا خۆمی تیا بشارمەوە. ئەم گارسۆنەش تووڕە ببوو و کابرای دەمانچە ئاو بەدەستیش دووجاری تر دلێرانە ئاو بارانیکرد. هەندێک تا ئەم ساتەوەختە بە قەشمەری تێدەگەیشتن، لەوانە کچە کەتەکە. بەڵام گارسۆنەکە هەڵوێستەیەکی لەویادا بۆکرد و سەری بادا. لێوەکانی دەلەرزین. پیرەمێردێک بوو، هێندەی من ئاگادارابم دەساڵ بوو لە چیکۆتێ کاری دەکرد.

"Nio hay derecho" (٣)، ئەمجارە بە ویقارەوە وتی.

"بەڵام خەڵک پێدەکەنین و کابرای دەمانچە ئاو بەدەستیش ئاگای لێ نەبوو کە گۆرانیەکە خەریکە بەرەو تەواو بوون دەڕوا و ئاوبارانی مل و گەردنی گارسۆنێکی تری کرد. گارسۆنیش بە سینی دەستییەوە ئاوڕی لێدایەوەو.

"Nio hay derecho" (٣)، وت.

ئەمجارە ناڕەزایی و پرۆتێست نەبوو. تۆمەتبارکردن بوو، من چاوم لێبوو سێ پیاوی یۆنیفۆڕم لەبەر لە مێزێکەوە هەستان و خۆیان دابەسەر کابرای دەمانچە ئاو بەدەستداو ڕاستەخۆ هەر چواریان دوای ئەوە لە نیوە دەرگای کراوەی بارەکەوە چوونە دەرێ و دەنگی مشتەکۆڵەیەک هات کە یەکێک کێشای بە دەمولەوسی کابرای دەمانچەی ئاو بەدەستدا. یەکێکی تر دەستی دایە دەمانچەی ئاوەکە و بە دوایدا لە دەرگای دەرەوە توڕی دایە دەرێ.

سێ پیاوەکە هاتنەوە ژوورێ، جیدیانە، شەقاوانە و زۆر توڕەش. نەخێر دەرگاش گڕی خوارد و کابرای دەمانچە ئاو بەدەستی لێوە هاتەوە ژوورێ. قژی بەسەر لاگوێیدا هاتبووە خوارێ، دەمووچاوی خوێناوی بوو، کەرەواتەکەی لار ببوەوە، و کراسیش شێواو دڕاو. دەمانچە ئاوەکەی جارێکی تر بەدەستەوە بوو، ڕەنگ پەڕیو و نیگای کێویانە، خۆی ترنجانە ژوورێ، ئینجا دەستی بە پەلە پیتکەدا ناو سەڵیەیەک ئاوی درێژیی تەحەدایانەی بەسەر میوانەکاندا کرد.

بینیم یەکێک لەو سێ پیاوە بەرەو ڕووی چوو و دەموچاویم جوان بینی. ئەمجارە چەند پیاوێکی تری لە گەڵدا بوو، کابرای دەمانچە ئاو بەدەستیان ناچارکرد بکشێتەوە بۆ دواوە بۆ نێوان دوو مێز کە کەوتبوونە لای چەپی لۆکاڵەکە گەر لە دەرگای دەرەوە حیسابی بکەیت، کابرای دەمانچە ئاو بەدەست بەرگریەکی بە هێزی کرد، لەو بەینەدا زرمەی فیشەکێک هات منیش پرمکرد بە قۆڵی کچە کەتەکدا و خۆمان بەرەو ژووی دەرگای ئاشپەزخانە لە کەمینکرد.

دەرگای ئاشپەزخانە گەڵە بوو، شانم لێگیرکرد جووڵەی نەکرد.

"خۆت بدە بەدەمدا لە پشت ئەو گۆشەیەی بەردەم دیسکی بارەکەدا،" پێموت. ئەو بە چۆکدا هات.

"بە دەمدا،" وتم و بەدەستم فشارم لەسەری کرد بەرەو خوار. ئەو دەهری بوو.

چی لە ژوورەوە بوو، بێجگە لە ئەڵمانیەکە کە خۆیدابوو بە ئەرزدا لە پشت مێزێکەوەو، کوڕەکەشی

که به خوێندکاری خانەی خوێندکاران دەچوو خۆی ترنجاندبووە گۆشەیەکەوە و پاڵی دابوو بە دیوارێکەوە، ئەو باقی دەمانچەیان دەرهێنابوو. سێ کچی قژ رەنگکردو بە ئاڵتوونی کە رەگی مووەکانیان لەژێرەوە رەشی دەکردەوە لەسەر قەنەفەیەکی کەنار دیوارەکە لەسەر نووکی پێ وەستابوون تا بەرچاویان جوانتر دیاربێت و پێکەوە بێوچان دەیانقیژاند.

"من ناترسم" کچە کەتەک وتی "ئەمە قەشمەریە."

"ئێوە ناتانەوێت لە شەڕی بارێکدا بە کوشت بچن" من وتم. "ئەگەر ئەو پادشای ئاوڕشێنە چەند هاوڕێیەکی لێرە هەبێت دەقەومێت."

بەڵام ئاشکرا دیار بوو کابرا هیچ هاوڕێیەکی لێرە نەبوو چونکە خەڵکی دەمانچەکانیان خستەوە بەر باخەڵیان و یەکێکیش کچە بلۆندە (٤) قیژەکەرەکانیان داگرت و هەرچیش خۆی کوتابووە پێشێ کاتێک زرمەی تەقەکە هات، لە کابرای دەمانچە ئاو بەدەست دوور کەوتنەوە کە بێجوڵە لەسەر گازی پشت لەسەر تەختی ئەرزەکە کەوتبوو.

"کەس بۆی نییە هۆڵەکە بە جێبێڵێت پێش ئەوەی پۆلیس بگات"، یەکێک لە دەرگاکەوە هاواری کرد.

دوو پۆلیسی تفەنگ بەدەست لە شەقامەکەوە خۆیان کرد بەژووردا و دەمی دەریانگرت هەر لەو کاتەشدا کە قەدەخەکردنی چوونە دەرەوە ڕاگەیەندرا بینیم شەش کەس خۆیان جیاکردەوە، ریز-سەفیان وەک فۆتبۆلزانی ئەمەریکی بەست و لە دەرگەوە بە کۆمەڵ چوونەدەرێ.

سیان لەوان، ئەوانە بوون کە پادشای ئاوڕشێنیان فڕێدایە دەرێ. یەکێکیان ئەوە بوو کە تەقەی لێکرد. هەر یەکسەر شانیان پیاکرد بە ناو پۆلیسە چەکدارەکاندا بێ ئەوەی مەترسی پەلاماردان و گرتنیان هەبێت. ئیتر کە ئەوان خۆیان کردە دەرێ یەکێک لە پۆلیسەکان بە تفەنگەکەی ڕاستەوچەپ دەری دەرگای گرت و هاواریکرد: "هیچ کەس بۆی نییە لۆکاڵەکە بەجێبێڵێت. هیچ کەسێک."

"ئەی لەبەرچی ئەوانە هەڵاتن؟ بۆچی ئێمە ڕادەگیرێین کەچی ڕێدەدرێت ئەوانە تێی تەقێنن؟"

" ئەوانە میکانیکین و دەبێت بگەڕێنەوە فرۆکەخانە"، یەکێک ئەم جاڕنامەیەی ئاشکراکرد.

"بەڵام هەر کە یەکێک ملی ڕێیگرت و دەرباز بوو ئیتر هیچ پاساوێک نامێنێتەوە تا ئەوانی تر ڕابگیرێن."

"دەبێ هەموو چاوەڕێی لا سێگوێریداد (٥)la Seguridad بن . هەموو شتێک دەبێت بە پێی یاسا و نیزام بچێت بەڕێوە."

"ئەرێ تۆ تێناگەیت، ئەگەر هەندێ کەس هەر زوو خۆیان دزیبێتەوە ئیتر ڕاگرتنی ئەوانی تر گەمژەییە ؟"

"هیچ کەس بۆی نییە لۆکاڵەکە بەجێ بێڵێت. دەبێت هەموو چاوەڕێبکەن."

"گاڵتەبازارە"، بە کچە کەتەکەم وت.

"نەخێر. وەحشەتناکە."

ئیتر ئێمە بە پاوە وێستاین و کچەکەش بە تووڕەییەوە لەو جێگایەی دەڕوانی کە پادشای ئاوڕشێنی لێکەوتبوو. قۆڵی بە هەردوو لادا بڵاوببۆوە و لاقێکیشی هەڵکشابووە سەرێ.

"من دەمەوێت بچمە ئا ئەویانە و یارمەتی ئەو پیاوە نەگبەتە بدەم، بۆچی کەس یارمەتی نادات یان شتێکی بۆ ناکات؟"

"هەقت نەبێت بەسەریەوە باشترین شتە"، من وتم. "تۆ خۆت تێکەڵی ئەمکارە مەکە."

"بەڵام بە گشت ساکاریەکەوە ئەمە کارێکی زۆر نامرۆڤانەیە. من سەرم لە کاروباری تەندروستی دەردەچێت و نیازمە یەکەم فریاگوزاری بدەمێ."

"نەخێر" وتم. "نزیکی مەکەوە."

"ئاخر بۆچی نابێت؟" کچە زۆر تورەبوو تەنانەت هێستێریا گرتبووی.

"چونکە مردوە"، وتم.

کە پۆلیس هات ئێمە هەموومانیان بۆ ماوەی سێ سەعات ڕاگرت. پۆلیسەکان دەستیانکرد بە بۆنکردن بە گشت دەمانچەیەکەوە. گوایە دەکرێت بەوشێوەیە بیدۆزنەوە کێ بەمدواییە ئاخرجار تەقەی کردوە. لـەوە دەچـوو دوای چـوار دەمانچە حەوسەڵەیان نەمابێت، جا بەو بۆنەیەشەوە بۆنی پاڵتۆی چەرم تەنیا بۆنێک بوو کە مرۆڤ هەستی پێدەکرد. دوایی لەتەنیشت مێزێکەوە دانیشتن و سەیری کاغەز و وەرەقــەی خەڵکیان دەکـرد. مێزەکە ڕاستەوخۆ کەوتبووە پشت ڕەحمەتی پادشای ئاوڕشێن کە لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو لە پەیکەرێکی خاکرەنگی مێویی خودی خۆی دەچـوو بەدەستی خاکرەنگی مێوەوە و سەروسیمایەکی خاکی باوەوە.

ئێستا کە کراسەکەی لە پانتۆڵەکەی ترازا بوو جوان دەبینرا فانیلەی ژێرەوەی لەبەردا نەبوو، هەروەها بنی پێڵاوەکانیشی ئەمدیوئەودیو کوناودەربوون.. مـرۆڤ دەبـوایـە هەنگاوی بـەسـەردا هەڵبهێنایە تا بگەیشتایەتە لای ئەو مێزەی کە دوو پۆلیسە سیڤیللەبەرەکەی لێ دانیشتبوون و لە ناسنامەی ئەو حەشامەتە ورد دەبوونەوە. مێردی ڕەسەنی کچە کەتەکە تەنیا لەبەر نێڤرۆسیتێت چەند جارێک ناسنامە و کاغەزەکانی لێ ونبوو دوایی دۆزیەوە. پەساپۆرتێکی لە شوێنێکدا هەڵگرتبوو بەڵام دیاربوو بەهەڵە خستبوویە یەکێک لە گیرفانەکانی ئینجا عارەقی ڕەش و سپی دەردەدا، بەدوایدا دەگەڕا تا دۆزیەوە. ئەوجا خستیە گیرفانێکێکی تریەوە و دەبوو هەمدیسان دەستبکات بەگەڕان بەدوایدا. بەدرێژایی کات چین چین عارەقی دەڕشت و قژی گەلێک لوول ببوو، ڕوخساریشی سوور هەڵگەڕاو. ئێستا لەوە نەدەچوو تەنیا کەرەواتێکی قوتابخانەی نوقسان بێت بەڵکو پێویستی بە کلێتەیەکی ئالەوانەی منداڵانی پۆلەکانی سەرەتایی پێوەی دەڕۆن بوو. بیستومانە هەندێک کارەسات خەڵکی پیردەکات. بەڵام ئەم کارەساتی تەقەیە ئەوی نزیکەی دە ساڵێک جەهێڵ کردەوە.

کە وەستابووین و چاوەڕێمان دەکرد بەو کچە کەتەیەم وت کە ئەمە بەڕاستی چیرۆکێکی چاکە و دەستدەدات بۆ نووسین، من بەنیازم ڕۆژێک لە ڕۆژان بینوسم. لەو شێوەیەدا کە شەش کەس یەککرپز یەکیانگرت و هەڵیانکوتایە سەر دەرگاکە بەڕاستی مرۆڤی سەرسام دەکرد. کچە شۆکگرتی و وتی نابێت ئەم بەسەرهاتە بنوسیت چونکە نوسینەوەی بە زیان دەگەڕێتەوە بۆ کەیسی کۆماری، {رێپۆبلیکی}، ئیسپانیا. منیش وتم، کە من دەمێکە لە ئیسپانیام و پێشتر لە سەردەمی پادشایەتیدا لە کوشتن و برین لەدەوروپشتی ڤالێنسیادا دەست نەپارێزراوە و خەڵکیش بە سـەدان ساڵە پێش رێپەبلیکیش یەکتریان لەتوپەت کـردوە بە چەقۆی بایلی، کە پێی دەگوترا نەڤایەسnavajas (٦)، لە باشوور لە ئەندەلوسیادا و ئینجا ئەگەر لاتوپوتێک ئێستا لەگەرمەی جەنگدا و لە چیکۆتێدا تەقەی لێبکرێت دەتوانم بەئارەزوی دڵی خۆم لەسەری بنوسم وەک ئەوەی لە نیۆرک، شیکاغۆ، کای وێست یان مارسێلێ ڕوویدابێت. بە باش و خراپ هەقی بەسەر سیاسەتەوە نییە. کچە وتی هەق نییە من ئەم پێشهاتە بنوسم. ئەڵبەتە ڕەنگە ئەلهەق فرەگەلێکی تریش وابڵێن. بەڵام بە بۆچوونی ئەڵمانیەکە چیرۆکێکی تا بڵێی نایاب بوو، منیش دوا کەمێڵی Camel(٧) خۆمم دایە. بەهەرحاڵ دواجار، دوای نزیکەی سێ سەعات، پۆلیسەکان وتیان فەرموو، دەکرێ مەرەخەسبن.

له فلۆریدا کەمێک نیگەرانی من بوون. چونکە پیاو ئەگەر لە گەرمەی تۆپبارااندا بەرەو ماڵ بۆوە بە پێ و سەعات حەوتونیو دوای ئەوەی دەری بارەکان دەبەسترێت نەگاتەوە ماڵ ئیتر خەڵکی نیگەران دەبن بۆی. من زۆرم پێخۆش بوو گەیشتمەوە ماڵ و کە خەریکی شێو لێنان بووین لەسەر هیتەرێکی گچکە بەسەرهاتەکەم گێڕایەوە و بەسەرهاتەکە جێی خۆشحاڵیەکی گەورە بوو.

بە هەر حاڵ بۆ شەو باران خۆشیکردەوە و سبەی سەر لەبەیانی ڕۆژێکی خۆشی، سایەقەی، ساردی سەرەتای زستان بوو- چارەکی بووێ بۆ یەک خۆم کێشا بە دوودەروازە کورتەکەی چیکۆتێدا تا جین و تۆنیکێک پێش قاوڵتی هەڵدەم. ئەم کاتانە خەڵکێکی زۆر کەمی لێبوو، دوو گارسۆن و چێفی ریستۆڕانگەکە هاتنە لام، لای مێزەکەم. هەر سێکیان پێکەنین.

"ئەرێ پیاوکوژیان دۆزیەوە؟" من پرسیم.

"بەم بەیانیە زووە سوحبەت مەکە"، چێفەکە وتی. "ئەو کەسەتان بینی کە تەقەیکرد؟"

"بەڵێ" وەڵامم دایەوە.

"منیش"، ئەو وتـی. " من لە گەڵ قەوما و گەیشتمە ئێرە." ئەو دەستی بۆ مێزی گۆشەیەک کێشا. "ئەو دەمانچەکەی ڕێک خستە سەر سینگی کابرا کاتێک زرمەی لێوە هەستاند."

"تاکەی خەڵکیان ڕاگرت؟"

" تا دوای دووی شەو. سەعات یـازدەی سەر لەبەیانیش هاتن و ئێل فیەمبرێیەکیان (٨) برد el fiambre .

ئەو، ئەو زارەوە میللیە ئیسپانیەی بۆ لاشەکەی بەکارهێنا، هەمان زاراوە کە لەسەر مێنیوەکە () {لیستی خۆراک-وەرگێڕ} بۆ گۆشتی کاڵبراو نوسراوە.

"بەڵام ئێوە تا ئێستا شتێک لەوبارەیەوە نازانن"، چێفەکە وتی.

"نەخێر. وایـە، ئـەو نـازانـێـت"، یەکێک لە گارسۆنەکان وتی.

"ئەمە تا بڵێی ڕووداوێکی سەیرە و ناجۆرە"، گارسۆنەکەی تریان وتی (٩) Muy raro.

"هەروەها تراژیدیاشە، ها"، چێفەکە وتی. سەری بادا.

"با. تراژیادیا و سەیرە"، گارسۆنەکە وتی. "زۆر تراژیدیایە."

"باسیبکە،"

"بەسەرهاتێکی تابڵێی سەیرە"، چیفەکە وتی.

"باشە باسیبکە ئیتر."

چێفەکە بە سەروسیمایەکی پڕ نهێنیگرەوە خۆی بەسەر مێزەکەدا نوشتانەوە.

"لە دەمانچە ئاوەکەیدا"، ئەو وتـی. "ئۆدێ کۆڵۆنی کردبووە ناوی. پیاوی نەگبەت."

"ڕاستت دەوێت، نوکتەیەکی هێند نەشیاویش نییە"، گارسۆنەکە وتی.

"سووکوباریک ئەو بە نەشئەو زەوق بوو. دەبوو کەس پێی پەست نەبوایە"، چێفەکە وتی. "پیاوی نەگبەت."

"ئەها"، من وتم. "ئەو دەیویست گشتمان بەزەوق و کەیف بین."

"وایە، خۆیەتی"، چێفەکە وتی. لە ڕاستیدا، تەنیا ئاکامی نەگبەتی و بەڵای لە یەکتر تێنەگەیشتن بوو."

"ئەی دەمانچەی ئاوەکە چی لێهات؟"

"پۆلیس بردی. ناردویانەتەوە بۆ ماڵیان، بۆ خێزانەکەی."

" بە دڵنیاییەوە شاد و بەختەوەر دەبن بە وەرگرتنی"، من وتم.

"بەڵێ"، چێفەکە وتی. "حەتمەن وایە. هەمیشە باشە دەمانچەیەکی ئاوت هەبێت."

"ئەرێ باشە ئەو کێ بوو؟"

"دارتاشی مۆبیلیات."

"خێزاندار؟"

"بەڵێ. ژنەکەی سەرلەبەیانی بەدەمانچەکەوە لێرە بوو."

"چی وت؟"

"خانم بە چۆکدا لە تەنیشتیەوە کەوت وتی: 'پێدرۆ، چیان لێکردوی، پێدرۆ؟ کێ ئاوای لێکردویت؟ ئۆی، پێدرۆ.'"

"ئیتر دەبوو زوو بەزوویی پۆلیس ئەو دوورخەنەوە لێرە چونکە نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵبێت"، گارسۆنەکە وتی.

"لە پووشکە دەچوو، سینگ نەخۆش و لاغر"، چێفەکە وتی. "ڕۆژانی یەکەمی شەڕ ئەو تیادا بەشداربوو، لە بەرەی حوکومەتدا بوو. دەڵێن لەو شاخوداخە دەجەنگا بەڵام سینگی سەرما لێی دابوو* بۆیە نەکرا بەردەوامبێت."

"ئینجا بە کورتی و ساکاری دوێنێ تەنیا بۆ ئەوەی کەمێک بای باڵی خۆی بدات دوای نیوەڕۆ دابەزیە ناو شار"، من ئەو ڕستەیەم دەرپەڕاند.

"نەخێر"، چێفەکە وتی. "شتێکی تابڵێی سەیرە، دەبینن. سەرلەبەری Muy raro (٩) من ئەمانەم گشتی لە پۆلیس بیستووە کە بەڕاستی بەکارن ئەگەر وەخت شک بەرن. پۆلیس گفتی هاوڕێکانی لەو کارگەیەی کە ئەو لێی کاردەکات وەرگرتوە. کارگەکەیان لەڕێی کارتی سەندیکاکەیەوە دۆزیەوە کە لە گیرفانیدا بوو. دوێنێکە دەمانچە ئاوەکە و ئۆدۆ کۆڵۆڵۆنی کڕیبوو تا پێی بێ و بەزم و ڕەزمی پێ بنێتەوە لە شاییەکدا. ئەو خۆی لەوبارەیەوە دوابوو. ئەو، ئەو شتانەی لە دوکانێک هەر لەوبەری شەقامەکەوە کڕیبوو. ئیتیکێتێک لەسەر شووشەی ئۆدۆکۆڵۆنەکە بوو کە ئادرەسی دوکاندارەکەی پێوە بوو. شوشەکەی لە تەوالێتەکەدا بەجێهێشتبوو. هەر لەوێش دەمانچە ئاوەکەی پڕکردبوو. لەوەدەچێت هەر کە شتەکانی کڕیوە پەڕیوەتە ئەمبەرەوە بۆ ئێرە چونکە تەواو ئەو کاتەبوو باران دایکرد.."

"من بیرمە کە هاتە ژوورەوە"، یەکێک لە گارسۆنەکان وتی.

"ئیتر بە شادی و زرموهوڕ و گۆرانی ئێرەشەوە ئەویش خۆشحاڵ بوو."

"بەڵێ، شایەد ئەو بەختیار بوو"، من وتم. "ڕاستیتان ئەوێت، خولی ئەخوارد، هەر ئەمسەرو ئەوسەری بوو."

"چێفەکە بە لۆژیکی بێڕەحمانەی ئیسپانی خۆی بەردەوام دەیپرست.

"ئەوە لەوجۆرە شادی و خۆشحاڵیەیە کە کەسێک بە سنگێکی داڕزاوی سەرماوە* دەخواتەوە"، ئەو وتی.

"من زۆر کەیفم بەم چیرۆکە نایەت"، من وتم.

"بەڵام تۆ بیری لێبکەرەوە"، چێفەکە وتی. "ئەوەندە سەیرە. شاد و بەختیاری ئەو لەگەڵ جدیاتی جەنگدا پەیوەندگیر دەبن وەک پەپولەیەک........"

"بەڵی، تەواو وەک پەپولەیەک"، من وتم. "کتومت هەروەک پەپولەیەک."

"من سوحبەت ناکەم"، چێفەکە وتی. "تێدەگەن؟ وەک پەپولەیەک و تانکێک."

گەلێک کەیفی بەمە دەهات. ئیتر چووە سەر میتافیزیکی ڕەسەنی ئیسپانی.

"ڕێمبدە داوەتی پێکێکت بکەم"، ئەو وتی. "دەبێت چیرۆکێک دەربارەی ئەمە بنوسیت."

من کابرای دەمانچە ئاو بەدەستم بەو دەستە مێو-خاکرەنگی و سەروسیما مێو خاکباوەوە و، قۆڵە بڵاوبووەکانی و لاقە بەرز ڕاکێشراوەکەی لە ڕاستیدا بیری پەپولەیەکی دەخستمەوە. بەڵام زۆر نا. ئاخر ئەمیش خۆ زۆر لە مرۆڤ نەدەچوو. ئەم زیاتر بیری

پاساریەکی بێگیانی مردووی دەخستمەوە.

"جین و شوێپێس تۆنیکێکم دەوێت Schweppes tonic"، من وتم.

ئاخر دەبێت چیرۆکێک دەربارەی ئەمە بنوسن"، چێفەکە وتی. "نۆش. و بە هیوای خۆشبەختی."

"نۆش"، من وتم. "بەو بۆنەیەوە دوێنێ کچێک لێرە بوو وتی کە من هەق نییە لە بارەی ئەمکارەساتەوە هیچ بنوسم. نوسینی وا زۆر زیانبەخشە بۆ کەیسی ئیسپانیای رێپەبلیک."

"قسەی قۆڕ و بێمانا"، چێفەکە وتی. "ئەمە زۆر بایەخدار و گرینگە - شادی وخۆشحاڵیەکی بەهەڵە لێ حاڵی بوو دەنووسێت بە جیدیاتێکی مەرگئاساوە کە هەمیشە لێرە هەیە. بەش بەحاڵی خۆم ئەمە سەیرترین و گرینگترین شتێکە کە من لە مێژە نەمبینیوە. دەبێت دەربارەی بنوسن."

"ئۆڵ رایتAll right"، من وتم. "هیچ منداڵی هەیە؟"

"نەخێر"، ئەو وتی. "،من لە پۆلیسم پرسی. بەڵام دەبێت ئێوە دەربارەی ئەمە بنوسن و دەشبێت چیرۆکەکە ناوبنێن 'پەپولەیەک و تانکێک'."

"ئۆڵ رایتAll right"، من وتم. "بەڵام من زۆر حەزم لە ناوەکەی نییە."

"ناوەکەی تابلێی قەشەنگە"، چێفەکە وتی. "ئەمە ئەدەبیاتێکی هەڵبەستراو نییە."

"ئۆڵ رایتAll right"، من وتم. "ئێ باشە ئیتر ئەو ناوەی لیدەنێین. 'پەپولەیەک و تانکێک'."

بۆنی باران و هەوای پاک و ئەرزە شۆراوەکە دەهات و من لەگەڵ چێفەکەدا لەوێ دانیشتبووم کە هاوڕێییەکی دێرینم بوو، ئێستا گەلێک قایل بوو بەو ئەدەبەی کە بەیەکەوە خولقاندبومان و منیش قومێکم لە جین و تۆنیکەکە داو لە پەنجەرە بەردەم بە تورەکە خۆڵ هەڵچنراوەکەوە دەمڕوانیە دەرێ و بیرم لای ئەو ژنە بوو کە بە چۆکدا دادێت و دەڵێت: "پێدرۆ، ئاخر کێ وای لێ کردوی؟" و بیریشمکردەوە پۆلیس هەرگیز ناتوانێت ڕاستی ڕووداوەکە بەو بڵێت تەنانەت گەر ناوی کابرای تەقەکەریشیان لابێت.

***پەراوێزی . وەرگێڕ: -***

(٢). ئـانـگـوسـتـرايـەک: جـورێـک لـە تۆنیکی ئەوسەردەمەی ئیسپانیا

(٣). "Nio hay derecho": "مافی ئەوەت نییە ئاوا بکەیت" ، ئەم ڕستانە لەدەقە ئینگلیزیەکەدا بە ئیسپانی نوسراون.

(٤). بلۆند،blond , -ی ئینگلیزی، ئیسپانی blondo ژنی ئاروپایی، سوروسپی و قژ زێڕین، ئەڵبەتە لێرەدا مەبەستی

لەو خانمانەیە کە بە رەنگ قژیان بڵۆند دەکەن. پێم باشبوو هەر وشە لاتینیەکە بەکاربێنم.

(٥). گاردی ئاسایشla Seguridad

(٦). Navajas ، شەڕەچەقۆ، ئیسپانی.

(٧).Camel  جگەرەی مارکەی کامێڵی ئەمەریکی.

(٨). ئێل فیەمبرێ؛el fiambre :گۆشتی کاڵی توێ توێ بڕاو، کە لە ڕیستۆرانتا بەشێکە لە خواردنی کاڵ، لێرەدا

گوزارشە لە لاشە، ئیسپانی.

(٩) Muy raro : زۆر دەگمەنە، ئیسپانی

(*). زارەوەیـەکـی کۆنی ئینگلیزیە، breast colned بەرامبەر پست کلۆن-ی فارسی و colnado de mama ی ئیسپانی و الثدي المستنسخة — ی عەرەبی یانی هەوکردنی بۆریەکانی هەناسە، بە سەرما، سینگی سەرماگرتوو.

(١) ئێرنێست هەمێنگوای Ernest Hemingway: ئەڕنست میللەر هەمێنگوای، لە دایکبووی ٢١ جولای

له ١٨٩٩ Oah Park, Illionis و له ٢جولای ١٩٦١ له Ketchum, Idaho کۆچی دوایی کردوه. نووسەر و ڕۆژنامەنوسێکی ئەمەریکیه، یەکەم پەخشی له ١٩٢٥دا بوه، به ڕۆمانی "خۆریش ئاوابوونی خۆی هەیه"، خەڵاتی نۆبێڵی له ساڵی ١٩٥٤دا وەرگرتوه ، له ژیانیدا ٦ ڕۆمان و ٦ نۆڤێلکتێبی بڵاوکردۆته و دوای مردنیشی ٣ ڕۆمـان و ٤ نۆڤێلکتێب و ٣ فاکتەکتێبی بڵاوکراوەتەوه. حوسەین مەردانی عەرەب له شوێنێکدا دەڵێت؛ "که هەندێک نووسەر هەن هەرگیز نانوسن یان کەمبەرهەمن لێ ژیانی خۆیان جۆرێکه له نوسین، هەندێکیش دەنوسن". هەمینگوای له هەردوو جۆرەکەیه. ڕەزیله له وشه بەکارهێناندا و دەست به قەڵەمەکەیەوه دەگرێت، زیاتر به کەمباسی فیگەرەکانی؛ وێنایەکی متمانەکراوی خەسڵەت و ئاکاری ئەوان دەکێشێت. هەندێک له ڕۆمانەکانی ئەوڕۆکه کلاسیکن، خوێنەری کورد زیاتر ئاشنایه بەم نوسەره.

٤ جـاران هـاوسـەرگـیـریـکـردوه، باپیری ماریا هەمینگوای، ماگنۆس هەمینگوایه، باپیره گەورەی مۆدێل Dree دری هەمێنگوایه. ٣ منداڵی هەیه جاک، پاتریک و گریگۆری (دواتر ناوی گۆڕی بۆ گلۆریا). له سەردەمی جەنگی ناوخۆی ئیسپانیادا شۆفێری ئامبولانس و پەیامنێریش بووه، ڕۆمانی؛ "ماڵئاوایی له چەک" ئاکامی ئەم ئەزموونەیه، دوای یەکەم جەنگ خۆیی و خێزانی، له ١٩٢٢دا، پاریس دەکەنه نیشینگەیان، لەوێندەرێ پەیامنێری دەرەوه بووه و هامشۆیەکی، خۆیی و خزانی، بێسنوریان لەتەک هونەرمەند و ئەکتەرەکانی ئـەو دەمـەدا دەبێت، هەر لێرەوه یەکێکه له مۆدێرنیستەکان، ئەم یەکێکه لەوانەی زاراوەی نەوەیەکی ونبووthe lose generation دادەنێن. هەمێنگوای عاشقی دانیشتنی کافێتێریای پاریسی بوه و دەڵێن فرەگەلێکی نووسین و خوێندنەوەی لەم جێگایانەدا بەسەربردوه، فرەگەلێک له نووسینەکانی لەم ژینگانەدا لەدایکبوون وێرای ئەوەی که یەک دوو کتێبیشی لەسەر ئەمجۆره ژینگەیه هەیه. مرۆڤێکی وەرزشکاربووه، خەریکی بۆکس و ڕاوی نێچیری کێوی بووه، سەرچڵ، تەنانەت جارێک له فڕۆکه دوو ماتۆڕپارەکەیەوه، لەسەفەرێکی ئافریکادا بۆ ڕاوکردن، سەفاری، دەکەوێتەخوارەوه؛ ئاسەوارێکی وای تەندروستی بەجێدێڵێت لای که تا دوا ژیانی به دەست گرفتی ئەم کەوتنەوه دەناڵێت، یەکێکه لەو نووسەرانەی که نازیەکان هەر زوو له ١٩٣٣ دا له باڵی کتێب سووتاندا، bokbollen، کتێبەکانی دەسووتێنن و دواییش یاساخیدەکەن. هەمێنگوای عاشقی دوورگەکانی نزیک ئەمەریکا بووه و ماوەیەکیش له کوبا بووه، ڕۆمانی پیرەمێرد و دەریا بەشێکه لەو ئەزمونه، (شاعیر شێرکۆ بێکەس له عەرەبیەوه کردویه به کوردی؛ پاڵەوانی فیلمەکەش کاتێک دەکرێته فیلم ئەکتەری هۆلیودی بەڕەچەڵەک مەکسیکی ئانتۆنی کوینه)، نوسینێکی زۆر هەن دەربـارەی پیرەمێرد و دەریـا که چۆن و له کێ سەرگوزشتەکەی گوایێ بیستوه. ١٩٥٩ دەگەڕێتەوه بۆ ئەمەریکا، له ٢ی جولای ١٩٦١ له Ketchum, Idaho ، کاتێک له هەیوانەکەیان دانیشتووه، خۆی بەسەر تاپڕه دوو لولەیەکەیدا دەنوشتێنێتەوه و به جۆرێک که لەدەمی توند بنێت، دواجار دەست به پەله پیتکەکەیدا دەنێت.

# سیگمۆند فرۆید

نووسینی: لیز گوجیرلی
لەعەرەبیەوە: شۆڕش محەمەد حسێن

نووسەری ئەم کتێبە کچە لێکۆڵیار -لیز گوجیرلی- تایبەتمەندە لە زانستی دەروونی و شیکاری دەروونی. لەم کتێبە نوێیەدا نوسەر تیشکێکی گشتی لەبارەی ژیانی (سیگمۆند فرۆید) دامەزرێنەری شیکاری دەروونی و کورتەیەک لەبارەی بەرهەم و نووسراوەکانی پێشکەش دەکات. لە سەرەتاوە نووسەر دەڵێت: فرۆید ساڵی ١٨٥٦ لەشاری (فریبرگ) لە مۆرافیا لەدایک بووە، کە ئەو شارەیە لەبنەڕەتدا چیکەکان دایانمەزراندووە و دواتر بووە بە ئەڵمانی، ڕێژەی لە ٩٠٪ ی مەسیحی کاسۆلیکی بوون.

لەو دەمەشدا بە چوونە ناو چەرخی پیشەسازی و دواتر چوونە ناو نوێگەریی دەستی پێکرد و فرۆیدیش ساڵانی یەکەمی تیادا بەسەر برد.

دوای ئەوەش بە بەردەوامی باسی دەکرد و دانی دەنا بەو کاریگەرییانەی کە لەسەری هەیبوو،



سیگمۆند فرۆید

چونکە قۆناغی منداڵی کەسێتی مرۆڤ دروست دەکات و لەگەڵ ئەوەی کە فرۆید لەبنەڕەتدا جولەکە بوو بەڵام خێزانەکەی خۆیان بەئەڵمانی دەزانی (لە ڕووی زمان و نەتەوەوە).
پاشان خێزانەکەی چوونە ڤیەنای پایتەختی نەمسا و لەو کاتەشدا فرۆید بە تەنها تەمەنی (٤)ساڵان بوو، لەوێش زۆربەی تەمەنی خۆی بەسەر بردوو هەروەک خوێندنی ناوەندی و زانکۆی لەوێ تەواو کرد و لەکۆتاییەکانی ژیانی و بەهۆی پاڵە پەستۆی نازییەکان لەسەری ڤیەنای بەجێهێشت و چووە لەندەن و لەساڵی ١٩٣٩ لەسەر وەختی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم بەنەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.
پاشان نووسەر دەڵێت: ئەوکاتەی خوێندنی ناوەندی تەواو کرد باوکی ڕێی پێدا کە خوودی خۆی ئەو تایبەتمەندییە هەڵبژێرێت کە دەیەوێت و هیچ جۆرە کۆلێژێکی دیاریکراوی بەسەردا نەسەپاند، لە سەرەتاشدا لەنێوان کۆلێژی یاسا و کۆلێژی پزیشکیدا دوو دڵ بوو، بەڵام دواتر خوێندنی پزیشکی هەڵبژارد لەگەڵ ئەوەی کە خوێندنی پزیشکی درێژتر و قورستر بوو بەڵام یەکێک لەسروشتەکانی فرۆید ئەوە بوو کە حەزی بە سەرکێشی دەکرد و لێی نەدەترسا.
پێدەچێت لەو کاتەوە حەزی بە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ بووبێت نەک بە تەنها لە ڕووی پزیشکی و جەستەییەوە بەڵکو لە ڕووی دەروونیشەوە هەربۆیە لە نزیکترین تایبەتمەندیەکانی ئەم زانستە بۆ ڕۆح، یاخود دەروون تایبەتمەندی وەرگرت: بەواتای پزیشکی دەمار و نەخۆشیە عەقڵیەکان.
لەدوای ئەوەی کە زانستی توێکاری و ئەرکی ئەندامەکانی لەش و سەر و دەماغی دۆزییەوە، بەم ئاکامە گەیشت:
نەخۆشیە عەقڵیەکان لە نەخۆشیە جەستەییەکانەوە دروست نابێت بەڵکو تایبەتمەندێتی خۆی هەیە و

له پاشان میتۆدی تر هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی جگە لە میتۆدی پزیشکی ئاسایی، ئایا ئەم میتۆدە چییە؟ سەبارەت بەم خاڵە، فرۆید ساڵ لەدوای ساڵ دەگەڕا پێش ئەوەی نهێنیەکە بدۆزێتەوە و ببێتە یەکێک لە کەسە بەناوبانگەکانی ڕۆژگار، لە یەکێک لە ڕۆژەکاندا چاوی کەوت بە پزیشکێکی دەروونی گەورەتر لە خۆی کە ناوی (بروید) بوو ئەم پزیشکە پێی ووت کە لەنێوان ساڵانی ١٨٨٠ بۆ ١٨٨٢ چارەسەری کچێکی کردووە کە تووشی نەخۆشی هیستریا بووە، تێبینی ئەوەی کرد کە هەرکاتێک بەجێی دەهێڵێت بە درێژی لەبارەی ئازارەکانیەوە قسەبکات بۆ ماوەیەکی باش تەندروستی بۆ دەگەڕێتەوە بەڵام لە هەمان کاتیشدا تێبینی ئەوەی کرد کە لەو گێڕانەوانەی نەخۆشەکە کە بەرامبەری دەیدرکێنێ شتێک دەشارێتەوە و ناوێرێت ئاشکرای بکات.

لەو کاتەشدا پەنای بردە بەر چارەسەرکردنی لە ڕێگەی متیۆدی خەواندنی موگناتیسی (هیبنۆتیزم) تاوەکو ئەو نهێنیە قوڵە بدۆزێتەوە کە ئازاری دەدات. بە کردەیش ئەو دەمەی ئەم نهێنیەی ئاشکرا کرد سروشتی ئاسایی خۆی بۆ گەڕایەوە و نیشانەکانی نەخۆشیەکەی نەما: بە واتای گرێ دەروونیەکەی کە دوودڵی کردبوو.

پاشان نووسەر دەڵێت: لەدوای ئەوە فرۆید بوونی پزیشکێکی بەناوبانگی دەماری لە پاریس بیستبوو کە ناوی (شارکو) بوو هەر بۆیە داوای لە زانکۆی ڤیەنا کرد کە کارئاسانی خوێندنی بۆ بکەن تاوەکو بچێت بۆ ئەوێ و لەسەر دەستی ئەو پزیشکە بخوێنێت، فرۆید ساڵی ١٨٨٥ گەیشتە پاریس و چەند مانگێک لەوێ مایەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک لە خوێندکارەکاندا ئامادەی وانەکانی



ئەم تایبەتمەندە گەورەیە بوو لەبارەی زانستی نەخۆشیە دەمارییەکانەوە.
دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی تەواو کرد گەڕایەوە بۆ ڤیەنا و ڕاپۆرتێکی لەبارەی زانستەکەی (شارکۆ) پێشکەشکرد بەڵام مامۆستاکانی بڕوایان پێ نەکرد و ئەم زانستە نوێیەیان بە هەند وەرنەگرت.
هەربۆیە فرۆید توانای خۆی دەرخست و لەساڵی ١٨٨٦ ژنی هێنا و لە ماڵە نوێیەکەی خۆیدا جێگیربوو دوای ئەوەی کە کردبووی بەعیادەیەک بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشانەی دووچاری گرێی دەروونی بوون.
چەندین متیۆدیشی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی بەکارهێنا وەک لێدانی کارەبایی و خەواندنی موگناتیسی (هیبنۆتیزم). بەڵام متیۆدی یەکەم بێ هیوای کرد، بۆ ئەوەی کە زیاتر بێگومان بێت لە متیۆدی یەکەم جارێکی تر سەفەری کرد بۆ فەڕەنسا بۆ وەرگرتنی زانست لە پزیشکە گەورەکانی زانکۆی (نانس)، ئەوکاتەی گەڕایەوە بۆ ڤیەنا (بروید) پەیوەندی پێوەکرد و پێکەوە دەستیان دایە کارکردن بۆ گەیشتن بە نهێنی نەخۆشی دەروونی.
ئامانجی لە خەواندنی موگناتیسیش بریتی بوو لەوەی نهێنی ئەو نەخۆشیە بەو نەخۆشە دەربهێنن کە ئازاری دەدات، کە لە ناخی خۆیدا و بۆ ماوەیەکی زۆرە شاردویەتیەوە تەنانەت لە خودی خۆی.
لەدوای ئەوەی کە دووچاری جیاوازی بوون لەبارەی ڕاڤەکردنی نهێنی نەخۆشیە دەروونیەکان لە یەکتری جیابوونەوە، لە کۆتایشدا میتۆدی خەواندنی موگناتیسی بەدیاریکراوی مایەوە، هەربۆیە فرۆید بەشێوەیەکی کۆتایی و سەرەڕای ناڕەزایەتی (بروید) لەم بابەتە دەست بەرداری بوو، لەو کاتەوەش پەیوەندییەکانی نێوانیان پچڕا و هاوڕێیەتیەکەیان کۆتایی هات، فرۆید بەوە زۆر ئازاری چەشت، چونکە ڕێزێکی زۆری هاوڕێ گەورەکەی دەگرت.
لەدوای ئەوە فرۆید بەشوێن میتۆدێکی تردا دەگەڕا بۆ دۆزینەوەی نهێنی نەخۆشی دەروونی و ئەم جۆرە پرسیارانەی دەخستەڕوو:
سەرچاوەی بیرۆکەی ناهۆشیارییەکان کوێیە؟، کێ دەینوسێ و بۆچی؟ دوای ئەوەی لە قوڵایی ناهۆشیاریدا دەنووسرێت بۆ کوێ دەچێت؟ بەمجۆرەش فرۆید وورده وورده نزیک دەبۆوە لەو نهێنیەی کە لە سەرجەمی بیریار و زاناکانی پێش خۆی ئاڵۆز ببوو.
ئەم پرسیارانە بۆ ماوەیەکی زۆر بێ وەڵام مانەوە. زاناکان لەو کاتەی دانیان دەنا بە بوونی ناهۆشیاری بەو پێیەی کەناوچەیەکی مردووە و ناخی مرۆڤ سەرقاڵ دەکات، ناوچەیەکی تاریک و نوتەکە و یادەوەرییە لە بیرکراوەکانی مرۆڤی تیادا کەڵەکە دەبێت بەڵام فرۆید بەمجۆرە بیری دەکردەوە: ئەگەر بێت و ناهۆشیاری لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گوزارشت لە خودی خۆی بکات لە ڕێگەی گرێی دەروونیەوە ئەوا پێویستە لەسەرمان زمانەکەی فێربین تاوەکو لەبەهاکەی تێبگەین، چونکە پێدەچێت جیا لەو زمانەی ئێمە خاوەن زمانێکی تر بێت.
بەمجۆرەش متیۆدی شیکردنەوەی دەروونی لەدایک بوو تاوەکو ڕوخساری فکر و جیهان بگۆڕێت، پەی بەوەش برد کە تاکە ڕێگەی دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی نەخۆشی دەروونی بریتی یە لەو ڕێگەیەی کە (بروید) لەگەڵ کچە تووشبووەکە بەهێستریا گرتیەبەر: بەواتای خوێندنەوەیەکی ڕۆحی ئازاد

یان کاریگەری ئازادانە لەسەر مەترسیەکان، بەڵام بەرنامە ڕێـژکـراوە و زۆر شت لە نەخۆش داوا دەکات و دەبێت بەتەواوی خۆی تەسلیم بە پزیشک بکات، لەسەر سیسەمێک پاڵ بکەوێت و هەموو ئەو شتانە بگێڕێتەوە کە بەخەیاڵیدا دێت، تەنانەت ئەگەر ووشەیەکی ناشرین یاخود ترسناک یاخود شەخسی و زۆر تایبەت و تەنانەت ئەگەر هەست بە شەرمەزاری بکات بەرامبەر ئەو قسانە کە پێویستە لەبەردەم پزیشکەکە بیدرکێنێت کە پارێزگاری لە نهێنیەکانی دەکات.

پێویستە لەسەر نەخۆشەکە هەموو ئەو شتانەی لە مێشکیدا هەیە لە هەست و سۆز لەو ساتەی کە قسە دەکـات بۆ پزیشکەکەی بگێڕێتەوە، پێویستە لەسەری هەگبەکەی بەبێ بیرکردنەوە بەتاڵ بکاتەوە: بەواتای شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و لە ڕێگەی کاریگەرییەکی ئازادانە لە ووشە و بیرکردنەوە و مەترسیەکان و هەستەکان. پاشان نووسەر دەڵێت: فرۆید زۆرجار دە کاتژمێر یاخود زیـاتـر لەنوسینگەکەی کـاری دەکـرد و گوێی لە نەخۆشەکانی دەگـرت کە چیرۆکی ئـازارە دەروونیەکانیان بۆ دەگێڕنەوە، ڕۆژانەش پێشوازی لە ژمارەیەکی زۆریان دەکرد و بۆ هەریەکەیان کاتی تەواوەتی بۆ تەرخان دەکردن تاوەکو هەگبەکەی لە ترس و ئـازار بەتاڵ بکاتەوە، پاش ئەوەش کە دەرۆشتن یەکەیەکە بەسەرهاتەکانی پۆڵێن دەکرد تاوەکو چیرۆکەکانیان یاخود (گرێکانیان) بە بیر بهێنێتەوە و تاوەکو بەشێوەیەکی باشتر چارەسەریان بکات، هەر نەخۆشێک گیرۆدەی گرێیەکی دەروونـــی بـوو و ئـەم گرێیەش لە نەخۆشێکەوە بۆ نەخۆشێکی تر دەگۆڕێت. بەڵام ئایا ئەوە دەزانین کە فرۆید متیۆدی شیکردنەوەی دەروونی یەکەمجار لەسەر خودی خۆی پراکتیک کردووە؟ فرۆید هەستا بە پرۆسەی شیکردنەوەی خودی خۆی پێش ئەوەی تایبەتمەندی وەربگرێت لە شیکردنەوەی ئەوانی دی و چارەسەرکردنی دەروونیان بۆ ئـەوەی هەستێت بەشیکردنەوەی قوڵاییەکانی ناخی گەڕایەوە بۆ ڕابـردووی منالّی خۆی تاوەکو ئەو شتانە بەبیر بێنێتەوە کە لە بیری کردبوو و لەو کاتەدا ڕووداوێکی زۆر کۆن بە بیر خۆی دەهێنێتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ منالّی خۆی کە ئەو کاتەش تەمەنی تەنها دوو ساڵ و نیو بووە. ئەوە بە بیر دەهێنێتەوە کە دایکی خۆشدەویست زۆرجـار بەشێوەیەکی ناسروشتی و ئیرەیی پێ دەبرد.

ئەم دۆزینەوەیە بێزارکەرەش ڕاپێچی چەمکی گرێی ئۆدیبی کردوو دانان بەوەی کە لەنێو قوڵایمان و لە منالّیەوە چێنراوە.

پاشان ووتی هاوسۆزی سێکسی لە منالّیەوە بوونی هەیە لەلامان.

بەڵام ئەم دۆزینەوەیە مرۆڤە باوەڕ دارەکانی لە ڤیەنا و کوڕانی چینە بۆرژوازییەکانی بێزار کردوو جۆرێک لەبێ ئابڕوییان تێدا بینی و دەستیان دایە تۆمەتبارکردنی شیکردنەوەی دەروونی بەوەی کەبێ ڕەوشتیە و فرۆید ئەنگێزە بەڕەڵاکان لەناو کۆمەڵگەدا بڵاودەکاتەوە!!

هەروەک چۆن لە سەرەتاوە کەس لێی تێنەگەیشت، ئەمەش چارەنووسی هەموو گەورە و ئەفرێنەران و دۆزەرەوەکان بووە کە خەڵک لەدوای ماوەیەکی زۆر بەهاکەی دەزانن. سەرەڕای ئەوەش فرۆید مرۆڤی دووچـاری سێهەمین بریندارکردنی نەرجسی کرد لەدوای ئەو برینەی کە (کوبرنیکۆس و داروین) لە نەرجسیەتی مرۆڤیاندا.

ئەمە واتای چی‌یە؟ ئەمە واتای ئەوەیە کە: ئەو کاتەی (کوبرنیکۆس) ئەوەی دۆزییەوە کە زەوی بەدەووری ڕۆژدا دەخولێتەوە نەک بە پێچەوانەوە زەوی بە سەنتەری گەردوون نەمایەوە بەڵکو ڕۆژ ئەو گرنگیەی بە دەست هێنا، بەمەش زەوی سەنتەری خۆی لە دەست داو دووچاری سەر سووڕمانی و بێ هیوای و شەرمەزاری نەرجسیەتی کردین لە بەرامبەر لەخۆبایی بوونە کەسێتیەکەماندا ئێمە لە سەنتەری گەردوون نەماینەوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە ڕابردووی ڕۆژگارەکانماندا ئەندێشەمان دەکرد.

ئەو کاتەش کە داروین ئەوەی دۆزییەوە کە ڕەچەڵەکی مرۆڤ (بەپێی قۆناغەکانی پێشکەوتن) دەگەڕێتەوە سەر مەیمون سەرسامی کردین و بە دووەمین برینی نەرجسی بریندارى کردین کە سامناکی لەوەی یەکەم کەمتر نەبوو ئەگەر زیاتر نەبووبێت.

وا بەبیرمان دەهات کە پێهاتەی ئێمە و بوونەوەرەکانی تر جیاوازن، بەڵام ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئێمە بەشێکین لە بوونەوەرە زیندووەکانی سروشت و دەخۆین و دەخۆینەوە و زیاد دەکەین وەک باقی



بوونەوەرەکانی تری سەر گۆی ئەم زەوییە. لە پاشان لایەنێکی ئاژەڵیمان تێدایە کە نکوڵی لێ ناکرێت.
پاشان فرۆید هات تاوەکو برینێکی تر لە لەخۆبایی نەرجسیەتمان بدات ئەو کاتەی ووتی مرۆڤ ناتوانێ کۆنترۆڵی خودی خۆی بکات.
ناهۆشیاری لە ناخیدا هەڵی دەسورێنێت و ئیرادەشی بەو ئاستەی کە ئەندێشە دەکرا ئازاد نیە، ڕاستە هۆشیاریەکانی بە ڕێژەیەکی گەورە بەڕێوەی دەبات بەڵام ناهۆشیاریەکەی بەهەمان شێوە تێهەڵدەچێت و لەسەر هەڵسوکەوتی بەئاستێکی گەورە کاریگەری هەیە.
ئەگەر پزیشکی جەستەیی توێکاری جەستە بکات یاخود پشکنینی بۆ بکات تاوەکو جۆری نەخۆشیەکە دەست نیشان بکات کە دووچـاری هاتووە ئەوا پزیشکی دەروونی پێویستە لەسەری توێکاری ڕۆح بکات یاخود ناواخنی دەروونە تاریکەکەی. تاوەکو هۆکاری ئاڵۆزی و گرێ دەروونیەکەی تێبگات.
زانستی دەروونیش ئەوەی چەسپاندووە کە گەورە ئەفرێنەرەکان لەبنەڕەتدا نەخۆشی دەروونیان بووە بەڵام ئەفراندنەکانیان لەشێتی ڕزگاری کردوون، بە نموونە: جان جاک ڕۆسۆ، ریلکە، ڕامبۆ، بۆدلێر و دەیانی تر.
بەڵام هەندێکیشیان تەنانەت ئەفراندنە گەورەکەیان نەیتوانی لەکۆتایدا بیان پارێزێت لە شێتی و خۆ کوشتن، لەوانە نیچە، جیرار دونیرفال، فیرجینیا وولــف، ئەرنست هەمەنگوای، عــەزرا پاوەند، ئەنتۆنین ئارتۆ، هولدرلین، ڤان کوخ و چەندینی تر.

کتێبی/ سیگمۆند فرۆید
بڵاوکەرەوە/ واتر بوبلیشینگ گروب لەندەن ٢٠٠٤
قەبارە/ ١١٢ لاپەڕەی مامناوەند.

## * سەرچاوە
-بیان الکتب-ی ڕۆژنامەی -البیان-ی ئیماراتی.

# خۆکوشتنێکی هونەری لە بەرلین

لە عەرەبییەوە: باوکی پایان



نۆ هونەرمەندی ئەوروپی، وەک پیشاندانی ناڕەزایی بەرامبەر ئەو بارودۆخەی هونەری سەربەخۆی تێدایە، کارە هونەرییەکانی خۆیان سوتاند. لە ماڵی (تاخلیس) بۆ هونەر، کە نزیکەی سەد هونەرمەند لە پسپۆڕییە جیاواز جیاوازەکاندا، لەو ماڵە هونەرییەدا کار دەکەن، ئاگر بەردرایە کۆمەڵێ کاری هونەری.

لە ساڵی ١٩٨٩، نۆ هونەرمەندی ئەوروپی، کارە هونەرییەکانی خۆیان لە بەرلین سوتاند، ئەمەش وەک ناڕەزایەتییەک لە بەرامبەر ئەو پەراوێز خستنەی کە هونەری سەربەخۆ و بێلایەن، لە تەواوی ئەوروپادا، گیرۆدەی بووە، هەروەها لە بەرامبەر کەمکردنەوەی ئەو بودجەیەی بۆی دیاریکراوە، لە ژێر سایەی ئەو قەیرانە ئابورییە توندەی کە ئەم کیشوەرەی گرتووەتەوە.

سوتاندنی تابلۆی هونەرییەکان کە لە ماڵی (تاخلیس)دا دانرابوون و نزیکەی ١٠٠ هونەرمەند



له پسپۆڕییە جیاواز جیاوازەکان و لە باکگراوندە ڕۆشنبیرییە جیاوازەکانەوە کاریان تێدا کردبوو، هەوڵێک بوو بۆ ڕاکێشانی سەرنج دەربارەی ئەو بارودۆخە خراپ و نالەبارەی هەندێ لە ماڵە هونەرییە سەربەخۆکان بەدەستییەوە دەناڵێنن. لەوانە مۆزەخانەی ناپۆلی بۆ هونەری سەردەم لە باشوری ئیتالیا، ئەم مۆزەخانەیە ڕووبەڕووی کۆمەڵێ ڕێوڕەسمی تەقەشوفی گەورە بووەتەوە کە لەلایەن دەوڵەتەوە بەسەریدا سەپێنراوە، ماڵی (تاخلیس) لە بەرلین کە بۆ مەبەستی وەبەرهێنان فرۆشراوە بە کەرتی تایبەت، خاوەنی ئەم ماڵە کە بریتین لە هونەرمەندەکان و نزیکەی ۲۳ ساڵە کاری تێدا دەکەن، نەیانتوانی شوێنەکە چۆڵ بکەن.

خانم "لیندا سیرنا" وتەبێژی ماڵی (تاخلیس) بۆ هونەر، لە هەوڵێکیدا بۆ ئاماژەدان بەوەی چارەنووسی ئەم دەزگا هونەرییە چی بەسەردێت دەڵێ: (هەڕەشەکە لەلایەن کۆمەڵێ وەبەرهێنەر، بانک، دادوەر و هەندێ لە سیاسییەکانەوەیە کە هیچ گرنگی و بایەخدانێک بۆ ئەم چالاکییە هونەریانە دانانێن. خەمی ئەوان تەنها بریتییە لە کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی پارە و بە هەموو توانای خۆیانەوە کار بۆ ئەوە دەکەن ئێمە لەگەڵ پۆلیسدا بەریەکبکەوین، ئەوان هونەریان تێکدا، ئەمەش ئەو هۆکارەیە هونەرمەندەکانی ناچارکرد ئاگرلە تابلۆکانیان بەردەن، پێش ئەوەی بازاڕ ئەو کارە بکات).

خانم "باربارا فراگۆنا" کە هونەرمەند و بەڕێوەبەری ماڵی (تاخلیس)ە، دەڵێ: (ئێمە بەو سیفەتەی تاخلیس ناوەندێکە بۆ داهێنانی هونەری و شوێنێکە هونەری سەربەخۆ و سەردەمیانەی تێدا نمایشدەکرێت، بەرگری لێدەکەین و ئامانج لێی هیچ جۆرە قازانجکردنێک نییە. هونەرمەندان و جەماوەر پێویستیان بەوەیە لەگەڵ یەکتر پەیوەندیان هەبێت تاکو هونەر ئاراستەی خەڵک بکەن، نەک ئاراستەی بازاڕی بکەن. دەمانەوێ شارەکە ئەو شوێنە بگرێتەخۆی تاکو پارێزگاری لێ بکات، نەک شوێنەکە ببێت بە ناوەندێکی بازرگانی).

لەلایەکی دیکەوە سوتاندنی ئەم تابلۆ هونەریانە، وەک پشتگیرییەک وایە بۆ مۆزەخانەی هونەری سەردەم لە ناپۆلی کە بەهۆی کۆمەکنەکردنی دەوڵەتەوە، ڕووبەڕوی چارەنوسێکی نادیار دەبێتەوە. ئەهلی هونەر لەوە دەترسن لە ئایندەدا ڕۆشنبیری کڕین و فرۆشتنی پێوەبکرێت، ئەمەش مانای نەبوونی تێڕوانینێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەو کێشانەی لە ئایندەدا دێنە بەردەم ئازادی دەربڕینی فیکری. هونەرمەندێکی ئیتاڵی کە ماوەی چوار ساڵە لە ماڵی (تاخلیس) کار دەکات دەڵێ: (سوتاندنی هەر کارێکی هونەری تابلێیی مەسەلەیەکی سەختە، چونکە ئەوە بەشێکە لە تۆ، وەک ئەوە وایە کوڕت بێت).

کاتێ دیواری بەرلین ڕوخا، دەوڵەت ویستی باڵەخانەی تاخلیس بڕوخێنێت، تا لە شوێنەکەیدا شەقامێکی تازە دروست بکات، بەڵام لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ، ژمارەیەکی زۆر هونەرمەند لەو شوێنەدان و دەستیان بە ستۆدیۆکانیان و شوێنی نمایشکردنی کارە هونەریەکانیانەوە گرتووە و چۆڵی ناکەن و ڕازینابن دەستبەرداری ئەو باڵەخانە بەرزە ببن کە دەکەوێتە گەڕەکی (میتا) لە بەرلین کە فراوانبونێکی گەورەی بازرگانی بەخۆیەوە دەبینێ.

**سەرچاوە**: یوسف یەڵدا، ایلاف، ۲۰۱۲/٤/۲۹.

# گۆر ڤیداڵ... پیاوێکی بێ دەمامك و کەسایەتییەك خۆی و ئەوانی دیکەی ماندوو کرد

ئامادەکردنی: دیاکۆ

ئاخۆ ئەمریکا چۆن و بە چ شێوەیەک یادی گۆر ڤیداڵ دەکاتەوە کە لە کۆتایی مانگی تەموزی ئەم ساڵدا و لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا، لە ماڵەکەی خۆیدا و بە هۆی نەخۆشی هەوکردنی سییەکانییەوە، کۆچی دوایی کرد؟ ئایا وەک سیاسییەک، ستوننوسێک، شانۆنوسێک، سینەماکارێک، رۆماننوسێک، یادی دەکاتەوە یان هەموو ئەوانە پێکەوە؟ ئەم پیاوە ٢٨ رۆمـان، کۆمەڵێ چیرۆک، ژمارەیەکی بێ حساب ستونی سیاسی، ٥ شانۆنامە و درامایەکی تەلەفزیۆنی و چەندین سیناریۆی نوسیووە. بەشداری چەندین چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی و تەلەفزیۆنی کردووە کە لە ژماردن نایەن، دوو جار خۆی بۆ کۆنگرێسی ئەمریکا کاندید کردووە، بەڵام



گۆر ڤیدال

سەرکەوتوو نەبووە، چەندین شەڕی سیاسی جدیی ئەنجامداوە، چووتە ناو دەیان گێرمەوکێشەی ئەدەبییەوە کە زۆربەیان گێرمەوکێشەیەکی گەنجانە و هەرزەکارانە بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئەدەبەوە نەبووە، بەڵکو ئەو گێرمەوکێشانە لە کەسێکەوە ڕویداوە کە لانی کەم دووچاری نەخۆشی ئیرەیی و ڕقی شەخسی بووە.
ئەوەی سەیرە ئەوەیە گۆر ڤیدالْ خۆی دانی بەوەدا ناوە، ئەو زیاد لە جارێک ڕایگەیاندووە کە (کەسێکی ڕقاوییە) و (تەنها سەرکەوتن بەس نییە، ئەگەر هاوکات شکستی ئەوانی دیکەی لەگەڵدا نەبێت) و (هەر کاتێ هاوڕێیەک سەرکەوت، شتێک لە مندا دەمرێت). تۆ بڵێی ئەو کەسێکی بێ دەمامک بووە و ڕاستگۆیانە ئەو شتانەی ئاشکرا کردووە کە ئێمە خۆمانی لەپشتەوە دەشارینەوە و دانی پێدا نانین گەرچی لەوانەیە بە تەواوەتی لەناخماندابێت؟
هەوادارانی و ئەوانەی پێی سەرسامن بە یەکێک لە (مشتومڕکەرە - المناظرین) هەرە دیارەکانی ئەمریکای دادەنێن، کەچی ئەوانەی دژ و نەیاری ئەون بە کەسێکی دادەنێن سەر بە توێژی ناوداران نییە. بەڵام گۆر ڤیدالْ جارێکیان ئاوا وەسفی خۆی دەکات: (جەنتڵمانێکی بێ ئابڕووە).
گۆر ڤیدالْ لە ٣ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥ لە نیۆیۆرک لەدایکبووە، "یۆجین ڤیدالْ"ی باوکی لە ئەکادیمیای سەربازی بۆ فێربوونی فڕۆکەوانی کاریدەکرد. "نینا"ی دایکی کچی ئەندامی ئەنجومەنی پیران "تی. بی. گۆر" بوو. ئەم نوسەرە بە منداڵی ناوی لێنرا "یۆجین لۆسەر گۆر ڤیدالْ"، بەڵام دواتر هەردوو ناوەکەی یەکەمی لابرد و تەنها گۆر ڤیدالْ-ی هێشتەوە. واتە گۆر ناوی باپیری لە دایکییەوە و ڤیدالْ ناوی باپیری لە باوکییەوە. گۆر ڤیدالْ دوای ئەوەی باوکی، دایکی تەڵاق دەدات، دەکەوێتە لای




باپیری لە دایکییەوە و پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوانیاندا دروست دەبێت. ئەم باپیرەیە نابینایەی داوای لێدەکات لە کتێبخانە گەورەکەیدا کتێبی بۆ بخوێنێتەوە، ئەمیش بە دەنگی بەرز دەست دەکات بە کتێبخوێندنەوە بۆ باپیرە نابیناکەی. ئەمە دەرفەتێکی باشی بۆ دەرەخسێنێت کە بێتە ناو دنیای کتێب و خوێندنەوەوە. لەو ماوەیەدا کۆمەڵێ کتێبی جۆراوجۆری خوێندووەتەوە، لەوانە موغامەراتەکانی تەرەزان و کتێبە میژوییەکان، بەتایبەت لەسەر مێژوی ئەمریکا لە سەدەی حەقدەهەم کە دواتر سەبارەت بەو کتێبە مێژوییانە دەڵێ: (دەمویست سەرتاپای مێژوی هەموو جیهان بزانم).

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٤ خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات و تەمەنی تەنها هەژدە ساڵە، لە باتی ئەوەی بروات بۆ زانکۆی هارڤرد و درێژە بە خوێندنەکەی بدات، دەڕوات بۆ بەرەکانی جەنگ، تاکو بەشداری لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بکات. لە بەرەکانی جەنگدا لەسەر پشتی یەکێک لە کەشتییە جەنگییە بچوکەکان کە تایبەتە بە کۆمەکردن، دەمێنێتەوە و سەرقاڵی خزمەتکردن دەبێت بە سوپای ئەمریکا. ئیلهامی یەکەم ڕۆمانی کە ساڵی ١٩٤٦ لەژێر ناونیشانی (زریان – العاصفه) بڵاویکردەوە، لەو کەشوهەوا و بارودۆخەی جەنگدا وەرگرتووە. ئەو ڕۆمانەی لەلایەن هەندێ لە ڕەخنەگرانەوە پێشوازییەکی باشی لێکراو بە بەشێکی دانەبڕوا لە ئەدەبی جەنگی ئەو سەردەمە دانرا.

ژیانی ئەدەبی ئەم پیاوە بۆ زیاد لە ٦٠ ساڵ درێژ دەبێتەوە و جارێکیان وتویەتی: (هیوادارە ئەوانی دیکە ئاوا یادی بکەنەوە: ئەو کەسەیە لە ڕۆژگاری

































خۆیدا باشترین ڕستەکانی نووسیوە). لەوانەیە ئەم نووسەرە دواهەمینی ئەو نووسەرە ناسراوانەبێت کە بەشداری جەنگی دووەمی جیهانیان کردووە و بەشێوەیەکی بەرچاو ئەدیبێکی فرە بەهرە بووە. ئەو لە تەمەنی بیست ساڵیدا بڕیاردەدا لەسەر قەڵەمەکەی بژی، ئیدی دەست دەکات بە نوسینی ڕۆمان و شانۆگەری و سیناریۆی فیلم. لە لایەنی ئەدەبییەوە، گەرچی ٢٨ ڕۆمانی نوسیوە و هەندێ لەو ڕۆمانانەی سەرکەوتنێکی بازرگانی گەورەیان بەخۆوەبینی، وەک ڕۆمانی (جۆلیان) و ڕۆمانی (لینکۆلن) کە ڕۆمانێکی مێژوویيە و لە ژیانی سەرۆکی ئەمریکا (لینکۆلن)ەوە هەڵیهێنجاوە و لەکاتی بڵاوبونەوەیاندا پرفرۆشترین ڕۆمان بوون، کەچی لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ناتوانین گۆر ڤیداڵ بە ڕۆماننوس دابنێین، یان لانی کەم بە ڕۆماننوسێکی پلە یەکی دابنێین. ڕاستە یەکەم ڕۆمانی (زریان- العاصفه) کە ساڵی ١٩٤٦ بڵاوبووەوە، سەرکەوتنێکی ئەدەبی بەرچاوی بەدەستهێنا و وایکرد هەندێ ڕەخنەگر بەراوردی بکەن بە "نۆرمان میلەر، ترۆمان کابۆت، سۆل بیلۆ"، هەروەها ڕۆمانی دووەمی (شار و عەمود) دەنگدانەوەیەکی گەورەی دایەوە، بەڵام هۆکاری ئەو دەنگدانەوە گەورەیە بۆ بابەتەکەی دەگەڕێتەوە، نەک بۆ هونەرکارییەکەی. ئەم ڕۆمانە ساڵی ١٩٤٨ بڵاوکرایەوە و لەو کاتەدا بۆ یەکەمجار و بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا مەسەلەی (هاوسێکسبازی) خستەڕوو. ئەمە وایکرد نووسەری ناوداری فەرەنسی "ئەندرێ جید" کە خۆشی هاوسێکسباز بوو، گۆر ڤیداڵ بە (ڕابەری شۆڕشی سێکسی) دابنێت کە دواتر ئەو شۆڕشە ڕوودەدات.

دوای ئەو دوو ڕۆمانە، هیچ سەرکەوتنێکی دیکەی

ئەدەبی بەدەستنەهێنا شایەنی باسکردن بێت، بگرە بە پێچەوانەوە کەوتە بەر پەلاماری زۆربەی ڕەخنەگران، لەوانە "جۆن دەبلیو"، "ئۆلدبریج"، ئەم ڕەخنەگرەی دووەمیان سەبارەت بە ڤیداڵ دەڵێ: (نوسینەکانی ڤیداڵ دوای ڕۆمانی زریان، هیچ نین تەنها زنجیرەیەک شکستی دورودرێـژ نەبێت لە شێواز و لە بەهەدەردانی ڕۆحی. ئەوانە نوسینێکی شپرزەیی پارچە پارچەن کە ڕەشەبای ئینتیباعیەت بە هەموولایەکدا ڕایاندەکێشێت).

بەشی زۆری خەڵک گۆر ڤیداڵ-یان لە ڕێگەی نوسینە ڕەخنەییەکانییەوە ناسی، کە تێیدا ڕەخنەیەکی توندی بریندارکەر لە نووسەرانی هاوڕێی وەک "نۆرمان مێلەر" و "ویلیام بارکلی" دەگرێت. هەروەها لە ڕێگەی هەوڵە ڕۆمانسییە خەیاڵاوییەکانییەوە ناسییان کە دەیویست لەناو ماشێنی سیاسەتی ئەمریکادا شوێنێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

ئەم نووسەرە لە سەردەمێکدا کە بە سەردەمی ڕێزی درۆزنەی هەڵبەستراو ناسراوە، سوور بوو لەسەر ئـەوەی بە شێوەیەکی تـەواو ڕاستەوخۆ گوزارشت لە بیروڕاکانی بکات. بۆ نمونە ئاوا وەسفی ئارنست هێمنگوای دەکات: هیچ نییە تەنها گاڵتەجاڕێک نەبێت. سەرەڕای ئەوە ئاوا ڕەخنە لە خانمی نووسەر "جویس کارول ئۆتس" دەگرێت و دەڵێ: (ناوی لە خراپترین ٣ وشە پێکهاتووە کە لە زمانی ئینگلیزیدا هەیە).

گـــۆر ڤـــیـــداڵ شـــانـــازی بـــە پـــەیـــوەنـدیـیـە هاوسێکسبازییەکانییەوە دەکـرد و خـۆی زۆر بەوەوە ماندوو دەکرد کە کەسێکی هاوسێکسبازە و پڕوپاگەندەی زۆری بۆ دەکرد، گەرچی ئەوانەی لە ژیانی تایبەتییەوە نزیکبوون، جەخت لەوە دەکەن ئەم خاڵە زیاتر قسە بووە تا کردەوە.

گۆر ڤیداڵ لەم بوارەدا ئۆسکار وایلدی بە نمونەی باڵای خۆی دادەنا، وەک ئەو دەستی بە نوسینی شانۆنامە کرد و چەند شانۆنامەیەکی هاکەزایی نوسی، وەک (باشترین پیاو)، هەروەها لە گەڕان بە دوای ئابڕوچون و قسەوقسەڵۆکدا لاسایی ئۆسکار وایلدی کردەوە، بەڵام گۆر ڤیداڵ هەرگیز بە حوکمی جیاوازی و لێکنەچونی سەردەمەکان، نەیتوانی ئەو هەرایە بنێتەوە کە ئۆسکار وایڵد نوسەری ڕۆمانی (دۆریــان گـرای) لە سـەدەی نۆزدەهەمدا نایەوە.

ئەم نوسەرە پیاوی هەموو وەرزەکـان و هەموو شوێنەکان بــوو: لـە یـانـەکـان و کـۆبـونـەوەی نووسەران، لە ستۆدیۆی ئەکتەرەکان، لە هەمان کاتدا لە ڕاڕەوی سیاسییەکان و ژورە نهێنییەکانیدا دەبینرا کە تێیدا فڕوفێڵ و پیلانەکان دەچنرا. ئەو پیاوێک بوو دەتتوانی لە یەککاتدا لە سێ شوێندا بیدۆزیتەوە، ئەمەش مانای وایە تۆ ناتوانیت لە هیچ شوێنێکدا بیگریت یان بیدۆزیتەوە. لێرەوە ناتوانین پۆلێنی بکەین یان بیخەینە ناو چوارچێوەیەکەوە کە بە درێژایی ژیانی جێگای لە هیچ چوارچێوەیەکدا نەبوەتەوە. ڕەنگە ئەمە سیفەتە هەرە گەورە و دەگمەنەکەی بێت.

**سەرچاوە:**


ماڵپەڕی ئیلاف ١ ئابی ٢٠١٢، لاپەڕەی ڕۆشنبیری ڕۆژنامەی الشرق الاوسط ٥ ئابی ٢٠١٢، ڕۆژنامەی مەدا ١٢ ئابی ٢٠١٢.

# رۆجێ گارودی.. نووسەرێك زۆر بێدەنگماڵئاوایی لێکردین

ئامادەکردنی: هەورامان وریا قانع

رۆجێ گارودی ئەو نووسەرەی کە سەردەمانێک دنیای بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، ببووە میوانێکی بەردەوامی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ناوێکی دیاری نێو ناوەندەکانی فیکر و مەعریفە، بەتایبەتی لە ساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی بیستەم. هەروەها ببووە یەکێک لەو بیرمەندانەی بەردەوام لە ئاین و ئایدۆلۆژیایەکەوە، دەیگوازتەوە بۆ ئاین و ئایدۆلۆژیایەکی دیکە، لەم هەڵوێستی سیاسییەوە دەپەڕییەوە بۆ ئەو هەڵوێستی سیاسی و بەدرێژایی ژیانی خەریکی ئەم جۆرە بازبازێنانە بوو. ئەو لە کاسۆلیکیەتەوە گواستییەوە بۆ پرۆتستانتیەت، لە پرۆتستانتیەتەوە بۆ کۆمۆنیستی و لەوێشەوە بۆ ئیسلام و لە ئیسلامیشەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە هەمو ئوسوڵییە پەڕگیرەکان. ئەم گۆڕانکارییانە وایکرد وەک دەڵێن سەری لە هەمووان تێکدا و کەس بە دروستی نەزانێت ئەم نووسەرە چییە



رۆجێ گارودی

و چی دەوێت و چۆن بیردەکاتەوە.
بەڵام مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، ئەو ڕاستییە ڕوون و ئاشکرایە ناشارێتەوە کە دوای نزیکەی سەد ساڵ تەمەن و دوای ژیانێکی پڕ لە کتێب و نووسین، بە هێمنیەکی گەورە و بە بێدەنگییەکی گەورەتر و زۆر بە ئەسپایی کۆچی دوایی کرد. ئاخۆ مرۆڤێک زیاد لە نیو سەدەی ژیانی بۆ کتیب و سیاسەت و فیکر تەرخانکردبێت، شایەنی ئەو عەبا ڕەشەی بێدەنگییە کە درا بەسەریدا یاخود تێوەپێچرا؟ تۆ بڵێی ئەم پیاوە لە مێژووی خەبات و تێکۆشانی و لە نێو هەزاران لاپەڕەی کتێبەکانییەوە، شتێکی ئەوتۆی تێدانەبێت کە وا بکات هیچ نەبێت هەواڵی مردنەکەی بەو شێوە ترسناکەی بێدەنگی تێنەپەڕێت؟ ئایا کەسێک خاوەنی زیاد لە پەنجا کتێب بێت، لەوانە ماتریالیزم چییە، ئیسلام و خۆرئاوا، لە پێناو گفتوگۆی شارستانییەتەکان، گەشەکردن و پاشەکشەکردنی ئیسلام...هتد، بایی ئەوەندە خزمەتی بە مرۆڤایەتی و فیکر و جیهانی کتێب نەکردووە، کە وامان لێبکات هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەین و شتێک لەسەر ژیان و مردنەکەی بنوسین؟
ئاخۆ دەبێ ئەم بیرمەندە کێ بێت کە سەرەتا وەک ڕەشەبا هات و سەرنجی هەموانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کەچی دواجار لەناو تابوتی بێدەنگیدا بەخاک سپێردر؟
لێرەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە، پانۆرامایەکی گشتی سەبارەت بە ژیانی و قۆناغ یان وێستگە گرنگەکانی ژیانی دەخەینەڕوو.
رۆجێ گارودی ساڵی ١٩١٣ لە شاری مەرسیلیای فەرەنسی لە دایکێکی کاسۆلیک و باوکێکی کافر لەدایک بووە و ساڵی ٢٠١٢ دوای ژیانێکی پڕ کتێب و نووسین و هەڵبەز و دابەزی فیکری و سیاسی و لە تەمەنی ٩٩ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. یەکەم وێستگەی گرنگی ژیانی ئەم نووسەرە، لە تەمەنی چواردە ساڵیدا دەستپێدەکات، لەو تەمەنە بچوکەی منداڵیدا مەزهەبی خۆی لە کاسۆلیکەوە گۆڕی بۆ پرۆتستانت

# ROGER GARAUDY

که مەزهەبێکی کراوەتر و عەقڵانیترە. دواتر لە هەردوو زانکۆی مارسیلیا و ئێکس ئان پرۆڤانس خوێندویەتی. پاشان لە بیستەکانی تەمەنی پەیوەندی دەکات بە ڕیزەکانی حیزبی شوعی فەرەنسییەوە، ئەم پەیوەندی کردنە دووەم وێستگەی گرنگی ژیانی دەبێت، لەوێدا لە دنیای مارکسیزم و تێزەکانی ئەم فەیلەسوفە نزیکدەبێتەوە و ئاشنایەتیەکی گەورەی لەگەڵدا پەیدا دەکات. لە ڕاسیتدا ئەم ئاشنایەتییە شێوەیەکی پەڕگیر و تاڕادەیەکی زۆر کوێرانە لەخۆدەگرێت و زیاد لە سی ساڵی تەمەنی بۆ تەرخان دەکات. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە ئەم ئاشنایەتییەی پەلدەهاوێت بۆ سەرسامبونی بە سەرکردە کۆمۆنیستیەکانی ئەو ڕۆژگارەی یەکێتی سۆڤیەت، لە بابەتی ستالین، تەنانەت لە یەکێک لە قسەکانیدا دەڵێ: (من لە تەوقی سەرمەوە تاکو بنی پێم پیاوێکی ستالینیم!). لە میانەی جەنگی دووەمی جیهانیدا و لە نێوان ساڵانی ١٩٤٢ – ١٩٤٤ لە جەزائیر وەک دیلێکی جەنگ دەگیرێت، دواتر ئازاد دەکرێ و لە ساڵی ١٩٤٥ دەبێتە ئەندامی پەرلەمانی فەرەنسا. سێیەم وێستگەی گرنگی ژیانی لە ساڵی ١٩٥٣ دەستپێدەکات، کاتێ لەو ساڵەدا لە زانکۆی سۆربۆن بڕوانامەی دکتۆرا لەسەر تیۆرەی ماتریالیزم لە مەعریفەدا وەردەگرێت. ساڵی دواتر، واتە ١٩٥٤ لە یەکێتی سۆڤیەت و لە زانکۆی مۆسکۆ، لەسەر مەسەلەی ئازادی، دووەم بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت. دواتر لە ساڵی ١٩٧٠ لە ڕیزەکانی حیزبی شوعی فەرەنسی دەردەکرێت، هۆکاری ئەم دەرکردنەی بۆ ڕەخنە بەردەوامەکانی لە سیاسەت و دەسەڵاتدارانی کرێملن دەگەڕێتەوە. نووسینە ڕەخنەییەکانی لە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت و پاشان دەرکردنەکەی لە حیزب، بە چوارەم وێستگەی گرنی ژیانی دادەنرێت. گارودی هەر لەو ساڵەدا، ١٩٧٠ ناوەندی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی مارکسیزمی دامەزراند و بۆ ماوەی دە ساڵ وەک بەڕێوەبەری ناوەندەکە مایەوە. ئەم نوسەرە لەبەر ئەوەی لە شەستەکاندا ئەندامی دانوسانی مەسیحی – کۆمۆنیستی بوو، هەستیکرد بەلای ئایندا نزیکدەبێتەوە و لە ساڵانی حەفتاکاندا،












هەوڵیدا کاسۆلیکیەت و کۆمۆنیزم پێکەوە کۆبکاتەوە، هەر لەو ماوەیەدا مەیلی بەلای ئیسلامدا زیاتر دەبێت.
لێرەوە پێنجەم وێستگەی گرنگی ژیانی دەستپێدەکات، ئەویش بریتیە لە ڕاگەیاندنی ئیسلامبوونی. گارودی دوای تەمەنێکی تاڕادەیەک درێژ لە ساڵی ١٩٨٢، واتە لە تەمەنی ٦٩ ساڵیدا، لە سەنتەری ئیسلامی لە جنێف، ڕایدەگەیەنێت کە هاتووەتە سەر ئاینی ئیسلام، چونکە ئیسلام لەگەڵ ئەو بەهای یەکسانی و دادپەروەریە کۆمەڵایەتییەدا دەگونجێت کە باوەڕی پێیەتی، هەروەها پێیوابوو خۆی لەگەڵ ئیسلامدا تەباو گونجاوە. ئەمەش دوای ئەوەی زیاد لە چل ساڵی تەمەنی لە مارکسیزم و ڕیزەکانی حیزبی شوعی فەرەنسیدا بردەسەر.
ساڵی ١٩٩٨ دادگــای فەرەنسا بـڕیـاری ساڵێک زیندانیکردن بۆ گارودی دەردەکات، لەگەڵ جێبەجێ نەکردنی بڕیارەکە. هۆکاری دەرکردنی ئەو بڕیارە بۆ ئەو کتێبەی گارودی دەگەڕێتەوە کە سەبارەت بە هۆلۆکۆستی جولەکەکان بڵاویکردبووەوە، کتێبەکە ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتبوو: (ئەفسانەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل). نووسەر لەو کتێبەدا گومان لە مەسەلەی هۆلۆکۆست دەکات، بەتایبەتی گومان لە ڕاستی ئەو ژمارانە دەکات کە باس لە کوژرانی مەلاین جوولەکە دەکەن لە ژوورەکانی گاز، لەسەر دەستی نازییەکان.
یەکێک لە کتێبە هەرە نایابەکانی ئەم بیرمەندە، کتێبی (فێندەمێنیتاڵیزمەکانی سـەردەم: هۆکار و دەرکەوتەکانی). گـارودی لەو کتێبەدا باس لە دوو جۆر لە فێندەمێنیتاڵیزم دەکات کە بریتین لە فێندەمێنیتاڵیزمی خۆرئاوا و فێندەمێنیتاڵیزمی ئیسلامی. ئەوەی خۆرئاوا بۆ چوار جۆر دابەشدەکات کـە بریتین لـە فێندەمێنیتاڵیزمی زانستی (الاصولیە العلمیە)، فێندەمێنیتاڵیزمی ستالینی، فێندەمێنیتاڵیزمی ڤاتیکان، فێندەمێنیتاڵیزمی جوولەکە. ئەوەی ئیسلامیش بۆ سێ جۆر دابەشدەکات کـە بریتین لـە فێندەمێنیتاڵیزمی جـەزائـیـری، فێندەمێنیتاڵیزمی ئێرانی، فێندەمێنیتاڵیزمی سعودی و ئیخوان موسلمینەکان.
گارودی دواتر باس لە کۆمەڵێ خاڵی هاوبەش دەکات کە هەموو ئوسوڵییەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە، باس لەوە دەکات هەرچەندە فێندەمێنیتاڵیزمەکان جۆرێک لە جیاوازی و لێکنەچونیان هەبێت، وا دەربکەون کە لەگەڵ یەک ناکۆک و ناتەبان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندین خاڵی جەوهەری هاوبەشیان هەیە کە تێیدا هەمویان لەیەکدەچن و وەک یەک بیردەکەنەوە،












لەوانە:

١- هەمو ئوسوڵییەکان پێیانوایە خۆیان مەهدی چاوەڕوانکراون کە مرۆڤایەتی ڕزگار دەکات.

٢- بانگەشەکردن بۆ ئەوەی حەقیقەتی ڕەهای ئاین و فیکر لای ئەوانە قۆرخی دەکـەن و بەناوی ئەو حەقیقەتی ڕەهایەوە قسە دەکەن. ئەمەش مانای وایە یەزدان ئەو حەقیقەتەی تەنها بەوان بەخشیوە.

٣- دژایەتییان بۆ مەسەلەی دیموکراسی و سوربونیان لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەوی دیکە.

٤- بەیاساکردنی توندوتیژی و پاساوهێنانەوەی بۆ بەکارهێنانی دژ بەوانی دیکە.

٥- بەکارهێنانی لۆژیکی موئامەرە و دروستکردن و داتاشینی نەیار و دوژمن.

٦- ژیان لە ڕابردودا و هێنانی ئەو ڕابردووە بۆ ئێستا بەو پێیەی وەڵامێکە بۆ ئێستا.

فێندەمێنیتاڵیزمی ئێرانی، شۆڕشێکی هێنا پێچەوانەی مێژوو، بەشێکی ئەو شۆڕشە وەڵامێک بوو بۆ هەیمەنەی خۆرئاوا و سروشتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کێشەکانی دونیادا. ئەو هەیمەنەیە و ئەو جۆرە مامەڵەیە، لە زۆر شوێنی دنیادا پەرچەکردارێکی سیاسی توندی خوڵقاند کە خۆی لە ڕەتکردنەوەیەکی تەواوەتی شارستانیەتی بۆگەنی خۆرئاوادا دەبینی، سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی ئێران بەو شێوەیە دەرکـەوت تا دەگاتە ڕۆژی ئەمڕۆ. ئەو شۆڕشە وا خۆیدەردەخات کە شۆڕشێکە دژ بە شارستانیەت و پێشکەوتنی مـرۆڤـایـەتـی، لەگەڵیدا بەهاکانی خـۆرئـاواش. گەشەکردنی ئەم جۆرەی فێندەمێنیتاڵیزم لە میانەی پشتبەستنی بوو بە کەلتورێکی ئاینی کە خۆی لە پرنسیپی ئیمامەتی شیعیدا دەبینێت کە دواتر لەسەر دەستی خومەینی دەبێت بە ویلایەتی فوقەها. ئەم جـۆرە ویلایەتە هاوتەرییە بـەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باو بوو، ئەوەی لە مەسیحییەتدا پاپا نوێنەری سێبەری خودایە لەسەر زەوی.

فێندەمێنیتاڵیزمی سعودی و ئیخوان موسلیمینەکان، لە دروشمی (ئیسلام چارەسەرە) دەستپێدەکەن، ئەم دروشمە لەسەر گەڕانەوە بۆ کەلتورێکی جێگیری ڕەقهەڵاتوو بەندە، کە فێندەمێنیتاڵیزمی سعودی لە میانەی ڕێزگرتنێکی بێ قەید و شەرت بۆ حاکمەکان کارییێدەکات و حاکمەکان وەک قـەدری خـودا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا وێنادەکات.

فێندەمێنیتاڵیزمی ئیخوان موسلمین، ئەوانیش بانگەوازەکەیان بۆ گەڕاندنەوەی سیستمی خەلافەتی ئیسلامی ناشارنەوە کە جاران لە ئارادا بوو، پێش ئـەوەی کەمال ئەتاتورک لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا هەڵیبوەشێنێتەوە. چونکە ئەوانیش پێیان وایە خەلیفە وەکیلی خودایە لەسەر زەوی، دروست وەک ئەوەی پاپاکان دەیانوت.

دواجار ئەوەی ڕۆجێ گارودی دەربارەی نەخۆشییەکانی جیهانی ئیسلامی ئێستا و چەقبەستنی نوسیویەتی، بۆ ئێمە زۆر سودبەخشە و پێویستە بیخوێنینەوە تاکو کەڵکی لێوەرگرین و هەوڵدەین لەو قوڕاوە دەرچین کە دوای چونە ژورەوە بۆ سەردەمی داڕمان، سەردەمی دووبارەبونەوە و ڕاکێشان، تێیکەوتوین. خۆزگە ژمارەیەکی زۆری موسڵمانمان بە قەبارە و چۆنایەتی ڕۆجێ گارودی دەبوو! ئەگەر ئەوە ڕوییدایە، ئەوا دونیا هەزارجار سەلامەت دەبوو و جیهانی ئیسلامیش عەیامێک بوو گەشتبووەوە بە کاروانی شارستانیەت.

## سەرچاوە:

ماڵپەڕەکانی ویکیپیدیا و ئەلجەزیرە نیت، نوسینێکی د. محمد صبری خلیل لـە ماڵپەڕی www.sudanile.com، نوسینێکی هاشم ساڵح لە ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، ١٨ حوزەیران، ٢٠١٢.

# ئەخلاق و بەهاکان
# لە گاتاکانی زەردەشت دا

د. خەسرەو خەزاعی
لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

ئەو گزنگ و هێزانە کە زەردەشت لە گاتاکان دا باسیان دەکات، نە پەند و ئاموژگارین و نە ئەمر و دەستوورن. بەڵکوو دیاردەکانی جیهانی هەستین کە زەردەشت لە پانتایی ئەندێشەی بێ سنووری خۆی دا ناسیونی و بۆ مرۆڤ بە دیاری هێنا، تا خەڵک بتوانن بەپێی ئەم هێزانە باوەڕ و جیهانبینی خۆیان بسازن.

ژنان و پیاوان بەتەواوی ئازادن کە بیری زەردەشت قەبووڵ یان ڕەت بکەنەوە. قەبووڵ کردن «سەواب» نییە و ڕەتکردنەوە «گوناه» نییە. چونکە ئەم دوو وشەیە لە گاتاکان دا بەکار نەهاتوون. بەپێچەوانەوە، گاتاکان بەردەوام باسی خۆڕێکخستن لەگەڵ یاسای ڕاستی و دژایەتی لەگەڵ درۆ دەکات.



د. خەسرەو خەزاعی

ئازادی هەڵبژاردنی ڕێکەوتن لەگەڵ ڕاستی، یان یەکگرتن لەگەڵ درۆ، وەها هێزێکی ئەکتیڤ و چارەنوسساز بە هەر ژن و پیاوێک دەبەخشێ، کە بتوانێ خۆی چارەنووسی خۆی بسازێ و مرۆڤێکی بەرپرس بێت کە لە درێژەی ژیان دا بەرپرسایەتی ڕەفتار و کرداری خۆی بەئەستۆ بگرێت.

«ئاهورای مەزن
بەجۆرێک ئایینی هەستی داڕشتووە
کە تەنیا کەسانێک دەتوانن بەختەوەر بن
کە بەختەوەری بە خەڵکی تر ببەخشن...
چونکە کەسێک دەتوانی لە باشترین ژیان بەهرەمەند بێت
کە بەرەو ڕووناکی بڕوا و ژیانی خەڵک ڕووناک بکات.»

گاتاکان،
سروودی هەشتم، بەندی ١ و ٢.

ڕاهێنانی زەردەشت بەپێی بزواندنی ئەندێشە، بەکارهێنانی مێشک و نوێکردنەوە و بەرین کردنەوەی ڕوانگەی مرۆڤ لەئاست ژیان داڕێژراوە. شێوازێک کە زەردەشتی مەزن لە گاتاکان دا بەکاری هێناوە بریتییە لە شێوازی «پرسیار و وەڵام».
ئەو هیچ شتێ لەخۆڕا قەبوڵ ناکات، تا بە ئەقڵی خۆی لێی تێنەگات. هەروەها بۆ تێگەیشتن لە دروستی و نادروستی هەر شتێک، هەر لە سادەترین ڕووداوی ژیانەوە، تا مەزنترین دیاردەی هەستی، بەردەوام «دەپرسێ» و دەپرسێ» و دیسان «دەپرسێ»، وە تا بە وەڵام نەگات ئارام ناگرێت.

ئەو دەزانــێ کە نابێ هیچ شتێ لە تاریکی دا بمێنێتەوە. چونکە تاریکی ئەندێشە تووشی ئاڵۆزی دەکا و دەرگای درۆ و پڕووپووچ دەکاتەوە. زەردەشت لە تێکڕای سروودی نۆهەمی گاتاکان دا پرسیار دەکا و وەڵامی دەوێ، لە هەموو گاتاکان دا نزیکەی ١٠٠ پرسیاری ورووژاندووە.

بەڵام زەردەشت پرسیار لە کێ دەکا و وەڵامی لە کێ دەوێ؟

مێتۆدی ئەو بیرکردنەوە و تێڕامانە، قووڵبوونەوە تا جێگایەک کە مرۆڤ ناتوانێ لەوێ واوەتر بچێ. زەردەشت لە قووڵترین دەڤەری ئەندێشەدایە کە ڕاشکاوانە لەگەڵ ئاهورا مەزدا، سەرچاوەی ئەقڵ، بەرەو ڕوو دەبێ و لەو دەپرسێ و وەڵام وەردەگرێ. ئەو دەیەوێ بزانێ ژیان چییە؟ چ مانایەکی هەیە؟ ژیان بەرەو کام ئاقار دەڕوا؟ ڕازی دارشتنی ژیانێکی بەختەوەر لە چی دایە؟ ڕووداوەکانی ژیان چۆن پێکدێن و لە کوێ سەرچاوە دەگرن؟ ئەو هەموو ئەم پرسیارانە لە ئاهورا مەزدا دەپرسێ و دیسان دەیەوێ بزانێ کێ هەتاو و ئەستێرەکانی و زەمین و مانگی دروست کردووە. کێ ڕاستی و ئەندێشەی پاکی بەدیهێناوە. ئەو دەپرسێ: «ئەی ئاهورا مەزدا، تۆ ئەم جیهانە پڕسەمەر و شادیبەخشەت بۆ کێ ئافراندووە؟» و دیسانیش دەپرسێ: «ئەی ئاهورا مەزدا، سەرچاوەی ژیانێکی بەختەور لە کوێ دایە و چییە پاداشی ئەو کەسە کە بۆ وەها ژیانێک تێدەکۆشی؟» دەپێم بڵێ، دە پێم بڵێ، دە پێم بڵێ ئەی مەزدا ئاهورا!



بەم پرسیارە و وەڵامانەیە کە زەردەشت دیدگای خۆی لەئاستی جیهانی هەستی دەسازێ و بەپێی ئەم دیدگایە بیر و باوەڕی خۆی لە گاتاکان دا

دادەڕێژێ.
بەمجۆرەیە کە لە سەرتاسەری گاتاکان دا بچووکترین پارادوکس و ناکۆکی و هیچ تەم و تاریکیەک بەدی ناکرێ. هەموو شتێ وەک ئاوی کانی ڕوون و زۆڵاڵە و وەک ڕۆژ گەش و ڕوناکە.
زەردەشت کەسێک بە دۆستی خۆی دەزانێ کە یارمەتی کۆڕی موغان بدات؛ هەروەها داوا لە ئاهورا مەزدا دەکات کە یارمەتی بدات تا بتوانێ بەدەر لە کۆڕی موغان وتەکانی خۆی بە گوێی خەڵک بگەیەنێ.
زەردەشت مزگێنی «یانەی یەسنا» دەدات بە کۆڕی موغان کە لە دەقی گاتاکان دا بریتییە لە هەمان بەهەشتی ئاهورایی.
«ئەی مەزدا!
دۆستێکی یەکڕەنگ
کە یارمەتی زەردەشتی سپیتمان دەدات
تەنیا ئەو کەسەیە کە ڕێگەی ڕاستی وەگرتووە و
بە ئارامی گەیشتووە.
وەها کەسێک کە ڕێڕەوی ڕێگەی ڕاستی و
پێڕەوی ئەندێشەی پاکە،
شیاوی ئەوەیە
کە هەڤاڵی ئەنجومەنی موغان بێت».
سرووودی ١٦، بەندی ١١
«ئەی مەزدای باشترین،
بەرەو لام بێ و خۆتم پێ بنوێنە،
تا لەبەر تیشکی ڕاستی و ئەندێشەی پاک دا،
جگە لە کۆڕی موغان
قسەکانم بە گوێی خەڵکی دیکەش بگەیەنم.
بەڵکوو ئەوەی شیاوی ئێمەیە و
ستایشێک کە شیاوی تۆیە
بەئاشکرا ببینین.»
سرووودی ٦، بەندی ٧

«زەردەشت
مزگێنی یانەی یەسنای بە ئەنجومەنی موغان داوە
کە هەر لە سەرەتاوە
ژوانگەی گەیشتن بە ئاهورا مەزدایە.
من ئەم پاداشە بە ئێوە دەدەم
کە لەبەر تیشکی ڕاستی و
ئەندێشەی پاک دا بەدیدێ.»

## سەرچاوە:

گاتاها، سروودهای اهورایی زرتشت، پژوهش دکتر خسرو خزاعی، بلژیک، بروکسل ٢٠٠٦

# ئایا ئیمە بۆ ژیان و مردن ڕاهێنان دەکەین١

له فارسییەوە: جەواد حەیدەری

ئەوەی کە تا ئێستا بە ناوی فێرکردن و پـەروەردە و پێگەیاندن بەڕێوە چووە بە گەورەترین بەدبەختی دەزانم. هەڵبەت بە بیستنی ئەمە ڕەنگە تووشی سەرسوڕمان بـن، چونکە پێتان وایـە کە فێرکردن و پەروەردەکردن نیعمەتێک بێت. بەڵام ئایا دەزانن کە فێرکردن و پەروەردە و پێگەیاندن نەیتوانیوە سەلامەتی و هاوسەنگی بە مرۆڤ ببەخشێت؟

بە پێچەوانەوە هەموو هاوسەنگییەکی لە ژیانی مرۆڤ سەندووە و دەبێ واش بێت، ئەوەی کە ئێمە تا ئێستا بیرمان لێدەکردەوە کە فێرکردن و پەروەردە بێت هەڵە گەلێکی زۆر بنەرەتی تێدا هەیە.

یەکەم هەڵەی بنەڕەتی ئەوەیە ئێمە پێمان وابـوو کـە مـرۆڤ تەنها عەقڵە (intellect). هیچ شتێک لەوە درۆزنتر و هەڵەتر نییە، مرۆڤ تەنها عەقڵ و ئاوەز

نییە و ئەو پەروەردەیەشی کە دەکرێت تەنها لەم بوارەدایە، باقی شتەکانی مرۆڤ دەستی لێنادرێت و بە نوقسانی دەمێنێتەوە.

باقی شتەکانی تری مرۆڤ بە پەروەردەنەکراوی دەمێنێتەوە و تەنها هێزی عەقڵانی ئەو گەشە دەکات ، لە ڕاستیدا وەکو ئەوە وایە هەموو ئەندامانی مرۆڤ بچووک بکرێتەوە و تەنها سەری دەست بکات بە گەشەکردن و گەورەبوون. ئەوجۆرە مرۆڤە مرۆڤێکی ناشیرین دەبێ و ناتوانێ بە ڕێدا بڕوات و ژیان بۆی زۆر سەخت و دژوار دەبێت، چونکە تەنها سەری گەورە بووە و لەگەڵ باقی ئەندامانی تری جەستەیدا هاوسەنگی نییە. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە بە ناوی فێرکردنەوە ڕوویداوە. ئێمە دیاریمان کردووە کە مرۆڤ تەنها عەقڵە، سێ هەزار ساڵە هەموو ئیش و کارێکمان بۆ پەروەردەکردنی عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ ئەنجام داوە. عەقڵ پەروەردە بووە، بەڵام باقی بەشەکانی تری مرۆڤ بە دواکەوتوویی ماوەتەوە، سێ هەزار ساڵە جگە لە عەقڵی مرۆڤ باقی بەشەکانی تری مرۆڤ دواکەوتووە، سێ هەزار ساڵە عەقڵ بەرەو پێشەوە چوو، ئەو کێشە و کەلێنەیە (نێوان عەقڵ و باقی بەشەکانی تری جەستەی مرۆڤ) ئێمەی کوشتووە و ئەمەش بۆتە هۆی پەیدابوونی بارودۆخێکی نالەبار و ئیفلیج. ئەگەر لە مرۆڤێکدا هەموو بەشەکانی لە شوێنی خۆیاندا بن و تەنها چاوی نەبێت دەڵێن تەنها لە بەشێک لە جەستەیدا کەموکورتی هەیە یان بەشێک لە جەستەی ئیفلیجە، ئەگەر مرۆڤێک هەردوو قاچەکەی نەبێت ئێمە پێی دەڵێن ئیفلیج ، جۆرە ئیفلیجییەکی تریش هەیە کە تەنانەت ئێمەش لێی ئاگادار نین، مرۆڤێک کە تەنها دوو قاچی هەبێت نە هیچ شتێکی تر. ئەم کەسە کەسێکی ئیفلیج و ناتەواوە.

فێرکردن و پەروەردە مرۆڤی ساغتر و سەلامەت تر نەکردووە، بەڵکو ئیفلیجی کردووە، چونکە تەنها عەقڵی مرۆڤ پەروەردە کراوە و باقی بەشەکانی تری مرۆڤ گەشەی نەکردووە و پەروەردە نەکراو و وەک خۆی ماوەتەوە. عەقڵ گەورەتر بووە و پەیوەندی لە گەڵ باقی سەرچاوەکانی تری ژیان پچڕاوە.

ئێمە چ فێردەکەین و ڕادەهێنین، بە ناوی پەروەردە و فێرکردنەوە چ شتێک فێردەکەین؟ ئایا هیچ شتێک لەبارەی ژیانەوە فێر دەکەین؟ ئایا بۆ ژیان کردن هیچ فێرکاریەک پێشکەش ئەکەین؟ هەرگیز نا.

ئێمە چەند قسەیەک فێر دەکەین، ئێمە هەندێک بیرکاری فێردەکەین، تۆزێک جوگرافی و مێژوو. بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە لەو ڕێگایەوە چ شت گەلێک فێردەکەین؟ تەنها چەند واژە و وشەیەک.
واژە و وشە و پەیف ژیان نییە، وشەکان لە ژیاندا هەر کامیان بەکارهێنانی خۆیان هەیە، بەڵام فێربوونی وشەکان بە مانای فێربوونی ژیان نییە. ئەو کاتە تەنها کەڵەکەبوونی بەربڵاوی وشەکانە، کەسێکی خوێندەوار لە کۆتاییدا هیچ سەروەت و سامانێکی نییە جگە لە واژە و وشە نەبێت، ئەویش هەروەک گەوجێکی نەخوێندەوار، گەوج و نەفامە. لەنێوان ئەم دوانەدا تەنها یەک جیاوازی هەیە و ئەویش ئەمەیە کە مرۆڤی خوێندەوار لەو خەیاڵ و وەهمەدا دەژی کە گەوج و نەفام و نەزان نییە، ئەو بە هەمان ئەندازە سەبارەت بە لایەنەکانی تری ژیان جاهیل و نەزانە کە مرۆڤە سەرەتاییەکان کە لە دارستانەکاندا دەژیان. ئەو هیچ درک و تێگەیشتنێکی لە هونەری ژیان کردن نییە و بی

ئاگایە لەو ڕێگا و شێوازانەی کە دەیتوانی تێدا بژی. ئەو بە هیچ شێوەیەک شارەزای ژیان نییە، کتێب و کتێبخانە چ پەیوەندییەکی بە ژیانەوە هەیە؟!!

پێویست ناکات دووبارە تووشی هەمان هەڵە ببینەوە و پێمان وابێت کە هەرکەس خوێندەواربوو، شارەزای ژیانیشە. پێویستە ئەوەمان لە بیر بێت کە لە وانەیە ژیان میدالیایەکی گڵی ( میدالیایەک کە لە قوڕ دروستکرابێت) نەدات بەو کەسەی کە لە زانکۆدا میدالیای ئاڵتونی وەرگرتووە.

فێرکردنی وشەکان و واژەکان تەنها کۆکردنەوە و کەڵەکەکردنی وشەکانە، هەڵبەت دەبێتە بارێکی قورس بۆ سەر مێشک، بەڵام نە مێشک ڕزگار دەکات و نە مرۆڤیش وشیار و زیندوو و نە هیچ ڕەسەنایەتێکی ڕوانین و بینین بە ژیان دەبەخشێت و نە هونەری ژیان کردنت فێر دەکات و نە ڕێگەکانی ژیان کردن. تائێستا ئەمە ئەو شتە بووە ناومان ناوە فێرکاری و پەروەردەکردن!.

ئەو مرۆڤە نەخۆش و شێت و دێوانەیەی کە ئەمڕۆ ئێمە دەیبینین دەرئەنجام و دەستکەوتی ئەو پەروەردە و فێرکردنەیە.

ئایا دەزانن بە گەشەکردن و نەشونماکردنی ئەو پەروەردە و فێرکردنە مرۆڤ زیاتر بە لاڕێدا دەبرێت و چەواشە دەکرێت و لە خشتە دەبرێت.

مرۆڤی نەخوێندەوار جۆرێک هاوسەنگی و سەلامەتی هەیە، دروست بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە مرۆڤی خوێندەوار نییەتی. مرۆڤە سەرەتاییەکان کە دارستان نشین بوون جۆرێک لە جوانی و جۆرێک موزیک و ئاواز و خۆشیان هەبوو. لە ژیانی ئەواندا مەبەست و ئامانج هەیە هەر ئەو شتەی کە لە ژیانی مرۆڤی خوێندەواردا نییە. ئەمە زۆر سەرسوڕهێنەرە!!!.

ئایا ئێمە لە پێناو لە دەستدانی شادی و شادمانی، دەخوێنین و خوێندەوار دەبین؟ ئایا توانایی و گونجانی ئێمە بۆ ئەزموونی شادی و خۆشی لە حاڵەتی دابەزین و داکشاندایە؟ ئایا ئێمە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ بنەماکانی ژیان لە دەست دەدەین؟

ئەگەر بە چاوێکی بێ لایەنەوە سەیری مرۆڤی خوێندەوار بکەین ( کە زۆر سەختە چونکە ئێمە خۆشمان خوێندەوارین) زۆر سەختە کە بتوانین نەخۆشییەکانی مرۆڤێکی خوێندەوار ببینین. کاتێک کە ئەو نەخۆشییە لە هەموو شوێنەکان باوە ، دۆزینەوە و دیاریکردنی نەخۆشییەکە زۆر سەخت و دژوارە. هەموومان خوێندەوارین، نەک هەر خوێندەوارین بەڵکو ڕاهێنەر و فێرکەریشین .

ئێمە خەڵکێکین کە هەمان پـــەروەردە و فێرکردن بڵاو دەکەینەوە، هەر بۆیە زۆر سەختە کە بتوانین خۆمان ببینین. زۆر سەخت و دژوار و چەتوونە کە وا بیربکەینەوە ئەو شتەی کە بڵاو پەخشی دەکەینەوە (مەبەست فێرکردنە) ناتوانێ مرۆڤ باش دروست بکات و پەروەردەبکات. بەڵام ئەو کەسانەی کە چاویان هەیە و دەتوانن ببینن و کەسانێک کە بە تێپەڕاندنی ئەو فێرکردنە بتوانن زیرەکی و لێهاتوویی خویان لە دەست نەدەن دەتوانن شت گەلێک ببینن.

ئەمریکا پێشکەوتوو ترین وڵاتـە لەبواری فێرکردنەوە، بـەڵام زۆرتـریـن شێتی دونیا لە ئەمریکایە، ئایا پەیوەندییەک لە نێوانی ئەم دووانەدا هەیە؟؟ یان ئەمە تەنها ڕێکەوتە؟! ئەو وڵاتانەی کە زۆرترین فێرکردن و ڕاهێنانی تێدایە، کێشە و گرفتی زەینی و مێشکیش لەناو ئەواندا بە

هەمان ڕێژە لە بەرزبوونەوەدایە. ئایا ئێمە ئاگامان لەو ئامارانە هەیە یان نا؟

هەر وڵاتێک هەرچەند زیاتر ڕاهێنان و فێرکاری بینیبێت ڕێــژەی خۆکوشتن و خۆکوژییشی زیاترە. هەر لە ئەمریکا ڕۆژانـە لە یەک ملیۆن و نیو بگرە هەتا سێ ملیۆن لە ژێر چارەسەر و چاودێری دەروونیدان. ئەمە ئامارە حکومییەکانن و ئێمە دەزانین کە ئامارە حکومییەکان قەت ڕاست و دروست نین. ئەگەر ڕۆژانە سێ ملیۆن لەژێرچارەسەری و چاودێری پزیشکی دەروونیدا بن، ئەو کات ئێمە دەزانین کە ئەمە مەسەلەیەکی شەخسی و کێشەیەکی شەخسی نییە، بەڵکو جۆرێک نەخۆشی کۆمەڵی و دەستەیی و گرووپییە کە پێی ناوەتە ناو زەین و مێشکی مرۆڤەوە.

لە شاری نیۆیۆرک ٣٠٪ی دانیشتوانی ئەو شارە ناتوانن بە بێ حەبی خەو، بخەون، بە پێی دوایین لێکۆڵینەوە زانستییەکان تا ٥٠ ساڵی تر کەس نییە کە بە بێ خواردنی حەبی خەو بتوانێت بخەوێت.

ئایا ئەمانە ئاسەواری مرۆڤی پێشکەوتووە؟ لەبارەی نیۆیۆرکەوە دەکرێت چی بوترێت؟ تەنانەت شاری بۆمبای لە هیندستانیش لەو بارەیەوە دوا ناکەوێت. ئێمەش شان بە شانی ئەو پێشکەوتنە بـەرەو پێشەوە دەڕۆیـن، ناتوانین خۆمانی لێ بەدوور بگرین، ئێمە زۆر بەخێرایی بەو ئاراستەیە ئەجوڵێین. سەرکردەکانی ئێمە هەموو هەوڵێک دەدەن بۆ ئەوەی ئێمە دوا نەکەوین. هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو سایە و سێبەرە ڕەشە دەروونی و بێ ئۆقرەییەی کە باڵی بەسەر خـۆرئـاوادا کێشاوە چییە؟ خەڵکانێک کە بە درێژی ٣٠٠ ساڵ هەوڵیانداوە ڕۆژئاوا فێربکەن، خەڵکانێکی باش بوون بە نیەتی خێرەوە. ڕەنگە ئەوان شتێکیان لەبارەی سروشتی ژیانەوە نەزانیبێت، لەوانەیە ئـەوان وایـان بیر کردبێتەوە کە ئەگەر تەنها عەقڵی مرۆڤ نەشونما و گەشەبکات ئەوە مرۆڤ خۆشبەخت و بەختەوەر دەبێت. بە دڵنیاییەوە دەبێ عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ گەشە بکات، بەڵام لە گەڵ باقی ئەندامی تری جەستە و بوارەکانی ژیان بە شێوەیەکی هاوسەنگ.

عەقڵی مـرۆڤ دەبـێ لەگەڵ دڵ و وجـود و سەلامەتی گەشە و نەشونما بکات. ئەگەر بە تەنیایی گەشە بکات بێ گومان مەترسی بەدی دەهێنێت و مەترسی لێدەکەوێتەوە.

ژیـان پڕە لە ڕاز و نهێنی کە هیچ یاسا و ڕێسایەکی بیرکاری لە توانای دا نییە وەسفی بکات. هیچ ژمارەیەک، هیچ ئامارێک ناتوانێت چارەسەری ژیان بکات، بەڵام عەقڵ بوونی هیچ ڕاز و سڕ و نهێنییەک قەبوڵ ناکات. عەقل پێی وایە هەموو شت سادە و ڕاستەوخۆیە هەروەک چۆن (٢+ ٢ = ٤)

هەر ئەم ئاراستە و ڕوانگە و تێروانینە غەیرە نهێنییە (non- mysterious) و بێ هەستەی عەقڵ بۆ ژیان، وای کردووە کە ژیان ببێتە شتێکی میکانیکی. مرۆڤ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ شێوەی یەک مەکینە وەردەگرێت، کاتێک کە مرۆڤ ببێت بە مەکینە، ئەوکات ئەو بە لێهاتوو و کارامە دەزانین. مەکینە هەمیشە لە مرۆڤێک کارامەترە. ئەگەر ئێمە تەنها جەخت لەسەر کارامەیی بکەین، ئەوا ڕۆژێک مرۆڤیش وەک مەکینەیەکی کارامەی لێدێت، بـەڵام ڕۆح و هەستی خۆی لە دەست دەدات. مرۆڤ هەڵە دەکات، بەڵام مەکینە هەڵە ناکات. ئێمە بە شوێن مرۆڤێکدا دەگەڕێن کە هەڵە

نەکات، کەسێک کە بە تەواوەتی کارامە بێت، کەسێک کە لەگەڵ هێڵە بێ گومانەکانی بیرکاریدا ئەجولێت، ڕۆیشتن بە دوای هێڵەکانی بیرکاری، وەک شەمەندەفەرێک وایە کە بەسەر ڕێگای ئاسنیندا ئەڕوات. بەڵام ڕووبارەکانی ژیان بەسەر ڕێگای ئاسنیندا ناڕوات، بەڵکوو بەسەر شەقامی نەناسراو و ڕێگای نەناسراودا ئەڕوات. ڕووباری ژیان وەها سەربەست و ئازادە کە ناتوانێت لە ناو پێکهاتەی جێگیر و سابتی عەقڵدا بگونجێت، بەڵام ئەوە کارێکە کە ئێمە تا ئێستا ئەنجامانداوە.

هەربۆیە یەکەمین شتێک کە گەرەکمە بە ئێوەی بڵێم ئەوەیە کە فێرکردن و ڕاهێنانی عەقڵ، نەژیرانە و نە زیرەکانەیە.

ژیان کۆمەڵێک لایەنی تری هەیە کە گرنگی ئەوان لە عەقڵ زیاترە. مرۆڤ تەنها بە عەقڵەوە زیندوو نییە، سەرچاوەکانی ژیانی مرۆڤ زۆر قوڵترە لە عەقڵ. ئێمە نە لە ڕێگەی عەقڵەوە خۆشەویستی دەکەین و نە لە ڕێگەی عەقڵەوە توڕە دەبین و نە بێزاریش دەبین. ئێمە لە ڕێگەی عەقڵەوە هەست بە جوانی ناکەین و جوانی و قەشەنگی درک ناکەین، نە لە ڕێگەی عەقڵەوە شیعر و گۆرانی دەڵێین، هیچ ئەزمونێکی تری ژیان لە ڕێگەی عەقڵەوە بە دەست نایەت و دەستناکەوێت.

سەیر نیە ئەگەر پەروەردەکردنی عەقڵانی بە تەنیا، ڕێگەی لە تاقیکردنەوەی ئەزمونی قوڵتری مرۆڤ گرتووە و دووری خستۆتەوە. بەڵام تەنها عەقڵمان پەروەردە کردووە.

ئەو جۆرە ڕاهێنانە بۆتە هۆی سەرهەڵدان و پەیدابوونی مرۆڤێک کە هاوسەنگی نییە و وەها مرۆڤێک هەموو کارێک ئەنجام دەدات، هەموو شتێکی لێدەوەشێتەوە، دەتوانێت هەموو جۆرە کێشە و گرفتێک دروست بکات. ئەم کێشە و دەردەسەریانە دەبێ ڕوو بدەن. چونکە کەسێک کە لە باری دەروونییەوە هاوسەنگی نەبێت، کردار و هەڵسوکەوتی دەرەوەشی نا هەماهەنگ و ناهاوسەنگ دەبێت. ئەوکات جوڵەیەک بوونی نییە و ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرا لە ئارادا نیە، موزیک و مۆسیقایەک بوونی نییە، ژیان هیچ دەنگ و ئاوازێکی نییە.

ئەمە یەکەمین بەدبەختی و چارەڕەشی ئێمەیە، ئێمە تێگەیشتین کە پەروەردە و فێرکردن یانی ڕاهێنانی هێزە عەقڵییەکان، نەک ڕاهێنان و فێرکردنی هەموو لایەنەکانی ژیان، ڕاهێنان و فێرکردنی هەموو لایەنەکانی ژیان، واتاگەلێکی تری دەبێت.

## سەرچاوە/

منتخبی از مجلەی اشو تایمز_ نسخە ی آسیایی ، ژوئن ٢٠٠٠

# چیت لێدەمێنێتەوە، برتۆڵت١

میلان کۆندێرا
لەئینگلیزییەوە: خەزاڵ

لە نیسانی ساڵی ١٩٩٩ دا هەفتانەیەکی پاریسی (یەکێ لە هەفتانە جدییەکان) بەشێکی تایبەتی بڵاوکردەوە لەبارەی بلیمەتەکانی سەدە. هەژدە کەس لە لیستی ڕێزلێنراوەکان بوون: کۆکۆ شانێل، ماریا کالاس، سیگمۆند فرۆید، ماری کوری، ئیڤ سان لۆران، لو کۆربۆزییە، ئەلیکساندەر فلێمینگ، ڕۆبێرت ئۆپنهایمەر، ڕۆکفێلەر، ستانلی کوبریک، بیل گەیتس، پابلۆ پیکاسۆ، هێنری فۆرد، ئەلبێرت ئەنێشتاین، ڕۆبێرت نۆیس، ئیدوارد تێلەر، تۆماس ئەدیسۆن، ج. پ. مۆرگان. کەواتە : لیستەکە هیچ ڕۆماننوس و شاعیر و شانۆنامەنوس و فەیلەسوفێکی تێدانەبوو، یەک ئەندازیاری بیناسازیی و یەک شێوەکار، بەڵام دوو کۆتور دیزاینەر، یەک

گۆرانیبێژ، هیچ ئاوازدانەرێک، تاکە فیلمسازێک (کە ڕۆژنامەنوسەکانی پاریس، کوبریکیان هەڵبژاردبوو بەسەر ئایزنیشتاین و چاپلین و بێرگمان و فیللینی دا). ئەم لیستەی ڕێزلێنانە شتێک نەبوو کە خەڵکی نەزان دروستیانکردبێ. بەڕوونییەکی زۆرەوە گۆڕانێکی ڕاستەقینەی ڕاگەیاند: پەیوەندی نوێی ئەوروپا بە ئەدەب، بە فەلسەفە، بە هونەر.
ئـایا کەسایەتییە گـەورەکـانـی ڕۆشنبیریی لەبیرکرابوون؟ "لەبیرکرابوون" وشە ڕاستەکە نیە. بیرمدێت لەهەمان مـاوەدا، نزیک کۆتایی سەدە، ببووین بە ژێر لێشاوی مۆنۆگراف* لەبارەی: گراهام گرین، ئێرنیست هەمەنگوای، ت.س. ئێلیۆت، فیلیپ لارکین، برتۆلت برێخت، مارتین هایدگەر، پابلۆ پیکاسۆ، ئۆژین یونیسکۆ، ئیمیل سیۆران و چەندانی بێشوماری دی.

ئەم نوسینە دوژمنکارانانە (بە پێزانینەوە بۆ کرێیگ ڕێین بۆ بەگریکردن لە ئیلیۆت هەروەها مارتین ئامیس کە لەبارەی لارکینەوە نوسیوێتی) مانای ئەو لیستی ڕێزلێنانەیان ڕوونکردەوە: بلیمەتەکانی ڕۆشنبیریی بێ پەشیمانی وەلانرابوون؛ دڵنەواییکەرە کە کۆکۆ شانێل و پاکێتیی کراسەکانی هەڵبژێریت بەسەر ئەو کەڵە کەسایەتییانەی ڕۆشنبیریدا کە هەموویان لەکەداربوون بە خراپە و ناپەسەندیی و تاوانەکانی ئەو سەدەیەوە. ئەوروپا بەرەو سەردەمی داواکارە گشتییەکان دەچوو: ئەوروپا چیدی خۆشنەویسترا، ئەوروپا چیدی خۆی خۆشنەویست.

ئایا ئەوە مانای ئەوەیە هەموو مۆنۆگرافەکان بەتایبەتی توند بوون دژی نوسینەکانی ئەو نوسەرانەی کە باسکرابوون؟ ئۆ، نەء؛ لەوکاتەدا هونەر برەوی خۆی لەدەستدابوو، پرۆفیسۆر و شارەزاکان چیدی گرنگییان بە تابلۆ و کتێبەکان نـەدەدا، تەنها گرنگییان بەو کەسانە دەدا کە بەرهەمیان هێنابوون؛ گرنگییان بە ژیانیان دەدا.
لەزەمەنی داواکارە گشتییەکاندا ژیانێک مانای چیە؟ بەدوای یەکداهاتنێکی دوورودرێژی ئەو ڕووداوانەیە کە ڕوواڵـەتـە خەڵەتێنەرەکەی بۆ ئەوەیە گوناه بشاردرێتەوە.


برتۆڵت برێخت

بۆ ئەوەی گوناه لەژێر ماسکەکەیدا هەڵبماڵێت، نوسەری مۆنۆگرافەکە دەبێ بەهرەی پۆلیسی نهێنی هەبێت و تۆڕێکی لە سیخوڕان هەبێت. بۆ ئەوەش کە پایەی بەشکۆی خۆی وەک شارەزایەک لەدەستنەدات، دەبێ ناوی سیخوڕەکانی لە پەراوێزەکانیدا ببات، چونکە لەچاوی لێکۆڵەردا ئەم کارە قسەوقسەلۆک دەگۆڕێ بۆ حەقیقەت.
کتێبێکی قەبەی هەشت سەد لاپەڕەیی دەکەمەوە لەبارەی برتۆڵت برێخت نووسراوە. نوسەرەکەی، پرۆفیسۆرێکی ئەدەبی بەراوردکارییە، پاش ئەوەی بە وردیی خراپییەکانی ڕۆحی برێخت دەخاتە ڕوو ( هۆمۆسێکسوالێتی نهێنی، خووی ئالۆش، چەوساندنەوەی کچەهاوڕێکانی (یارەکانی) کە نوسەری ڕاستەقینەی شانۆنامەکانی بوون، هاوسۆزی لایەنگیرانەی بۆ ستالین، مەیلی درۆکردن، چاوچنۆکی، دڵێکی ڕەق)، لە کۆتاییدا لە بەشی ٤٥ دا دەگاتە ئەوەی باسی جەستەی برێخت بکا، بەتایبەتی بۆنە ناخۆشەکەی، کە پرۆفیسۆرەکە پەرەگرافێکی تەواو بە وەسفکردنی تەواودەکات. وەک زامنکەری سروشتی زانایانەی کەشفی ئەو بۆنکردنە، لە پەراوێزێکدا بۆ ئەو بەشە نوسەر دەڵێت "ئەو وردەکاریی وەسفکردنەی لە ڤێرا تێنشێت دەستکەوتووە، ئەو ئافرەتەی کە لەوکاتەدا سەرۆکی بەشی لابۆری فۆتۆی ((**Berliner Ensemble بووە،" کە نوسەر لە پێنجی حوزەیرانی ١٩٨٥ چاوپێکەوتنی لەگەڵداکردووە ، (کە دەکاتە ٣٠ ساڵ پاش ئەوەی ئەو برادەرە بۆن ناخۆشە لەناو کفنەکەیدا ڕاکشاوە.)

ئاه، برتۆڵت، چیت لێدەمێنێتەوە؟
بۆنی ناخۆشی جەستەت، کە بۆ ٣٠ ساڵ لەلایەن هاوکارە دڵسۆزەکەت پارێزراوەو دواتر زیندووکراوەتەوە لەلایەن زانایەکەوە، دوای ئەوەی بە میتۆدی مۆدێرنەی لابۆرەکانی زانکۆوە چڕیکردۆتەوە، ئێستا ناردوویەتی بۆ دوارۆژی هەزارەکەمان.

* مۆنۆگراف: ئەو نوسینەیە کە لەبارەی تاکە بابەتێکەوە لەلایەن یەک نوسەرەوە دەنوسرێ، دەکرێ لە شێوەی وتار یان لێکۆڵینەوەوە بێت.

** Berliner Ensemble : کۆمپانیایەکی شانۆی ئەڵمانییە کە برتۆڵت برێخت و هێلین ویگڵی هاوسەری لە ساڵی ١٩٤٩ لە بەرلینی ڕۆژهەلات دایانمەزراند.

### سەرچاوە:

Encounter Essays by Milan Kundera




## ئیسلام و دیموکراسی

ئەم کتێبە جگە لە پێشەکی وەرگێڕی کتێبەکە، بریتییە لە ١٢ وتاری جیاواز جیاواز کە لەلایەن کۆمەڵێ نوسەری بیانی و عەرەبییەوە نوسراون، لەوانە گراهام فۆللەر، رۆجێ گارودی، جەمال بەننا، محەمەد عابد ئەلجابری...هتد. کۆی وتارەکان باس لە ئیسلام وەک ئاین و ئیسلامی سیاسی وەک رێخراوێکی حیزبی خاوەن کۆمەڵێ بەرژەوەندی و تێزی تایبەت بە ئیسلام دەکەن. ئەوەی تەواوی ئەم وتارانە کۆدەکاتەوە، ئەوەیە بەجۆرێک باس لە ئاینی ئیسلام دەکات کە ئاینێکی نەرم و میهرەبانە و دوورە لە توندوتیژی و کوشتن و خوێنرشتنەوە، وەک ئەوەی لەسەر دەستی هەندێ گروپی توندڕەوی ئیسلامی دەیبینین. لەم کتێبەدا بەو ڕاستییە دەگەین کە ئاین لە بنەڕەتدا بۆ برایەتی و ئاشتی و پێکەوەژیان هاتوەتەخوارەوە، ئاین هەرگیز مەبەستی نانەوەی پەشێوی و دووبەرەکی و ئاژاوە نییە کە لەمڕۆدا لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی بەهۆی هەڵە تێگەشتنەوە لە ئاین، بەرقەرارە.

ئەوەی ئاین پێماندەبەخشێت، جیاوازە لەوەی ئیسلامی سیاسی لە تایپە توندڕەوەکەیدا داوای دەکات، ئاین پێمان دەڵێ برابن و پشتی یەک بگرن، ئیسلامی سیاسی دەڵێ ئەوەی وەک من بیرنەکاتەوە و ڕێنماییەکانی من پیادە نەکات، نەک

برام نییە، بەڵکو نەیار و تەنانەت دوژمنمە. لە قورئاندا باس لەوە دەکرێت کە هەرکەس لەسەر ئاینی خۆی و (لا اکراه فی دین)، کەچی لە ئیسلامی سیاسی توندڕەودا دەڵێ تەنها من ڕاستم و تەنها بۆچونەکانی من ڕاستن و ئەوەی وەک من بیرنەکاتەوە، ئەوا لە ڕێبازی حەقیقەت لایداوە و بووە بە گومڕاو لادەر لە ڕێی ڕاست.

خاڵێکی گرنگ و بایەخداری دیکەی ئەم کتێبە لەوەدایە ئەوانەی وتارەکانیان نوسیوە، بۆخۆیان کەسانی ئاین و ئیمانداران، واتە کەسانێکن سەر بە کەلتوری ئیسلامی و کار بۆ گەشەکردن و پێشخستنی ئەو کەلتورە دەکەن، بەڵام ئەم کارکردنە لەسەر بنچینەی بەگەڕخستنی عەقڵ و لۆژیکە، نەک لەسەر بنچینەی خورافەت و غەیبیانیەت. ئەوەتا جەمال بەننا لە وتاری (ڕیفۆرمی ئایینی - ئیسلامی و قۆناغی پۆست سەلەفیزم) دەڵێ: (گرنگترین شت ئەوەیە عەقڵی خۆمان وەگەڕ بخەین، چونکە عەقڵ چەکی مرۆڤە لە ژیانیدا و بەهۆیەوە لە ئاژەڵ جوێ دەبێتەوە و توانای لێکجیاکردنەوەی ڕاست و هەڵەی پێدەدات، بەڵام ئومەتی ئیسلام بە درێژایی هەزار ساڵ عەقڵی لە کارکردن ڕاگرتووە بەشێوەیەک عەقڵی موسڵمان خەریکە فەلەج دەبێ، چەندان چین و ژەنگ و تەمومژ لەسەری کەڵەکە بووە، کە پێویستە ڕابماڵرێن.

یەکێک لە هەڵەکانی سەلەفیەت ئەوەیە عەقڵی تەندروستی سەرنگون کردووە و "نەقڵ"ی لە جێی داناوە، بەوەیش عەقڵییەتی موسڵمانان بووەتە عەقڵییەتێکی نەقڵی کە نزیکە لە پەکخستنی عەقڵ. تا ئەو کاتەیش سەلەفییەت بمێنێ عەقڵییەتی نەقڵیش هەر دەمێنێ و هیچ جۆرە پێشکەوتنێک نە لە بیری ئیسلامی و نە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕوونادات- لاپەڕە ٥٩).

لە ڕاستیدا نوسەرە عەلمانییەکانیش هەمان ئەو تێڕوانین و بۆچونانەیان هەیە کە ئەم نوسەرە ئیسلامییە لێرەدا خستویەتییە ڕوو. لێرەوە زۆر جێگای بایەخە کە نوسەرە ئیسلامییەکان خۆیان هەوڵی نوێکردنەوە و ڕیفۆرمی ئاینی بدەن، بێگومان کاریگەری ئەوان لەسەر ئومەتی ئیسلامی، لە کاریگەری نوسەرانی دەرەوەی بازنەی ئیسلامی، زۆرتر و بەرچاوتردەبێت، چونکە وەک دەوترێ ئەوان لە خۆیانن.

ئەم کتێبە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان گرنگی خۆی هەیە، چونکە لەمڕۆدا و لە کۆمەڵگەی کوردیدا، خەریکە ئەو دیوەی ئاین زاڵدەبێت کە تەواوی ئازادییەکانی مرۆڤ لە نوسین و بیروڕادەربڕین و جلوبەرگ و چۆنیەتی ڕێخستنی ژیان، بەرتەسکدەکاتەوە، ئاین لە ئێستادا لەسەر دەستی هەندێ گروپ یان کەسایەتی ئاینی، خەریکە دەبێتە بەربەستێکی گەورە لەبەردەم ژیاندا بە مانا هەرە پان و فراوانەکەی. لێرەوە ئەم کتێبە دێت و دژ بەو بەرتەسککردنەوەیە قسەمان بۆ دەکات و ئەو شێوازە لە ئاین سەروەردەکات کە پڕە لە میهرەبانی و ژیان، پڕە لە جوانی و لە یەکترقبوڵکردن، پڕە لەوەی ڕێز لە حەز و ویست و خواستەکانی یەکبگرین و کەسمان دەستدرێژی نەکاتە سەر مافەکانی ئەوی دیکەمان و هەریەکەمان لە سنوری خۆیادا، چۆنی پێخۆشە و چۆنی دەوێ ئاوا ژیان بەڕێبکات، بێ ئەوەی کەسێک هەبێت سنوری حەڵاڵ و حەرامەکانی بۆ دیاری بکات.

ماوەتەوە بڵێین کتێبەکە لەلایەن بەڕێز عومەر عەلی غەفور-ەوە سەرکەوتوانە کراوە بەکوردی، ٢٥٤ لاپەڕەی بچوکە و تیراژی ٥٠٠ دانەیە و نرخی ٤٠٠٠ چوار هەزار دینارە.




## ژیانی کورده‌وارایم

ئه‌م کتێبه نایابه بریتییه له یاداشتی یه‌کێک له‌و مرۆڤه کورده تێکۆشه‌ر و دڵسۆزانه‌ی که تا ڕۆژی مردنی، خه‌می کورد و نه‌ته‌وه‌که‌ی بووه و هه‌وڵیداوه، ئه‌م نه‌ته‌وه بێ پشت و په‌نایه به دونیا بناسێنێت و ئه‌و زوڵم و ناحه‌قییه‌ی که به‌رامبه‌ری ده‌کرێت، بگه‌یه‌نێته سه‌نته‌ری بڕیاره نێوده‌وڵه‌تییه‌کان و جیهان له‌و کاره‌سات و کوشتوبڕانه ئاگادار بکاته‌وه که‌به‌سه‌ر نه‌ته‌وه‌که‌یدا دێن. نوسه‌ری کتێبه‌که (د. نوره‌دین زازا) باس له باروده‌خی کوردانی تورکیا و عێراق و سوریا ده‌کات له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌مه‌وه تاکو کۆتایی ساڵانی حه‌فتای ئه‌و سه‌ده‌یه. ئه‌م بیره‌وه‌ریانه له مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٢ و له وڵاتی سویسرا نوسراونه‌ته‌وه، نوسه‌ر له ساڵی ١٩٧٨ بووه‌ته هاوڵاتییه‌کی سویسری و ڕه‌گه‌زنامه‌ی ئه‌و ئه‌وڵاته‌ی وه‌رگرتووه و هه‌میشه وا هه‌ستی کردووه که له کوردستانه‌که‌ی خۆیدا ژیاوه.

یاداشته‌کانی ناو ئه‌م کتێبه به ڕوونی و ڕاستگۆییه‌وه باس له‌و باروده‌خه ده‌کات که کوردی ئه‌و دوو پارچه‌یه‌ی کورستان گرفتاری بوون، به‌تایبه‌تی خانه‌واده‌ی خودی نوسه‌رکه چه‌ندینجار دووچاری گرتن و زیندانیکردن بوون.

ئێمه له خوێندنه‌وه‌ی ئه‌م کتێبه‌وه چه‌ندین زانیاری گرنگ و بایه‌خدارمان له‌سه‌ر ئه‌و ڕۆژگاره‌ی کوردستانی باکور و کوردستانی خۆرئاوا ده‌سته‌ده‌که‌وێت و له نزیکه‌وه ئاشنایه‌تی له‌گه‌ڵ ئه‌و پارت و ڕێخراوانه‌دا په‌یدا ده‌که‌ین که له‌و سه‌رده‌مه‌دا له گۆڕه‌پانی خه‌باتی سیاسیدا بوون. کتێبه‌که به کوردییه‌کی جوان و ڕه‌وان له‌لایه‌ن به‌ڕێز باست حه‌مه غه‌ریب‌ه‌وه وه‌رگێڕدراوه، ژماره‌ی لاپه‌ڕه‌کانی ٣٩٣ لاپه‌ڕه‌ی گه‌وره‌یه، تیراژی ٦٠٠ دانه‌یه و نرخی ٦٠٠٠ شه‌ش هه‌زار دیناره.




## وەسیەتنامە خیانەتلێكراوەكان

كتێبێكی دیكەی دەزگـای چاپ و پەخشی سەردەمە كە لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا كەوتە كتێبخانەی كوردییەوە. ئەم كتێبە بریتییە لە نۆ بەش، تێكڕای بەشەكان چەندین وتاری ڕۆماننوسی بەناوبانگ میلان كۆندێرا لەخۆدەگرن. واتە ئەم كتێبە بەشێكی زۆری ئەو وتارانە لەخۆ دەگرێت كە میلان كۆندێرا لە كات و ساتی جیاواز جیاوازدا و لەسەر كۆمەڵێ بابەت نوسیونی.

لە ڕاستیدا بەشی هەرە زۆری خوێنەر ئەم نوسەرەی لە ڕێگەی ڕۆمانەكانییەوە ناسیوە، بەتایبەتی ڕۆمانی تەپڵی تەنەكە كە بە یەكێك لە كارە هەرە جوان و گرنگەكانی دادەنرێت، واتە كەمتر لە ڕێگەی نوسین و وتارەكانییەوە ناسراوە. بەڵام لەم كتێبەدا ئێمە ئەو وتارانە دەبین و لەگەڵ خوێندنەوەیان هەست بە ڕۆشنبیرە فراوان و هەمەلایەنەكەی ئەم ڕۆماننوسە دەكەین، هەستدەكەین ئەوەی خاوەنی ڕۆشنبیرییەكی ئاوا فراوان و تیروانێكی ئاوا قووڵ بێت، ئاساییە شاكار لە جۆری تەپڵی تەنكە بنوسێت. لێرەوە نوسەر، هەر نوسەرێك، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لە قەرەی كاری ڕۆماننوسین بدات، پێویستە سەرەتا وەك میلان كۆندێرا، خاوەنی ئەو مەعریفە بەرفراوان و ئەو دیدگا قووڵە بێت بۆ مـرۆڤ و بۆ ژیـان و بۆ بەرهەمی نوسەرەكانی دیكە. چونكە بەبێ بوونی ئەوانە، ئەستەمە بتوانرێ شاكاری گەورە و مەزن بنوسرێت.

لـــــە بەشێكی ئەم كتێبەدا تێدەگەین كە ئەم نوسەرە شارەزاییەكی فراوان و گەورەی لە بواری مۆسیقادا هەیە و بە توانایەكی زۆرەوە قسە لە مۆسقا و ئاواز دەكات، لە هەندێ لە نوسینەكانیدا دەردەكەوێت كە گوێگرێكی باشی مۆسیقایە و بەردەوام ئاگاداری ئەو جیهانە خەیاڵ و پڕ ڕەونەق و جوانییەی مۆسیقایە. بۆ ئەوەی باشتر لەم ڕۆماننوسە بگەین و بزانین لە دەرەوەی ڕۆمانەكانی خەریكی چییە و باس لە چی دەكات، ئەوا پێویستە ئەم كتێبە بخوێنینەوە.

ئەم كتێبە لەلایەن كەریم پەڕەنگـ-وە كـراوە بە كوردی، ژمارەی لاپەڕەكانی ٣٢٨ لاپەڕەی قەبارە گەورەیە و تیراژی ٦٠٠ دانەیە و نرخی ٥٠٠٠ پێنج هەزار دینارە.